

کوردەوە ، ئەو سوپایە لەو ماوەی دوواییداو لەڕوانگەی دوو ڕووداوی گەورەوە ، دڵسۆزییکی بێپایانی بەرامبەر گەلبە کوردو عەرەبەوە نواند کاتێ پاڵەوانە ئازایەکانی پاسەوانی کوماری ، شێرەکانی فەیلەقی یەك ڕوویان کردە ناوچەی «پێنجوین» سەر بەپارێزگای سلێمانی بۆ لێدانی دوژمنی ئێرانیی داگیرکەرو دەرکردنی لەناوچەکەدا . هەر وەها سەلماندی کە سوپای نەتەوەی عەرەبە هەر وەکو لە پێشوو شدا سوپای بوو لەجەنگەکانی فەلەستینو تشرین . کاتێ کەدەرسێکی دژواری بەدوژمنی ئێرانیدا لەدووای دەست درێژی ئێرانو پەلاماردانی بۆ سەر هێمنیو ئاسایشی کوێتیبرا .

سوپای عیراقی نەبەز کە ئاهەنگ دەگێرێت بە بۆنەی لەدایك بوونیا ، سەربەرزە بە سەرکەوتنەکانی لەهەموو جەنگە گرنگەکانی نیشتمانیو نەتەوایەتیمان ئێمە بڕوامان پتەوە کە جەنگەکانی داهاتوو لە سەر خاکی فەلەستینی پیرۆزدا ڕوودەدات تا سەرکەوتنی تەواو ئەنجام دێت بەسەر دوژمنی زایۆنیزم ، چونکە سوپاییکە ئامادەکراوە بۆ ڕزگارکردنی فەلەستینو هێنانەدی ئاوتەکانی عیراقیانو جەماوەری نەتەوەی عەرەب لەهەموو شوێنێکدا سوپا کەمان ڕۆڵەی دڵسۆزی گەلەو هێزێکی دلێرەو هەمیشە لەبەرەی پێشەوەیە لە هەموو جەنگو شەڕو شۆڕشێکدا ، سوپاکەمان لە هەموو سوپاکانی عەرەبو سوپاکانی وولاتانی ناوچەی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاست بە هێزترە .

جگە لەمەش سوپاییکی بڕوادارو ڕۆشنبیرەو نەخوێندەواریو نەزانین لەناو ریزەکانی دا نەماوە لەسایەی شۆرش (17 — 30) تەمموزی پیرۆزو پێشەواکەیدا صدام حسین بۆیە بووە پەرژنییکی توندو دیوارێکی پۆلای بۆپاراستنی نیشتمانو گەلو دەسکەوتە پێشکەوتنخوازییە سۆشیالیستییەکان .

سوپاکەمان لەویژدانی گەلو تڕپەی دلانی پڕ لەخۆشەویستی بۆی دەژی . چەندەها تاقیکردنەوەی جەنگاوەرانەی دەولەمەندی وەدەست هێناوە بە درێژایی مێژووی پڕلە پاڵەوانیەتیو سەربەرزی خۆیدا .

«دەستەی نووسەران»

# فائق بێکەس

**ئۆرخانی غالب**

دیوانی شاعیری نەمری کورد (بێکەس) هاتە دەستمو خەریکی خوێندنەوەی بووم، ئەم کتێبە بەهەولو کۆششی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم کۆکراوەتەوەو ، ساڵێ -1970- لەبەغدا، لە چاپخانەی شەفیق چاپ کراوە. پاش چاو پیاخشاندنو خوێندنەوی بابەتەکان ویستم بەچەند ووشەیەك ڕێز لەم زاتە بزورگەوارەی نەتەوەکەمان بگرمو بەقەڵەمە شکاوەکەم شتێکی لەسەر بنووسم.

بێکەس ناوی ڕاستی فایەقە، کوڕی عەبدوڵڵە بەگی کوڕی کاکە حەمە کوڕی ئەلیاسە قووچە . سەرەناوی شیعری (بێکەس) ە ، لە ساڵێ 1905 ز دا لەگوندی سیتەك مەلبەندی ناوچەی شارباژێر کە (30) سی کیلۆمەتر لەسەرووی خۆرهەلاتی سلێمانییەوەیە لەدایك بووە . ماڵی باوانی لە (قەلاچوالان) ەوە هاتوونەتە سلێمانی، لەساڵێ (1911) دا باوکی بە کاروو باری دەولەت چووە بۆ خانەقینو لەوێوە بۆ بەغدا لەبەغداوە دەنێرێ بە دووی خێزانەکەیاو لەوێ نیشتەجێ بوون ، پاش ماوەیەك ئەوان لەبەغا بەجێ دێلێو - خۆی دەچێ بۆ ئەستەموول، ساڵێ (1929) لە (مەرعەش) لە تورکیا چرای ژینی بۆ ئێگجاری کوژایەوە. کاتێ کە لە بەغدا بوون لە سالی -1917- دا لەبەر هەژارییو بێ دەرامەتی، لەساڵێ -1918- دا لەبەغدا (حەبەخان) ناوێك کەهاوسەری ئەفسەرێکی خەڵکی سلێمانی بووە دەیان باتەوە بۆ سلێمانی بۆلای حاجی ئەمینی مامیو لەبەر ئەوەی بێکەس لاوێکی هۆشیارو زرنگو تێگەیشتوو بووە کاتێ کەچۆتە قوتابخانە لەپۆلی سێیەم وەردەگیرێو تاساڵێ -1923-بەردەوام دەبێ، هەموو ساڵێکی

خوێندنی بەپلەی یەکەم دەرچووە . هەر لەو ساڵەدا لەسەر قسەی ـەمی دەست دەکاتەوە بەخوێندن، لە قوتابخانەی (علمیە)ی کەرکوك ـەردەگیریّ لەویّ بۆی نـالویّ خوێنـدن درێژە پیّ بـدات. لەساڵیّ 1924-1925 لە (دار العلوم) ، لەبـەغدا درێـژە بەخـوێندن دەدات ، ـیسانەوە لەوێش بۆی ناگونجیّ لەبەر دەم بزێوی خۆی بخوێنیّ . ـەساڵی 1926-1927 دا دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی کەتەنها پۆلی یەکەمی ـوەندی تیا بووە، ناچار دەبیّ ڕووی لیّدەنیّ . بێکەس لە زمانـدا عەرەبیو فارسی زانیوە، کەمێکیش شـارەزاییلە ئینگلیزیـدا بووە. ـەسـاڵی-1928- دا بووە بـە مامـۆستـای (زانستی)و لەسـەردەمی ەەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی مەزن (1882-9-10/1956) دا مامۆستای قوتابخانەی (مۆرتکە) بووەو پاشان دەگوێـزرێتەوە بـۆ (تەوێڵە) . ـەسـاڵی -1931- دا میری ئەوکاتە لەسەرکار لای دەبات بەبیانـووی ئـەوەی مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرەو بیروباوەڕی کوردایەتی لەنـاو کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا بڵاودەکاتەوە.

لەسـاڵی -1941- دا دەوڵەت وەری دەگرێتـەوە بەمـامۆستـاو ـکۆتایی ئەو سـاڵەی کەگیـانی بەخشی، لە قـەرەداغو سلێمانیو ـورداشو هەڵەبجەدا بەوانە وتنەوە خەریك بووە[1].

«شیعری بێکەس شایانی لێکۆڵینەوەیـەکی وردەو پێویستی ـەوەیە بەدرێژی لەسەری بنووسـریّ »[2] بێکەس وەك ڕۆڵەیـەکی هۆشیار و شاعیرێکی کوردپەروەری دیار، کەبۆخۆی کارێکی بچووك ـیەو کەسانی شارەزاو خـامەڕەنگینی کـارامەو لێهـاتووی دەویّ ـەمـاوەی ساڵانی تـەمەنی ژیـانی شاعیـرێتیدا تـوانیـوێتی پلەو ـەیێکی ئەدەبی بەناوبانگی هـەبێو شـوێنەوارێکی گـەورەو زۆر ـرچە شیعری بەهێزو هونەرمەندانەی بۆ بەجێ هێشتووین.

### شاعیری گەل:

یـەکێـك لەنیشـانـەکـانی شـاعیـری ڕەسـەن لەوەدایـە ، ـەشیعرەکانی دا شتێکی وا دەرببڕیّ بکەوێتە سەر زاری جەماوەر ـالە قازانجو بەرژەوەندی ئەواندا بیّ باسو خواسێکی هێمنانەی پێوە ـیاربێو بەسەر کارەساتو تەقینەوەدا زاڵ بێت ، یان بیّهەڵچوونو ـەر لێشێواندن ئاوێنەیەکی بریقەداری ڕۆژی خۆی بێو ناوەرۆکێکی ـوختی هەبیّ کەمرۆڤی نەتەوە لەشوێنی دەگەڕێتو لە کۆمەڵ جویّ ـابنەوە . لەهەمان کاتیشدا بەرپەرچدانەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی ڕاستی هەموو هەراو بۆشیو درۆ و دەلەسەی هیچو پووچـو لەڕیّ لادەرانەیە کەدوورن لەژیانی واقیعو لەبیری پێشکـەوتنخوازانـەو لەمەبەست پوختەکان بەدەرنو لەسەر زەمینی، واقیع نەوەستاون. ئەمە لەولاوە بوەستیّ ، لەم لایەی کەشەوە بەرهەمێك خاوەنەکەی دەکا بەشاعیر بەرهەمەکە دەبیّ لەناخو ئـارەزوو و ویستی گەلەوە سەردەربێنیّو هەستو خۆشی ڕاستەقینەی گەل بۆ مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە بخاتە ڕوو و ڕەشو ڕووت و برسیە کانی ئەم سەر زەوییە پەروەردە بکا ئەوجا بایەخێکی ئەدەبی هەیە . شاعیری شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە «لەپێناوی سارێژکردنی زامەکاندا تیّ ئەکۆشیّ و خۆیشی تاچەند بۆی بلویّ ئەو بیرانە بەکردەوە بسەلمێنی ئەوا لای جەماوەر گەورەتر دەبیّ نموونە ی ئەو جۆرانـەوەك حاجی قـادری کۆیی و بێکەسی نەمرە .»[3].

### شیعر لای بێکەس :

بێکەس کارەساتە خوێناوییەکەی (6)ی ڕەشی ئەیلوولی ساڵی ـ 1930 ـ بـەردەگای سـەرای شاری سلێمـانی دیوەو یـەکێك بـووە لەسەرکردەکـانی ئەو ڕاپـەڕینە دلێـرانەیـە. شاعـیر لەئەنجـامی هەراکەدا سەری بەقۆناغە تفەنگی جەندرمەکانی ڕێژیمی پاشایەتی گویّ لەمستی بەریتانیا بریندار کراو خرایە بەنـدیخانـەوە ، لەناو بەندیدا بوو سروودی (ئەی وەتەن) ی شوڕشگێـڕی هەڵبـەستو کردیە دیاری و پێشکەشی گەلەکەی کرد تاکو تێبکۆشن وکۆڵنەدەن لەمەیدانی خەبات و گیان بازی بـۆ دواڕۆژێکی ڕوونتر . «لەگـەڵ ئەوەی هێزی تاریکی سەرکەوت ، بەلاّم خەڵکی کوردستان زیاتـر هۆشیار بـووەو باوەڕی بـەهێزتـر بوو کـەپێوەنـدی دەستو پیّ دەکرێتەوەو دوژمن دەبەزێنریّ»[4] .

**ئەی وەتەن مەفتوونی تۆمو شێوەتم بیرکەوتەوە**

**وەختی بەندییو ئەسارەت، پیّ بە تەوقو کۆتەوە**

دیوانی بێکەس، ل/5

دیاریکردنی سەرکەوتوویی یا لاوازی شیعر دەگەڕێتەوە بۆ بیرو فەلسەفەو ئـەو ووشە دەربـڕاوانەو ئـەو تاقیکـردنەوە وردو درشتانەی شاعیرەکەو ئەو ڕۆشنبیرییەی هەیەتی ، هەروا لەگەڵ لایەنە زگمـاکیە تـایبەتییـەکانیدا . ئـەم شیعرە لەڕووی مـاناو

دەربڕینی هەست و بیرەوە ساکارو ڕەوان و ئاشکران و زوو مەبەست بەدەستەوە ئەدەن ، خوێنەر کەدەڕوانێتە ئەم شاکارەی هەستی خاوێنی تێکەڵ ئەو دیمەنە ناوازانە دەبێ ، شاعیریش چەندی لەدەست بێ بۆ دڵخۆشی مرۆڤەکان وەستایانە وێنەی ئەو واقیعە سروشتە پڕ لەنهێنی یانە دەگرێ و ئەو وێنانەش مرۆڤ والێ دەکەن لەخۆشیانا شا گەشکە دەبێ . شاعیر لەم شیعرەیدا ئیلهامی لەسروشتی وڵاتەکەی وەر گرتووەو ئەفینی تەڕو تازەی دیمەنی شاخی گوێژە دڵ و دەروونی شاعیر دێنێتە جووڵەو بەسەر ئاو و هەواو خاك و وەتەن و ئازایی و جوامێری کورددا هەڵدەلێ و تابێ لەخۆشیانا دەنگی لێ بلند دەکاتەوەو دەچریکێنێ :

**شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گوێژە باعیثی کەیف و سروور**
**هەردەمە بەرگێ ئەپۆشێ ، گا سپی گا سەوزو سوور**

**وەصفی قەومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو ڕەنگانەوە**
**ڕەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کەقەومێکن جەسوور**
**بەرگی بێ گەردو سپی شت دیارە وا هاوار ئەکا**
**قەومی کورد دڵ ساف و پاکن میللەتێکن بێ قسوور**

**بەرگی سەوزیشت ئەڵێ ئەم خاکە هەر شینایی یە**
**پڕ لەدەغڵ و دان و کانی ، سەربەرزق و پڕ لەنوور**

**ئەی وەتەن شایانی فەخری واجبە مەدحت بکەم**
**دارو بەردت عەینی گەوهەر خاك و خۆڵت وەك بلوور**

ل/160

وەکو دەزانن بەشیعری بەرزی نیشتمانی و خۆشەویستی خاك و نەتەوەپەروەری ناوی ڕۆیوەو زۆر بەرەمی ئازایانەی بۆ گەل و خاکەکەی تەرخان کردوە. پێم وایە، ئەگەر دڵسۆزیو ئەمەکداریو خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوەکەی نەبوایەئەو شیعرە گەورەو مەزنانە تیشکی ڕووناکی چاپیان نەدەدی و بێکەسیش ئەو پایە بەرزو ناوو ناوبانگە زلەی نەدەبوو. ئەم شیعرەی ڕاستی یەکە دەبێ لەپێش چاو بگیرێ ، بانگێکە بۆ ئازادی و ئامانجی ڕێی ڕاستی ئاشکرا دەکا، نیشانەیە بیری کۆنەپەرستی و نەژادپەرستی ڕیشەکێش دەکا ، بانگ هێشتنێکە بەپیرەوە چوونی مرۆڤ هۆشیارو بێدار دەکاتەوەو ئاوات و ئاکام و مەبەستی گەل سەردەخا. شایانی گوتنە کاتی دانانی ئەم شیعرە دوای ڕاپەڕینە دلێرانەکەی کانوونی دووەمی ساڵی 1948 ی گەلی عیراق بووە.

**داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدری قەت بەرناگرێ**
**سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ**

ل/32

فایەق بێکەس بەچامەیەکی وەکو (27) ساڵە ...) ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردووەو مەرزو سنوری دووری وڵاتی شکاندووەو خۆیشی بەکردەوە سەلماندوویەتی، ئەم شیعرە لەڕێگای هەجووی کاربەدەستێکی ئینگلیزی یەوە هێرشێکی ئازایانە دەباتە سەر ئیمپریالیزمی جیهانی و هەموو داگیرکەرانی گەل و نیشتمان ، کاتێ باری کورد لەژێر ڕکێفی چەوسێنەرانی بەریتانیا بە کولەمەرگی دەبینێ کاربەدەستەکەیش (مێجەر ئەندمۆنس) بوو ڕاوێژکاری کاربەدەستی وەزارتی کاروباری ناوەوە ، لەساڵانی دوای جەنگی دووەمی جیهاندا بەبۆنەی گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا ، لەسلێمانی ئاهەنگێکی بۆ ڕێك دەخەن، بێکەسی پاڵەوانیش خۆشەویستی ی نیشتمانی ئازیزی دەی هەژێنێ و ئەوپەڕی جۆشی هەڵدەستێ و ئەم شیعرەی بەبێ ترس و پەروا، بەبێ ماستاو کردن و سەرشۆڕکردن ڕووبەڕووی ئەندمۆنس و حکومەتە داتاشراوەکەی وتووەو وەك نارنجۆك بەڕوویا تەقیەوە کە ئەدمۆنس ئەوکاتە خۆی هەموو شتێك بووە لەوسەردەمەدا کە دەڵێم ترس لەکن مرۆڤی شۆڕشگێر سیفەتی ترس لەهەندا سوور بوون لەسەر بەرگری کردنی شەرەف و خواست و ئیرادەی مەسەلەی چەماوەرو سەربەستی دا گشت ڕووە سەلبی یەکانی پوچ دەبنەوەو دەبێتە قەلایەکی سەخت، یان هێزێکی کاریگەر لەمەیدانی خەبات کردن بو باشەڕۆژێکی ئازادو بەختیارتردا. قەسیدەکە هەمووی توڕیی و بێزاری دەردەبڕێ و پەردەی بێشەرمی و بێ ئابڕوویی لەڕووی دوژمنە ملهوڕو چاوچنۆکەکانی هەڵدەماڵێ . لەم قەسیدە شیرینە پڕ لەهەست و خۆشەویستی یەی هونەرمەندی ڕەندو قەلەندەر (بێکەس) ئێستایش خوێنەر بەخوێندنەوەی ڕەحمەت دەنێرێ کەوەکو بەرهەمێکە بەرز جێگای خۆشەویستی لەدڵی کۆمەڵانی خەڵکیدا گرتووە . شاعیر لەم شیعرەیدا وێنەی تەواوی ڕاستەقینەی هەست و تاسەی دەروونی دەگرێ و زریکەی لێ هەڵئەستێت و پڕ بەدەم هاوار دەکات و دەڵێ :

**بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم**
**بەنان و ئاو و جلو بەرگی خۆم**

خزمەتم کردی لەئێران و ڕۆم
لەپێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!
بۆچی بەناحەق وا سووکت کردم ؟!

بیست و حەوت ساڵە تاڵە ژیانم
لەژێر دەستی تۆ زۆر پەرێشانم
لەئینسان ناچم، عەینی حەیوانم
کەی ڕزگار ئەبم ماڵی وێرانم
وا بەخۆت ئەڵێیت (حامی) گەلانم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!
بۆچی بەناحەق واسووکت کردم ؟!

بیست و حەوت ساڵە دڵم لێت پڕە
ئەحواڵم بەدەس تۆوە زۆر شڕە
صەد بەڵێن بدەی لەلای من تڕە
بەسیەتی ئیتر ئەم وڕە ـ وڕە
تۆ کەریت ناکەم ورگم هەڵدڕە
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم ؟!
بۆچی بە ناحەق وا سووکت کردم؟!

پارچە شیعری (قەومی کورد) .. کەبەبۆنەی هاتنەوەی لاشەی چوار ئەفسەرە قارەمانەکانمانەوە بۆ سلێمانی لە ساڵی 1947 دا وتراوە کە لە بەغدا لەلایەن ڕێژیمی نەگریس و چەپەڵ و دوابڕاوی تەختی پاشایەتی‌یەوە بەپەتاکران، ئەم چەند دێڕە دەنگ و هاواری شۆڕە سوارو شاعیرێکی شۆڕشگێڕی نەتەوەکەمانە کەبەهەناسەیەکی پاک و بزوێنەری ویژدان و هەستی مرۆڤانەیەوە لەبابەت ئەو ڕۆژگارە ڕەشەوە دەدوێ و بەئەستاتیکی جوان و ووردەوە خستوونی‌یە دێڕی شیعرەوە . ئەوەی شایانی باس بێ شاعیر بیروهەستی خۆی لەقاڵبی شیعردا بەزمانێکی سادەو بێ‌گرێ و گۆڵ داڕشتوە تاخەڵکە ساکارو ڕەش و ڕووتەکان سوودی تەواوی لێببینن، نەی ویستووە گوێگرو خوێنەر بەدەست مەبەست و ماناکانی‌یەوە ماندووبین . چونکە مەبەستی شاعیر زیاتر لایەنگیری ئایدیۆلۆژی‌یەو باری دواکەوتووی و پلەی ڕۆشنبیری ئەو دەمەی گەلەکەی هەڵدەسەنگێنێ . لەم دووتاکەی بەرەوەدا لەمرۆڤی هەلپەرست (ئینتیهازی)و بێ سفەت دەدوێ ئەوکەسانەی کەبۆ قازانج و سوودی تایبەتی خۆیان تێ‌دەکۆشن، بەمەرجێک ورگ و گیرفانی خۆیان پڕ بکەن. «دز بازاری شێواوی خۆش دەوێ» مەسەلەیەکی ڕاستە لەگەڵ مەڕان لەشین و لەشایی گورگان چۆپی کێشن.

بەڵام ئایا ژیان هەوەسە؟ هەر بەم جۆرە هەڵدەسوڕێ و هەر بەئارەزووی کامی دڵی ئەم چەشنە بنیادەمانە ڕەوڕەوەی ئەم چەرخە کۆنەی گەردوون دەخولێتەوە. حاشا.

**گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕ ئەکەن**
**شەو بەبێ خەم سەر ئەنێنە سەرسەرین، هەر سەرسەرین**

**پیاو ئەبێ دائیم خەمی قەوم و وولاتی خۆی هەبێ**
**ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین**

بێکەس کەم ژیا ، بەڵام کەڵ ژیا . لەتەمەنی (43)ساڵیدا، لەڕۆژی 18-12-1948 بەنەخۆشی تەوژمی خوێن مەرگ لەهەڵەبجە دڵە گەورەکەی بێکەسی لەچنگ ئەو نەخۆشی‌یە کوشندەیە ڕزگار کردو لەمەڵبەندی نازداران، لەگۆڕستانی سەیوان لەسلێمانی چووە ئامێزی خاکی دایکی کوردستان و مۆمی ژیانی کوژایەوەو بەیەکجاری پێلوی چاوەکانی لێکنا ، هەر بەجەستە مردووە، بەڵام هەتا هەتایە ناوو شیعرە ئاگرینەکانی دەمێنێ و لە دڵا دەگەشێنەوەو سەوزدەبنەوە.

**چاوگەکان :**

* کاتی خۆی سێ وتارم بۆ ڕۆژنامەی «بیری نوێ» نارد، لەبەر ئەوەی بەرنامەی لێکۆڵینەوەکانم شتی تازەی نەگرتبوونەخۆ بڵاونەکرانەوە . لەئاکامدا ناوونیشانی دوانیانم ڕاگوێزتەوە. یەکەم ـ بۆ یادی (بێکەس) و دووەم ـ بۆبلسی (پیرەمێرد) . (بڕوانە : بیری‌نوێ ، پۆستەی خوێنەران، ژمارە، (277) , 4-2-1978).

1 ـ مامۆستا عەلائەدین سوجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف ، چ2 ، 1971.

2 ـ دیوانی بێکەس ، کۆکەرەو ئامادەکردنی بۆ چاپ، محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، چاپخانەی شەفیق، 1970 ، ل ـ آ .

3 ـ پاشبەندی کوردی عیراق ژمارە، (28) ، تەمووزی 1979.

4 ـ مامۆستا دوکتۆر مارف خەزنەدار ، «شیعری سیاسی، کوردی لە کوردستانی عێراق دا .....» ، بڕوانەرە : گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ، زانستگای بەغدا . ژمارە ، (15) ، 1971-1972.



● سەردانی وەفدی وەزارەتی لاوان بۆ کۆماری رۆمانیای سۆشیالیست

# رۆمانیا

## مەڵبەندی جوانیو سروشتو بەفرە خلیسکێ

لەکۆتایی ساڵی رابردوودا، وەفدێکی رەسمی بە سەرۆکایەتی بەڕێز وەزیری لاوانو ئەندامەتی بەڕێز (محمدامین محمد احمد) ئەمینداری گشتی ی بەڕێوەبردنی رۆشنبیریو لاوان سەرنووسەری گۆڤاری (کاروان)و چەند لێپرسراوێکی تری سەر بە وەزارەتی

لاوان، بەسەردانێکی رەسمی چوون بۆ کۆماری رۆمانیای سۆشیالیستو لەماوەی (22) تا (30)ی کانوونی یەکەمی ساڵی 1983دا لێکۆڵینەوەیان لەپێوەندی نێوان کۆماری عیراق و کۆماری رۆمانیای سۆشیالیستدا لە رووی وەرزشو لاوانەوە کرد ..

هەروەها (پرۆتۆکۆل)ی هاریکاری وەرزشی نێوان وەزارەتی لاوانو ئەنجومەنی نیشتمانی پەروەردەی وەرزشی کۆماری رۆمانیا بۆ ساڵی 1984-1985 ئیمزا کرا .

لەم سەردانەدا بەڕێز وەزیری لاوان چاوی بە سەرکۆماری رۆمانیای سۆشیالیستو وەزیری گەشتوگوزارو وەرزش کەوت ..

هەروەها گەلێ چالاکیی لاوانیان بۆ وەفدەکە سازکردو سەردانی



لەیاری‌یەکانی زانکۆکانی جیهان‌دا کە لە شاری (ئەدمۆنتۆن) ی (کەنەدا) سازدراو ماوەی (12) ڕۆژی خایاند و (4000) وەرزشکاری سەر بە (73) دەوڵەت بەشداری‌یان لێ‌ی‌کرد .. قوتابی‌یە ڕۆمانیەکان دەورێکی باڵایان گێڕاو (27) میداڵیان دەستکەوت ، لەوانە (6) یان زێڕبوون و کۆماری ڕۆمانیا پلەی چوارەمی لە میداڵی جۆراوجۆرو پلەی پێنجەمی میداڵی زێڕی وەرگرت .. وا بڕیارە هەمان ئەو وەرزشکارانە لە یاری‌یەکانی زانکۆکانی جیهان کە ساڵی 1984 لەشاری (لۆس ئەنجلۆس) دا ساز دەدرێ بەشدارین .

لەو یاری‌یانەی کە لە ڕۆمانیادا باوە .. یاری‌ی (بەفرەخلیسکێ) یە ئەم یاری‌یە لە وەرزی تایبەتدا ئەنجامدەدرێ‌و پێویستی بە مامۆستای لێهاتووو مەشقێکی زۆر هەیە .. بۆ ئەم مەبەستەیش ناوەناوە چەند یاری‌و فستیڤال لە شاری (سینایا) دا ڕێك دەخرێ بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ یاری‌یەکانی کۆتایی کەلە (23)ی تشرینی یەکەم تا (10) ی کانوونی دووەمەوە ئەو کاتەی کە بەفر دەبەستێ دەکرێن و ئەو وەرز شکارانە هەڵدەبژێرێن کە شایانی میداڵ وەدەست هێنانبن . بۆ نموونە لە ساڵی 1982 دا (11) وەرزشکاری ڕۆمانیا لەیاری‌یە ئۆلمپی‌یەکاندا سەرکەوتن‌و خاتوو (ئەدریان مارسێل) لە پلەی یەکەمینی سەرکەوتووەکاندا بوو .

لەپاڵ یاری‌ی جۆراوجۆرو پەرەپێدان لاوان و بایەخ دانە مەڵبەندو یانەکانیان .. کۆماری ڕۆمانیا ناسراوە بە سروشتی جوان و کانیاوی تەندروستی و خەڵکی لە سەرانسەری گێتی بۆی دەچن و لە نەخۆشی پیست و ڕۆماتیزم ڕزگاریان دەبێ .





چەند شارو مەڵبەندی لاوان‌و یاریگەی وەرزشیان کرد بە تایبەتی لەشارەکانی (بوخارێست، سینایا، پۆنایا براشۆف)دا .

**بەم بۆنەیەوە، بە پێویستمان زانی بەکورتی باسی هەندێ زانیاری لەبارەی وەرزش لەکۆماری ڕۆمانیای سۆشیالیستدا بکەین :**

یەکەم یانەی لە ڕۆمانیادا دامەزرابێ «کۆمەڵەی یاری‌یەکانی سوپای بوخارێست» بووە و تا (13) ساڵ لەمەوبەر ئەم یانەیە تایبەت‌بووە بە یاری فووتباڵ .. پاشان یاری‌یەکانی تریشی خستۆتە ئەستۆ وەك یاری «بۆکسێن» و (زۆرانبازی شمشێر) و (تێنس) . وەلە نێوان ئەو ساڵانەی ئەم دوواییی‌یەدا گۆڕانکاری‌ی هاتۆتە سەر و ئێستاکێ (12) لقی جۆراوجۆری وەرزشی تیایە و باشترین و چالاکترین پاڵەوانی تێدا نێونووس کراون کە لە خول و یاری‌ی نێو دەوڵەتاندا کەلە ڕۆماو تۆکیۆ و میۆنیخ و مۆسکۆ ساز دراون ئەو پاڵەوانانە میداڵی زێڕ و هی تریان بەدەست هێناوەو ژمارەی ئەو میداڵانە دەگاتە (300) لەگەڵ (9) چەپکە گوڵ‌و (150) ئەندامی ئەو یانەیە ناز ناوو شوێنی دیارکراویان لەبواری وەرزشدا بۆ تەرخان کراوە .



# ئەمجارەیش تکای لەنووسەرانی

**برای نووسەری بەڕێزمان :**

بێگومان تۆ لەلای خۆتەوە گەلێکت بەلاوە مەبەستە کە ئەو بەرهەمەی دەینێریت بۆ «کاروان» و بڕیاری بڵاوکردنەوەی دەدرێ ، بە بێ هەڵەی چاپ و کەم و کووڕی و بەجوانی و ڕێك وپێکی بکەوێتە بەرچاوی خوێنەران . بەڵام ئێمەش لەلای خۆمانەوە ـ کە بەتەنگەوە هاتنمان لەم ڕووەوە ئەگەر لە تۆ زیاتر نەبێ هیچی کەمتر نی یە ـ دەمانەوێ بۆتی ئاشکرا بکەین کە نیوەی ڕاستی ئەو ئەرکە دەکەوێتەوە ئەستۆی شێوەی نووسینی بەرهەمەکەی خۆت لە ڕووی خەت خۆشی و ڕەوان نووسین و جوان و ئاشکرا نیشاندانی وشەکانی ، واتە بە باشی ڕەچاوکردنی ئەو داخوازی و ئامۆژگاری یانەی کە لەخوارەوە دەیانخەینە بەرچاوت . ئێمە نالێین لە ئاستی خەتی ناخۆش و نارەواندا هیچمان پێ نەکراوە و پێ ناکرێ .. نەخێر .. تا ئێستا زۆرمان تەقەلا لەم بارەیەوە داوە و گەلێکیش بە دەستی یەوە ماندوو بووین و بۆ زاڵ بوون بەسەریدا و بۆ لە چاپدانی ئەو بابەتە بەرهەمانە بەبێ هەڵەو کەم و کووڕی ، کۆششێکی بێ ئەندازەمان کردوە ، بەڵام قسەی خۆمان بێ هەرچەندمان کردو کۆشا ، نەمانتوانی بیگەیەنینە ڕادەی زاڵ بوونی سەد دەر سەد بەسەر ئەو گرفتەدا . سا هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەوەتا هاوار بۆ خۆتان دێنین و بە پەرۆشەوەو بە تکایەکی زۆرەوە داواتان لێ دەکەین کە لەم بارەیەوە یاریدەمان بدەن ، تا بە هەردوولامان

ـ ئێمەی کارگێڕانی گۆڤارەکەو ئێوەی نوسەرانی ـ کارێکی وەها بکەین بەبێ هەڵەو کەم و کووڕی لە ڕووی لەچاپدانی یەوە دەربچێ و ئێمەش و ئێوەش ئەو کەسەرەمان لەدڵدا نەمێنێ !.

**پێشەکی چەند ڕاستی یەك :**

با پێشەکی ئەم چەند ڕاستی یە بخەینە پێش چاوان :

1 ـ بەر لە هەموو شت لەوە بە ئاگا بە کە برای لەچاپدەر (منضد) عەرەبەو زمانە کوردی یەکە نازانێت و ئەو تەنیا نەقش دەکا . واتە لە شێوەی نووسینەکەتدا حیساب بۆ ئێمە مەکە کە چەندە خەتەکەشت ناخۆش بێ ، هەر دەتوانین بیخوێنینەوە ، بەڵکوو بۆ ئەوی بکە .

2 ـ خەت ناخۆشی شتێکی عەیبە نی یەو هیچیش لە بایەخی ناوەرۆکی نووسینی چاك کەم ناکاتەوە . بۆیە سپاردنی ئەو ناوەرۆکە چاکەی دووتوێی ئەو خەتە ناخۆشە بە برادەرێك یا دۆست و ناسیاوێکی خەت خۆش بۆ نووسینەوەی بە خەتە خۆشەکەی خۆی ، هەروەها هیچ عەیبەی تێدا نی یە .

3 ـ هەر بە هەمان دەستوور ، ئەوەیش هیچ عەیبەی تێدا نی یە کە نووسینی نووسەرێك بە ناوەرۆك چاك بێت و بەڵام بە

# کارگێڕانی «کاروان»

# بەڕێز بۆ «کاروان»

زمان ( بەتایبەتی بە ڕێنووس ) کەم و کووڕیی تیدا هەبێت و بیدا بە برادەرو دۆست و ناسیاوێك بۆ دەسکاری کردنی پێش ناردنی بۆ لای ئێمە .

٣ – هەندێ نووسینی بە ناوەڕۆك چاکمان بۆ دێ ، بەلام بمانبەخشن کە دەربارەیان دەڵێین : نەك عەزاب بە ناخۆشیی خەتەکانیانەوە دەچێژین ، بەڵکوو وەك لەناو قوتابیاندا باوە .. ( شەڕە پشیلەیەکە بۆخۆی ! ) . واتە دەسنووسی یەکەم و بەبێ ڕوونووس کردنەوە بۆمانی دەنێرن . لەکاتێکدا لە پالیاندا نووسینی وەها جوان و پوختیشمان بۆ دێ کە حەز دەکەیت تەنانەت بەبێ خوێندنەوەش رایبفرێنیت بۆ چاپخانە .

٤ – دواجار چاپخانەکەمان لەبن دەستمانەوە نییە تا بتوانین مەسەلەی هەڵەی چاپ ، کە زۆربەی لە خەت ناخۆشی و ناڕەوانییەوە دێت ، بە ئاسانی چارەسەر بکەین . بەینی ئێمە و چاپخانە نزیکەی (400) کیلۆمەتر ڕێگایە و . ئەوەش بۆ خۆی بۆتە تەگەرەیەکی گەورە لە بەردەمماندا .

## داخوازی و ئامۆژگارییەکان :

تکایە .. تکایە .. تکایە :

١ – لەکاتی نووسیندا (ڕوونووسەکەت) دێڕ بپەڕێنە . بۆ ئەم مەبەستەش دیارە چاکتر وایە کاغەزی خەتداری قەبارەی فولسکاب بەکار بهێنیت .

2 – شاش بنووسە و وشەکان لە یەکتری جودا بکەرەوە ، واتە ماوەیەك بخەرە نێوانیانەوە .

3 – لەسەر یەك دیوی کاغەزەکە بنووسە .

4 – بەقەڵەمی پاندان (مەرەکەب) بنووسە نەك (جاف) .

5 – ناوی خۆت و باوك و باپیرت و ئەدرەسی تەواوت بنووسە . خۆ ئەگەر ویستت نووسینەکەت تەنیا بە نازناوێکەوە بڵاوببێتەوە و ناوەکەت ئاشکرا نەکرێ ، ئەوا هەقی خۆتە و لەم ڕووەوە تێبینییەکمان بۆ بنووسە .

6 – تکایە لەوە ئاگاداربە کە نووسینەکەت بڵاوبکرێتەوە یا بڵاونەکرێتەوە ، تۆ هەقی داواکردنەوەی دەسنووسەکەیت بەسەرمانەوە نییە . ئەمە دەستوورێکە و هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەکان لە سەرانسەری جیهاندا لەسەری دەڕۆن . هۆیەکەیشی ئەوەیە کە بەجێهێنانی ئەو هەموو داوایانە دەبێتە ئەرکێکی لەتوانا بەدەر . لەبەر ئەوە هیچ نووسینێك مەنێرە تا وێنەیەکی لەلای خۆت گل نەدەیتەوە ..

7 – ئەو نووسینەی بۆ ئێمەی دەنێریت ، بۆ هیچ لایەکی تری مەنێرە تا ئەنجامەکەیت لەلا ئاشکرا دەبێ . بەپێچەوانەشەوە ، ئەو نووسینەی بۆ لایەکی تری دەنێریت ، بۆ ئێمەی مەنێرە تا ئەنجامەکەیت لەلا ئاشکرا دەبێ .

8 – لەبەر نەبوونی ئەرشیفێك هەتا ئێستا لەبەر دەستی کارگەرانی گۆڤارەکەدا کە بتوانن هانای بەرنە بەر لە حاڵەتی پێویستیدا ، گەلێك مەمنوونتان دەبین کە هەرچییە

كتان لەوێنەو بەڵگەنامەو نەخشەو تابلۆی پەیوەندیدار بە نووسینەکانتانەوە بەردەست دەکەوێو بۆتان پەیدا دەکرێ ، لەگەڵیاندا بۆمانی بنێرن . دیارە ئێمەش لەلای خۆمانەوە لەم رووە دریغی ناکەینو نەمان کردوە .

9 — ئەگەر بە ژمارەکانی پێشووی «کاروان» دا بچنەوە ، بە ئاشکرا بۆتان دەردەکەوێ کە بایەخێکی تایبەتیمان بە وەرگێران داوە . بەڵام تکامان وایە کە ئەو برادەرانەی روویان لە وەرگێران کردوە لەوە ئاگادار بن کە یەکەم : چاکتر وایە دەقە ئەسڵیەکەمان لەگەڵ وەرگێرانەکەدا بۆ بنێرنو دووەم : ئەگەر ئەوەشیان بۆ نەکرا ، لەوە غافل نەبن کە بەروونی ئیشارەت بەسەر چاوەکەی بدەنو پشتگوێی نەخەن . چونکە پشتگوێ خستنی ناچارمان دەکا نووسینە وەرگێردراوەکەی پشتگوێ بخەین .

10 — سەرنجمان دا هەندێ لەو برادەرانەی شیعرو چیرۆكو نووسینمان بۆ دەنێرن ( بەتایبەتی لەنووسەرە لاوەکانمان ) ، پەنا دەبەنە بەر ئوسلووبی چاوە شەکردنمان . وەك سێ ـ چوار بابەتە نووسینمان بەیەك دەسخەتو بە سێ ـ چوار ناوەوە بۆ دەنێرێ . ئێمە ناچارین بەو برادەرانە بڵێین : کاکی برا .. هیچ پێویستت بەو ئوسلووبە نییە . ئازایانە چاکی لێبکە بەلادا رووبەروو وەرە بەر مەیدانو ئەگەر بەتواناو بەهرەدار بیت هێز نییە بتوانێ بەرت لێبگرێ .

لێرەدا ناچارین ئەو عەیبەیەش ئاشکرا بکەین کە ( کورەو بە ناوی کچەوە بەرهەم دەنێرێ !! ) .

11 — لەو نووسینانەدا کە بۆمان دێن ئەم کەمو کووڕیانە تیایاندا زۆر ماندوومان دەکەنو تکامان وایە نووسەرانمان ئەرکی چارەسەرکردنیانمان لەکۆڵ بکەنەوە .

أ ـ دانەنانی نوقتە لە شوێنی خۆیاندا لە سەرو ژێری پیتەکاندا . بۆ نموونە وشەی (بخۆ) لای ئێمەی کارگێران ئەگەرچی نوقتەکان لە شوێنی خۆشیاندا دانەنرابن ، بەلام خوێندنەوەی لە لامان ئاسانە . لە کاتێکدا بۆ برای لەچاپدەری عەرەبزمان ئەگەر نوقتەکان راست لەشوێنی خۆیاندا نەبن ، وەها پەنجەی پێدا دەنێ : (نجو) . ئینجا لەوەش بە[illegible] کە ئیشارەتی ٧ ەکەش نەخرابێتە سەر (واو) ەکەو وشەکە دەبێتە (نجو) .

ب ـ ئیشارەتی (٧) بۆ نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبی بۆتە بنەمایەكو پشتگوێ خستنی لەلایەن هەر نووسەرێکەوە لە ئێستاداو بەتایبەتی لە بواری رۆژنامەگەریی کوردیدا ، دەبێتە کەمو کووڕییەكو دەبێ نووسەرانمان لێی بە ئاگابن . ئێمەی کارگەرانی «کاروان» وامان لێهاتوە کە دەبێ بەم دەستو بەو دەست ئیشارەتی (٧) بە دەم خوێندنەوەی نووسینەکانەوە ، بخەینە سەرو ژێری پیتەکانەوە . ئەمە گرفتێکەو خراپ بەدەستییەوە دەناڵێنین . بۆیە تکا لەنووسەرانمان دەکەین ، ئەرکی جیاکردنەوەی مانای چەندین وشەکە بە دانانو دانەنانی ئەو ئیشارەتە دەگۆڕدرێ ، نەخەنە ئەستۆی ئێمەو لەو عەزابەش رزگارمان بکەن ، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا کە تووشی سەراسیمەیی دەبینو ناتوانین سەری لێدەربکەین کە ئاخۆ کام مانایان مەبەستە ! .

ج ـ گەلێ لە نووسەرانمان وەك تەنیا بۆ ئێمە بنووسنو بێخەبەر بن لەوەی کە لەچاپدەرێکی عەرەبزمان لەنێوانماندایە ، کاتێ دەگەنە کۆتایی دێرو سەیر دەکەن وشەکە جێگەی نابێتەوە ، دێن نیوەی لەو کۆتایی دێرەدا دەنووسنو ئینجا داشێك ( ـ ) دادەنێنو نیوەکەی تری دەبەنە سەری دێرەکەی دوایی . بۆ نموونە وشەی (خوێندن) .. (خو) لە کۆتایی دێری سەرەوەداو ئینجا داش ( ـ ) و ئینجا لەسەرەتای دێری خوارتردا (ێندن) . بێگومان برای لەچاپدەری عەرەبزمان بەم جۆرەی لەچاپدەدا : (خو ـ ێندن) . خۆ ئێمە دەتوانینو ئەرکی سەرشانمانە نەیەڵین ئەمە رووبدا وەك کردوومانە ، بەڵام ئایا چاکتروانییە برای نووسەر ئەم ئەرکە

ـیده لەسکەمان نەخاتە سەرشان تـا ئەو کـۆشـشـەی لەوەدا
ـسەرف دەکەین ئاراستەی لایەنێکی تری گوڤارەکەی بکەین ؟! .

د ـ ئەوەی سەبارەت بە دانانی ئەو داشە وتمان ، بـۆ
حەرفی نووسینی (واو) ی بەستنەوەی دوو رستەش بەیەکەوە
ـمن بەزمەو بەلام ئەمیان لەو حاڵەتەدا کە کاتێ (واو) ەکە
ـەری ئەوهی لە دوا وشـەی دێرەکـەدا دابنرێ ، لێی دابـڕ
ـمکرێو بەتەنیا فڕێ دەدرێتە سەرەتای دێری دوایی ترەوە .
ـێ برای لەچاپدەر دەستوور وەهایە کە ئەو (واو) ە دەچێتە
پاڵ وشەکەی پێشی‌یەوە نەك ئەوەی بە دوایدا دێ . بۆ نموونە :
ـەگەر رستەی (منو تۆ) مان هەبوو ، دێرەکەش بە وشەی (من)
کۆتایی هات ، دەبێ هەرچۆنێك بێ جێگەی (و) ەکەی لەگەڵدا
ـکەیتەوە ، چونکە ئەگەر ببیەیتە دێری خوارەوە ، وشەی (تۆ)
ـمبێ بە (وتۆ) . ئەمە تەنیا بۆ نموونە کە رەنگە خوێندنەوەی
ـەباری ئاسایی خۆیدا زەحمەت نەبێ ، بەلام لەزۆر حاڵەتـدا
ـمنا تەواو دەگۆڕێ .

هـ ـ ئـەرکێکی تـری زیـادە لەسـك کـە لەخـۆڕایی
ـمیکێشینو ماندوومان دەکاو دەبێتە هۆی روودانی گەلێ هەڵەی
چاپ ، لەشێوەی نـووسینی هەنـدێ لەپیتەکـاندایـە لەلایەن
نووسەرانمانەوە کە خوێندنەوەیان بۆ ئێمە بە باری راستیاندا
وەك ئـاوخـواردنـەوە وایـەو بـەلام بـۆ بـرای لەچـاپـدەر
ـەپیچەوانەوە . لەوانە بۆ نموونە : ( پ ، چ ، ژ ، ڤ ، ق ، کا ،
ـ ) . چوار پیتی یەکەمیان لەبەر نەنووسینی سێ نوقتەیی‌یەکە
ـەروونی‌و جیانەکردنەوە لە ( ب ، ج ، ز ، ف ) . (ق ، ن) لەبەر
نووساندنی چوکڵەیـەك بە کـوتایی پیتـەکەوە لەبـری نوقتـە
کەلەلای ئەو دەبنە (قە ، نە) . (کا) لەبەر نووسینی لەشێوەی
لا .. لام ئەلف لا ) دا لەلایەن هەندێ لە برادەرانەوە کە پێی
ڕاهاتوون .

سەیر ئەوەیە زۆر جاریش ئەو چوکڵەیەی (ق ، ن) ەکە ،
برای لەچاپدەرمان ناچاری دەیەها هەڵەی‌تر دەکـا ، ئەویش
کاتێ کە دەبینێ پیتی (ە) ی لەبری (فتحە) ی عەرەبی ، لەگەڵ
پیتەکانی تردا هەر لەو نـووسینەو یـا لە نووسینێکی تـردا ،
بەهەمان دەستووری چوکڵەیی نووسراوە !! .

و ـ گـرفتێکی گەورەی تـرمان دیـاردەیەکی سـەیـرو
سەرسوڕهێنەرە کە ئـەویش پەڕانـدنی تیپە یـا ناتـەواوی لە
نووسینیدا لەلایەن گەلێ لە برا نووسەرەکانمانەوە . بەواتایەکی
تر وەك چۆن ئێوە ( ئێمەش لەگـەڵتانـدا ) ، دادو بێدادتـانە
لەدەست هەڵەی چاپ ، ئێمەش لەلای خۆمانەوە دادو بێدادمانە
لەدەست هەڵەی (چاپی ! ) دەستو قەڵەمی ئێوە . بۆ نموونە
بەسەدان وشـەمان بـەرچاو دەکـەوێ کە نـووسەرەکـانیان
نووسیویانە : (کوڕ) ومەبەست (گوڕ) بووە . یا (کۆ) ومەبەست
(کوڕ) بووە . یا (کوڕ) و مەبەست (کـوڕ) بووە . یـا (کوڕ) و
مەبەست (کووڕ) بووە . یا (گووڕ) و مەبەست (گوڕ) بووە . یا
(گور) و مەبەست (گوڕ) بووە .. هتد ! . ئەمە تەنیا لە سنووری
ئەو سێ ـ چوار پیتەدا . ئینجا وەرە بدە بەدەمی‌یەوە بۆ هەموو
پیتەکان‌و بزانە چ عەزابێك بەدەست ئەم حاڵەتەوە دەچێژین ! .
بێگومان هیچ کەسێکیش لەو برا نووسەرە پیت پەڕێنـەرانە ،
دوای بڵاوبوونەوەی نووسینەکەی لەو عەزابەمان بەئاگا نی‌یەو
نایەت ، چونکە ئەو بە بـارە راستەکـەدا وشەکـانی بەرچـاو
دەکەونەوەو بـۆ هەتـا هەتـایە وایـدادەنێ کە خـۆی وەهای
نووسیون ! .

ز ـ مەسەلەی خاڵبەندی‌و لەم بوارەدا دەڵێـین : دادو
بێدادمان لەدەست پیت پەڕاندنەکە لەچاو ئەمیاندا تەنیا قەترە
بەدەریایەکە ! . ئێمە کە سات بەسات لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا
دەژین‌و بەدەستی‌یەوە زەلالەتمانەو وەك گەردەلوولێك لەگەڵ
خۆیدا بەردەوام گێژمان دەدا ، ناچارین‌و بەپێویستی دەزانین
ئەو راستی‌یە بەزەقی بخەینە پێش چاوی نـووسەرانمـان کە
نیسبەتێکی یەکجار کەمیان بە هوشیاری‌یەوە حیساب بۆ ئەم
مەسەلەیە دەکەن‌و لەنوسینەکانیاندا بایەخی پێ‌دەدەن‌و هەقی
خۆی دەدەنێ‌و ئیتر زۆربەی هەرە زۆریان ( لەگەڵیاندا گەلێ
نـووسەری بـەناوبـانگو خـاوەن تاقیکـردنـەوەیـەکی زۆرو
درێـژخایـەن‌و خاوەن چـەندین نـووسین‌و بـەرهـەم ) ، زۆر
هەرەمەیی‌و بێبـایەخـانە مـامەڵەی لەگـەڵدا دەکەن‌و هیـچ
حسابێکی بۆناکەن ! . من زۆر جار لەم رووەوە ئەوەم (بەدەمی)

بە نموونە هێناوەتەوە کە جارێکیان (420) نوقتەم لە نووسینێکی برادەرێکدا فڕێداوە ، وەك ئەوەی نووسیبێتی : « منو .. تو .. چووین .. بو بازار ... دوایی .. گەراینەوە .. بو .. مالەوە .. ! » (هیوادارم ئەو برادەرە لێم زویر نەبێ . بەتایبەتی کە دەبینم نووسینەکانی ئەم دواییەی لەو نوقتانە رزگاریان بووە ) .

نموونە هێنانەوە لەو نـووسینانـەی بۆ (کـاروان) دێنو بریاری بلاوکردنەوە شیان دەدریو بلاویش دەبنەوەو ئـەگەر لەم بارەیەوە زۆر پەریوت نەبن ، دەسکاری ناکرێنو ئەگەر زۆر پـەریوتبن ، خـۆمان پێرا نـاگیـریو دەسکـاری یـان دەکەین ، ئەمەش عەزابێکی گـەورەیترەو هـەروا لە حوبـو خۆرایی دەینوشـینو بۆ ئـەمیشیان بـرای نووسـەرمان لێ ی

بێئاگاو بێ خەبەرەو کە نووسینەکەی خۆی دەکەوێتەوە بەر چاو ، قەتوقەت بە بیریدا نایەت کە لە رووی خالبەندی یەوە ئەو هیچ هەلەیەکی کردبێو بۆی ڕاست کرابێتەوە ! .

ئێمە ناچارین ئەم مەسەلەی خالبەندی یەتان لە لا بکەینە مـەسەلەیـەکی گەلێ بـایەخـدارو بـۆتـانی بخـەینـە قـالبی بانگەوازێکەوەو بلێین : بـرایان .. تکـایە .. خـالبـەنـدی شان بـەشانی پیتو وشـەو رستەو دەستـەواژە مانـا دەبەخشێ . [ وێرگولو نوقتەو دوو نوقتەو سێ نوقتەی تەنیشت یەکترو دوو نوقتەی سەرو خوارو کـەوانەی بچـووكو کەوانـەی گەورەو نیشانەی پرسیارو نیشانەی سەرسامیو داشی بەیناو بـەینو داشی چوونە سەری دێر بۆ گفتو گۆو چـوونە سـەری دێری ئاسایی ... هتد ] ، هەر یەکەیان مانـای خۆی هەیـەو دەبێ لەشوێنی خۆیدا دابنرێو بەکار بهێنرێ . تکایە .. شان بە شانی دارشتنی نـووسینـەکـەت لەڕووی ڕێـزمـانو ڕێنـووسو ڕەوانبێژییەوە ، ئەو مەسەلەی خالبـەندی یـەش فەرامـۆش مـەکەو ئـەرکەکـەی مەخـەرە ئەستـۆی ئێمە ! . ئـەرکەکـە ڕاستەوخۆ ئـەرکی سەرشـانی خۆتـەو دەبێ خۆت بـەجێی بهێنیت ، دەنا ئێمە ئەگەر بەسەرێك دلگوشران بەرامبەر بەو کەموکووری یەو دلسۆزی بۆ زمانو ئەدەبەکەو بۆ گـۆڤارەکـە نەبێ ، مەجبوری ئەو دەسکـاری کردنـە لەم لایەنـەوە نین .

( لەوەش ئاگادار بن کە دەسکاری کردنەکەمان تا ئێستا ئەو نووسینانەی گرتۆتەوە کە لەم ڕووەوە بێتام هەلەو چەوتی یان تێدابووە نەك هەموو نووسینێك ) .

**برایان** :

ئەوانەبوون داخوازیو ئامۆژگاری یەکانی ئێمە بۆ ئێوەی بەرێز کە لامان وایە ڕەچاو کردنیان ، زەحمەتی یەکی زۆری بۆ ئێوە تێدا نی یـەو بەلام زەحمـەتی یەکی گـەورە لەکول ئێمـە دەکاتەوە . جگە لەوەی کە هەم نووسینەکانی ئێوە بوختـترو جوانترو بێکەمو کووریو بێ هەلەی چاپ بلاو دەبنەوەو هەم گـۆڤارەکـەش لەم بوارەدا ، ڕوو لەوە دەکـا ببێتە گـۆڤارێکی نموونەیی و ببێتە مایەی شانازی بۆ هەموو لایەکمان . ئیتر سا ئێمەو ئێوەو ژمارەکانی داهاتووی «کاروان» ... با بزانین ! .

«کاروان»

## ڕوونکردنەوەیەك

لە ژمارە (14) ی (کاروان) و لە بەرهەمی لاواندا ، ناوی نـووسەری چیـرۆکی (تابلۆیـەك لە خەونمـدا) کە (مـژدە عباس)ە ، لە کـاتی چاپکردندا کەوتبوو . هەروەها لە ژمارە (15) شدا ناوی وەرگێـری چیرۆکی (نیشانچی) کە (ئارام قەرەداغی) یەو لە ئینگلیـزی یەوە وەری گێرابوو لەبیر کرابوو . داوای لێ بوردن لەوان و لە خوێنەرە ئازیزەکانمان دەکەین .

«کاروان»

لێکولینەوە

# مەم و زینا خانی

« ئەمین ێ ئوسمان »

-هـ سال پترە کو من دەست ب ل دویچون و بەرهەڤکرن و ڕاڤەکرنا بەیتا مەم و زینا خانیێ پێدار کری ، هەتا نهو ل دویڤ -مم و دەستهەلاتیا خو ئەز شیام کراسێ ئێکی ژێ بنڤیسم و تمامکەم ب‌ئانەها خودێ نێزیك دێ دانمە بەردەستێ هنگو . گەلەك نڤیسا ل دور ڤێ چەندێ ئاخفتن و نڤیسین ، پێنەڤێت ئەز ـ ڤێرێ جارەکا دی بێژمەڤە ، ئەو چ ژخوییا ئان بیانییا بن هندی ژێ هاتی تەخسیری نەکر خودێ کارێ وان ڕاست بینیت و مرییا ژوان ب دلوڤانیا خو ئازاکەت .

هندی من نڤشت دیتین دو ژوان بـتنێ ب دلێ من بون هەرچەندە هەردو ژی دبێ خەلەتی نینن ، ئێك ، ژبەر چاپکرنا کەڤن ، و دو ، ژبەر دەستنڤیسینێ ، وسێ ، ژبەر تێنەگەهشتنا زمانێ خانی یێ نڤیسی . خانی ب‌زاراڤێ هەمی کوردا یێ نڤیس ، سەرداچوییە یێ بێژیت خانی ب بوطانی مەم و زین ڤەهاند ، ژ ڤێراچـوان بەیتێ ئاشکەرا دبیت کو وەنینە ، ئەڤێ چەندێ دێ دکـراسێ ئێکیدا وەکو من گوتی دیارکەم . خانی گەلەك فارسي و عەرەبی و هندەك جارا ژی تورکی ب‌کارهینایە بڕەنگەکێ جوان و شرین کریە سمفونییەکا مەزیکێ بریە ئاسمانێ بلند .

ئەز دبێژم کەسێ هندی سەیدا (عز الدين مصطفى) ل دور مەم و زین و خانی نەنڤیسي و ل‌دوی نەچو بەلێ هەر نەگەهشتە کەمالێ ئەو ژی ژبەر هندێیە هەروەکو ئەو بخو دبێژیت : ئەز ئاشکەراز دبێژم دویرنینە تەفسیرا دکەم یـادروست نەبیت[1] . جـامێری ڕاستی گوت و ئەز ژی وە دبێژم بەلێ ئەو دێ ئێکێ بێژیت و ئەز ئێکا دی و سەیدایەکێ دي ئێکا دی ، بـڤی ڕەنگی دێ گەهین ئان نیزیکی ڕاستێ و دروستێ بین . ئەڤە ژی خلمەتەکا هێژا و پیروزە . ژێدەرێد من هەین ل‌دور ڤێ چەندێ گـەلەکن ژ وان مەمێ ئالان ب‌گەلەك ڕەنگا ب‌دەنگ و ئاواز . بروفیسور قەناتی کوردو دبێژیت « مە سێزدە شوڤێد مەم و زینا زارگوتنا نەتەوەیی کوم کرنە[2] » مخابن ، دڤیا ئەڤێد لنك من ژی هاتبانـە دانان دکتێبەکێدا . ئەڤ بەیتێـد فولکلوری مـە چ وچ ژێ نەگـرت ژبەرکو ژیا خانی ددوێرن . دو نڤشتا ب‌تنێ خو نێزیکی ڕاستێ یێ کری ، ئێك ژ وان ( « مەم و زین » چاپا عامودە سالا 1947 ، طبعة دودێ « ئاراس مطبعەسی ـ حلب » لی حسابی بشیر الشیخ حسن الهاشمی » ژ نشریات ژین هژمارە 2 ) .

یا دووێ ( م ب رودنكو موسكو 1962 ) .

سـەیدا عـزالدین دکتێبا خـودا احمـد الخـانی دبێـژیت کـو ( « هەروەکو دبینم بوز ارسلان ژ هەمی کەسێد ل دور مەم و زینێ نڤیسین چاکتر تێگەهشت[3] » ) ئـەڤچەنـدە نەدروستـە ژبەرکو یا پڕی خەلەتییە چ ژ لای مەعنا ڤە ئان نڤیسینەڤا مالکێد بەیتێ ، ژبەر هندێ من دانا ڕەخەکی . بەلێ دڤێت ل ڤێرێ بێژم کو سەیدا هەژار موکریانی گوتبو کو وی ئالیکارییا رودینکوکربو ل دەمێ وێ مەم و زین دەنڤیسی ، وێ گەلەك خەلەتی یێد تێدا هـەین ، هـەروەسـا چـاپـا سـوریێ 1947 ژبـەر ئـەگـەرێـد دەستنڤیسینێ و چـاپکرنی و تێنـەگەهشتنـا هنـدەك گـوتنـا نەخاسمە عەرەبی . دکتێبێد خاندنگەهادا یێد ئەدەب و زمانێ کوردی گەلەك خەلەتی ڕوی ددەن و سەیدا گوهـ نادەنێ هندی بو بێژە ژی دێ بێژن ئەم نەشێن چ بکەین ، و وەسا خـەلەت نیشا بچوکێد مە ددەن . بو نمونە د کتێبێد خاندنگەهادا چەند مالك ژێ « خانی بو دجلە دبێژیت :

**قەط نینە ژبو تەڕا قەرارەك : غالب ددلێ (تەدا) نەیارەك**

بەلێ دکتێبا رودینکودا هاتییە : **غالب ددلێ تە (دانە) نارەك**

دکتێبێد خاندنگەهادا هاتییە : **غالب ددلێ تە (دانە) یارەك**

و گوتینە ئەی دجلە تو تەنا نابي تو دبێژی نەیـارەك یێ ددلێ تەدا . ئەڤ گوتنە بەلاڤە سەیدا و شاکرد هوسا تێدگەهن ، بەلێ یادروست ئەوە وەکو من گوتی : غالب ددلێ (تەدا) نەیارەك . دیارە (نەیارەك) یی ددلێ تەدا ژبەرهندێ تەنا نابی هەرێ ب پێل و شولقی ، ما ئەگەر ئێکی یارا وی ل دەڤ بیت دێ خو ڤەژەنیت ئان ب‌ئەڤینی دەست سطووی وەرینیت ؟ کتێبا سەیدا عزالدين (احمد الخانی) یا بەرکەتیە و یێ پێڤە کێشاین هزار نەکو صەد ڕەنج بەلێ ب‌باوەرییا من لەز یاکری ژبەر هندی یێ کەتیە داڤێد خەلەتیا و جارەکا دی بێژم زەحمەتیا گەلەك گـوتنا ل‌دویڤ زانینا وی ، من نێزیکی صەد بەرپەڕا ژێ خواند من دیت کو لەز یاکری هەروەکو من گـوتی چەنـد تێبینیەك من نڤیسـین بەلێ ژبەرکو کتێب بعـەرەبییە ژبـەر هندێ ل ڤـێرێ جهێ ل دور ئاخفتنێ نینە ژبلی کو نمونە بو لەزکرنا وی وەکو دبێژیت ( قد لانجد عند خانی صورة لفة اجتماعية مثل (الدبـوز) او بهذا الاسم[4] . ) ئـانکو خـانی بەحسێ پێخـواسا نـەکریـە ، دیارە سەیدای نەزانییە کو (پێخواس) بێ رووتن (حفاة) ، ئان ژی لەزکرییە و ژبیرکریە کو خانی ل دەمێ سەیرانا عیدا سەرسالێ ) نەوروزێ گوتییە :

**پێ خـواس هنـەك هنـەك دسـەرکـول**

**کـاشـو ژ پیـان و سـەر وەکی هـول[5]**

هندەك دپێخواس بێ‌ڕوت هندەکدسەر کول پێت

وان وەکو کاشوا و سەرێد وان وەکو هولان .

ئەز باش دزانم و هەرچێ کتێبا دکتوری خاندی دێ بینیت کوێ شارەزایە دزمانێ عەرەبیدا ، بەلێ ل‌گەل هندی مە ئەڤ چەندە دیت وەکو گوتی :

و ساعداك يعانقان الحمائل دوما[1]
خانى دبێژيت :
دائـم ددلێ تـەدانـە مـەنـزل
دەسـتێ تـە ل گـەردەنـێ حـەمـائـل
ئاشكەرايە ئارمانجا خانى ئەوە كو دەستێ خو وەكو حەمائلێ ل گەردەنێ ئالاندى نەكو دەستێد تە دحەمـائلێ ئـالاندينـە ئان وەراندينە هەروەكو سەيداى گوتى ب عەرەبى .
سەيداى ديسا گوت :
فوقعوها بحسن الطافكم[2]
بەلێ خانى دبێژيت :
ئـمـضـا بـكـرن ب حـوسـن ئـلطاف
ئصفـا بكن ئـەو ب سـەمـع ئنصـاف
ئارمانجا خانى ئەو نينە كو بو من موهركەن ب تبلا ، بـەلێ ب خشكوكى ڤێرا هەڕن و ب دلساخى گوهـ بدەنێ .
گـەلەك رێـكـنـە كـەتن ل ڤێـراچـونـا مـەم و زينـا ڕودينكـو دياردبن . من هندەك ژ وان ليرە ول دوى زانينا خو دانان دا ل پێش چاڤێد هنگو بن و حوكمێ ل سەر بدەن نەخاسمە ئەڤ كتێبە ل هەمو جهان دهێتە خواندن كە دەرس . بێ گوتن من ئەڤچەندە بەرهەڤكرن ل گەل چاپێد دى و ئەز گـەهشتمە ڤێ باوەريێ .
(1) شـەمـعى نـە ژ قسمَ نـور و نـارى
شـەمسي نـەعـەيـان تـو پـەردەدارى[3]
(ژ عەيان تو پەردەدارى دروستترە ، ژبەركو ئارمانجا خـانـى ئـەدە كـو خـودێ ژ بـەر چـاڤـان پـەردەدارە ، ڤەشارتييە ، نەديارە ، ئەو ژى جودايیەكا زمانییـە هەروەكـو بێژين (ژ دوير - نەدوير) .
شـەمـعى نـە ژ قسم نـور و نـارى
شـەمسي ژ عـەيـان تـو پـەردەدارى
چێدبيت بێژين (نە عەيان پەردەدارى) ئانكو تو ناهێيە ديتن و پەردەدارى ل گەل هندێ ژى ئەم وێ پەردێ ژى نابينين ، يا من گوتى دروستترە .
(2) ئـەڤ كـاركـەهـا عـظيـمـە دوّار
ئـەڤ بـاركـەهـا بـديـعـە سێّار[4]
لەنگى و نەدروستييا زمانى يا ديارە بو هەركەسەكێ ڕێزمانێ عەرەبى بزانيت ئەڤجارە هو دروستترە :
كـاركـەهـا عـەظيـم و دەووار
ئـەڤ بـاركـەهـا بـەديـع و سـەييـار
(3) بـالجـمـلة ژبـو مـرا بـكـارن
في الجـمـلە ژبـو مـە بـەردبـارن[5]
بـلجـومـلە ژبـو مـەرا ل كـارن
فـيـلجـومـلە ژبـومـە بـەردبـارن
(4) ئـەى خـالق ارض و آسـمـانـان
وى فـالق جـمـلە انس و جـانـان[6]
ئـەى فـالقێ ئـەرض و ئـاسمـانـان
وەى خـالقێ جـوملە ئنس و جـانـان
(خالق) ئانكو چێكەر ، بەلێ (فالق) ژێك جوداكەر ، ژبەر هندێ دڤێت ئەڤ مالكە هو بيت :
جودايى ديارە ل ناڤبەرا بێژين (ل كارە) ئانكو نهـو يێ كاردكەت ، و (ب كارە) دياردكەت ، كوكارەك وێ هەى چ نهو چ دەمەكێ دى بكەت ، ژبەر هندێ دروست ئەڤەيە :
(5) هـر يـك ژ عـدم كـرن تـە پـيـدا
ابـداع كـرن تـە بـى هـويـدا[7]
خودێ ئەرد و ئاسمان ، حەيوان و نەبات چێكرن بێ (هەيولا) ئانكو بێ تشتى خاڤ (خام) ، هەما گوتێ (كون فكان) نەكـو (هويدا) ئانكو دياركرن ، يا دروست دبيتە :
هـەر يـەك ژ عـەدم كـرن تـە پـەيـدا
ئـبـداع كـرن تـە بـێ هـەيـولا
(6) عـرفـان طلبـيـد صـاحـب ادراك
درحـق تـە گـوتـە مـاعـرفنـاك[8]
ئەڤ (گوتە) بەروارى وەدبێژن ، كێ گوتە ؟ بەهـدينى دبێژن گوتيية ، بەلێ هەروەكو من دچاپێد دىدا ديتى (گوت) هاتيیە ب باوەرييا من ژ ڕيڤەچونا مالكێ و مەعنا و طەرازييا وێ دڤێت هو بيت :
عـرفـان طەلەبـيـد صـاحـب ئـدراك
دەرحـەقّ تـە گـوتِ مـاعـەرەفنـاك
ئان (گوتن) بو جڤاتێ : كومێ يە . گوتەگوت ، گوتگوتك ئانكو (اشاعە) . ئان گوتنا نە بنەجهـ ، ئان پتپتە . خەجو دبێژيتـە سيابەندێ سليڤى : سيابەندو تو بەس بكـە گوتـەگوتـە ، تە جەرگ من كەركر دل و هناڤێد من تە صوتە .
ئانكو ئاخڤتنەكا نە بنەجهـ . نەدجهدا .
(7) حـاصـل ژ عنـاد ئـەگـەر ژ بيـداد
ئـەو بـدعـەت كـر خـلاف مـوعتـاد[9]
(ئەو) بو كەسێ نەديار ، بەلێ (ئەڤ) ديارە ل پێشە ، ژبەر هندێ يا دروست دڤێت هو بيت :
حـاصـل ژ عـنـاد ئـەگـەر ژ بيـداد
ئـەڤ بـدعـەتـە كـر خـلافِ مـوعتـاد
(8) دا خـلق بـنـيـزتـن كـو اكـراد
بـى مـعـرفـتـن بـاصـل و بـنـيـاد[10]
(باصل وبنياد) ل ڤيرێ ئانكو : دبنيرا ، دەبنياتدا چ مەعريفەت نينە . بەلێ ئاشكەرايە ئارمانجا خانى ئەو نييە بەلێ گوتى :

دا خـەلق نـەبـێـژتن کـو ئـەکـراد
بێ مـەعریفـەتن بێ ئـەصـل و بینـاد

دا کەس نەبێژیت کو کـورد دبێ مەعـریفەتن و بێ عـەسل و بنیاتن .

بـی الجـمـلة نـه جـاهـل و نـزانـن
بـلـکـی دسـفـیـل و بـی خـرانـن[9]

(بالجمله) ئانکو ، خڕ ، هەمو ، تێکدا . بەلێ (فی الجمله) هندەك ژێ ، خانی گوتییه :

فیلجـوملە نـە جـاهـل و نـەزانـن
بەلکی د سەفیل (سێفیل) و بێ خودانن

(10) عـلم و هـنـر و کـمـال و اذعـان
شـعـر و غـزل و کـتـاب و دیـوان[9]

(اذعـان) ئـانکـو قـایلبون چ ب دلێ خـو ئـان ب کـوتـەك ، دەستداهێلان . ئەڤچەندە ڤەت ڕێکناکەڤیت ل گەل ئارمانجا خـانی . ئـەو بخـو ب دروستي (ئـەذهـان) ە ، ئـانکـو ڕەوشـەنبیری ، چـاکزانی . ژبەر هندێ مالك هـو دهێت ب ڕاستی :

علم و هـونـەر و کـەمـال و ئـەزهـان
شـعـر و غـەزەل و کتـاب و دیـوان

(11) وقتی کـو مـە دی زمـانـە افـرنـگ
بـالجـمـلة لسر دراف بـو جـنـگ[17]

ل ڤێری دیسا خانی دبێژیت (فی الجمله) هندەك ، بەهـرا پتر نەکو (بالجمله) هەمو .

دەقتی کـو مەدی زەمـانە ئـەفـرەنـگ
فیلجـوملە ل سـەر دراڤ بـو جـەنـگ

(12) خـط کـر مـە ببیـتـە کیمیـاگـر
گـاقـا کـو مـدی نـبـو مـیسّر[18]

یا دروست ئەڤەیە :

حەزکر (حـەخکر) مـە ببینە کیمیـاکەر
گـاڤـا کـو مـەدی نـەبـو میـەسسـەر

(13) دیـن چـو و نکـت بـدست دیـنـار
پـاشی ژ نـچـاری بـونـە صـفـار[19]

ئەڤە لەنکە و دروست نیه بەلێ یا ڕاست .

دین چو و نەکـەت ب دەست مە دینـار
پاشي ژ نـەچـاري بـوینـە صـەففـار

(14) کـرمـانجییـە صرفـە بی گمـانـە
زێـرنـیـنـە بـەبـین سـپـیـدمـانـە[20]

نزانم ڕودینکو بو چ کریه (بەبین) ئەگەر بو دیتنێ بیت دبێژین (ببین) . ئەگەر بو گوتنێ یە دبێژین (ببێن) ئارمانج ژێ بیهنێ نینه بێژین ( بەبێن ئان بەبون ئان بـەبێهن ) ئەڤجـاره دروستی ئەڤەیە :

کـرمـانجییـە صـرفـە بێ گـومـانـە
زێـر نـینـە (ببـێـن) سـپـیـدمـانـە

ئـانکو : کـرمانجیـەکـا خـوسـەرە بێ زەغـەلە زێـڕێ دەستڤەدای نییه .

(15) ئـاڤـا روی شـاعـری نـریـژن
گر ممکنه پێکڤه قنج بەبێژن[21]

یا دروست :

ئـاڤـا رویـێ شـاعـری نـەپـێـرن
گـەر مـومکنـە پێکـە قـەنـج ببێـژن

هندی ژ هنکو بهێت مەدحید فێ دارشتنێ بکەن .

(16) لی زادە دودمـان دولت
نـوبـاره بـوسـتـان رفـعـت[22]

ئەڤەژی گهوڕینەکا نە دجهدایە ڕودینکو نڤیسی ژبەرکو :
(دودمان) ئانکو : مال ، فامیلی (نوبارە) خێڤە ، بەلێ دروستییا ڤێ مالکێ دبنیاتدا هو هاتییه :

لێ زادە دودمـان دولت
نـوبـادە پـوسـتـان عـفـت

زادە و بوبید مالا میري بید فرشك حەلال و شیری (شرابا طهورا) ژ چچکێد پاقژ و عەفیف ڤەخـواری . دڤێت بێژم کـو (نوبادە) شەڕابا نوی ، تازه . (پوستان) مەمك ، چچك .

(17) یـك اسمـر و یـادی وی زری بـو
یـك حـوری و یـادی وی پـری بـو[23]

یـا دردسـت : یـەك ئـەسمـەد و یـا دوێ زەری بو
یـەك حموری و یـا دوێ پـەری بـو

ئەڤە ئێك و دووه . هەروەکو بێژن یا ئێکێ و یا دوێ و یاسیێ .. هتد .

(18) صـور گـل ژخـوەدا لسر هـرستی
سـنبـل بـخـوه پیڤـەدا رهستـی[24]

(داهرستی) داڕستی ، ڕاستی ، شوڕبوی ، پێداهاتی .
(رهستی) ئاکنجي بویی ، جهێ خوتێدا کری .
ژ ڤان مەعنا بومە دیاربو کو مالك یا هویە :

صـورگـول ژ خـوەدا ل سـەر ڕهستی
سنبـل ب خـوه پـێکـڤـە داهـرستـی

هناروکێد ڕوبیا وەکو گولەصوران ، صورافا گولایە داڕشتیـه سەر و کەزی و بسك ژی پێکڤە شوڕبویی و دارستی .

(19) خـــالْ و نـــقــط و بـــيـــاضْ و خــمـــره
بـــيـــت و حـــجـــر و طواف و عـــمـــره[*]

که‌عبه و به‌رێ ڕه‌ش و جلکێد سپی و صوراتییا خویتا قوربانییا ،
خال که‌عبه‌یه نقط وه‌کو به‌رێ ڕه‌ش ، ڕه‌نگێ له‌شێ وان یێ سپی
ئه‌وه مه‌حره‌مێد حه‌جیا ل طه‌واڤێ و حه‌جێ و صوراتییا هناروکێد
ڕوییا وه‌کو خونیا قوربانییا ، هه‌ما ئه‌و نجویه حه‌جا ئه‌ڤیندارا
مه عومرا وان .
خال و نوقه‌ط و به‌یاض و حومره‌یه ، نه‌کو (خومره) .

(20) ســرپــنــجــه و نــاخــنــی مــحــنــا
رنـــجـــنـــده خـــاطـری مـــهــنـــا[*]

(ناخون) نه‌ینوك . (ره‌نجیده) ئالوزکه‌ر .
سه‌رتبل و نه‌ینوکێد خه‌ناکری مروڤێد هزر و بیرمه‌ند و دل ته‌نا ،
ئالوز دکرن .
دارشتنا ڤێ مالکێ دڤێت هو بیت :

سه‌رپه‌نجه و ناخونێد محه‌ننا
ره‌نجیده‌ئێد خاطر مهه‌ننا

(21) خـلقى كـو دديـتى او مـكـرگـاه
حـاضر دكـرن ژ غـور دل آه[*]

چ کورده‌ك نابێژت (ددیتی) به‌لێ (ددیتن) . بیاوه‌رییا من
چێدبیت ل چاپکرنێ خه‌له‌ت هاتبیته کرن .

(22) ظاهـر دكـرن كـو زنـد و بـازن
ايـدى نـه‌دمـا گـلى و گـازن[*]

ئه‌و بخوه یا دروست نه (دمان) ه بو کومێ یه نه کتێ یه .

(23) رابـونـه‌ڤـه خـانـم و خـواتـين
وان ژى تـژى گـل كـرن بـسـاطين[*]

خاتون و خانمێد وه‌کو گولا بیستان تژیکرن . (بساطین) یا کو
مه‌عنا وێ ب عه‌ره‌بی ئه‌ردێ به‌رفره‌هـ ، ب باوه‌رییا من
(به‌ساتین) یا کو دگه‌له‌ك چاپادا هاتی دروستتره . به‌لێ چێدبیت
هه‌ردو بکاربین ، من بخوه دچاپا ڕودینکودا ب تنێ دیتییه ژبه‌ر
هندێ من گوت به‌ساتین بنیاته .

(24) ســودا كــر عــشــق بــون دبــازار
هــن بــائـع حسـن و هـن خـريـدار[*]

هنده‌ك فروش و هنده‌ك بکڕ به‌لێ وه‌سانینه ، خانی گوتی :
سـودا كـر عـشـق بـون دبـازار
هـه‌م بائـع حـوسن و هـه‌م خـه‌ريـدار .

سه‌ودا گرتێد ئه‌ڤینێ بون دبازار ، ئه‌و بخو تێکدا بکڕ و
فروشێد جوانیێ بون .

(25) سر سـالى و بـاكـر و روالان
صـد سـالى و لاو و پـير و كـالان[*]

ڕودینکو شوینا (جوان) (لاو) دانایه وه‌سا زانی کو جوان بو
خشکوکایه ب تنێ ، به‌لێ دزمانێ مه‌دا ئه‌م بو گه‌نجا و لاوان
جوان ژی بکار دهینین وه‌کو بێژین (جانه مه‌رگ) . (جانه‌گا) .

(26) سـرسـال لرسم و راهـه معـهـود
كـيـران دچـه و مـقـام مـحـمـود[*]

ئانکو عیدا سه‌رێ سالێ ب ڕه‌نگ و ڕیێا هه‌رسال دکرن ،
شه‌هیانێد خو گێران ل جهـ و ئه‌ردێ خوش و پیروز . به‌لێ
وه‌نییه .
خانی دبێژیت : **گێران دچو مه‌قام مه‌حمود**
ئانکو : (مه‌قامێ مه‌حمود) جهێ باش ، دوماهییا خوش ، هێژا .
ئه‌و شه‌هیانێد سه‌رێ سالێ دهاتنه گێران بێ نافبڕ و ڕاده‌ستان
هه‌تا دگه‌هشتنه دوماهی و ئارمانجه‌کا خوش ، ئه‌و ژی گه‌هشتنا
کوڕ و کچانه بو بجهـ ئینانا ڤیانێد خو .

(27) هن جـامـه دريـده هن دسـرخـوش
هـن عـقـل رمـيـده هـن مـشـوّش[*]

(دریده) په‌ڕتی ، دڕیای ، (ره‌میده) حێیه‌تی .
به‌لێ یا ب دروستی من دیتی ئه‌ڤه‌یه :
هن جامه دریده هن دبه‌رخوەش      هن عقل رمیده هن مشوّش
(به‌رخوه‌ش) کارکری ، جلك نوی و تازه ، کوك .

(28) حبا دو دلان وەکو حلاوت
بغضا ددلان وەکر عداوت

ب راست :

حوببا ددلان و گەر حەلاوەت
بوغضا د دلان و گەر عەداوەت

ژبەرکو ئەڤ مالکا ل دوی دهێت بومە ڕاستیێ دیاردکەت :

نسبەت ب مە حادثن عەدیمن
لێکن ژ حەقیقەتا قەدیمن

(29) او میوە لکی جهی کهانە
اڤ گل لچە گلشنی نمانە

ڕاستیيا وێ دڤێت هو بیت :

ئەڤ مێوە ل کی جهی کەهانە
ئەڤ گولە د چ گولشەنێ نەمانە

نەما) شینبو . مە گوت (ئەڤ) دروستە ژبەرکو بەراهییا وێ ئەڤ مالکە دهێت :

گوتن عەجەب ئەڤ کچێد کێنە
یان هەردو مەلائکێد خودێنە

(30) دیتن خوە بە پاچەبند و زنگل
پرواز و فرین محال و مشکل

ئەم دبینین (زەنگل) چ گرێدانەك نییە ل گەل مەعنایێ بەلێ (زەنگول) ئانکو خو خڕاندن . (مشکل) گرفتارییە ، موشکلەیە . بەلێ ب دروستی (مەشکولە) ە ، ئانکو ب زەحمت . هەرچەندە هەردو وەکو ئێکن بەلێ طەرازییا مالکێ دیاردبیت .
(پاچەبەند) پێ گرێدایی ، (پەرواز) لوط . ژبەر هندێ مالك دڤێت هو بێت :

دیتن خوە بە پاچەبەند و زەنگول
پەرواز و فڕین مەحال و مەشکول

(31) اسکوفکی ظلمتی بە سردا
جلغویکی الفتی بە بردا

ئەڤە بنەجه نییە بەلێ (اشکویەك) ئانکو ، بانەك . و (جلویەك) ئانکو ، نەحەز . بەلێ (اسکوف) و (جلغو) چ مەعنا نادەن ل ڤێرێ . ژبەرهندێ ، یادروست ئەڤەیە :

ئشکویەکێ ظولمەتێ ب سەردا
جلویەکێ ئولفەتێ ب بەردا

(32) اڤ رنگهە وان دکر تفحص
ماهیت حال خوە تجسس

دیارە ژ مەعنایێ کو (تجسس) نە دجهدایە بەلێ یا ڕاست (تحسس) . ئەڤ چێکا کەتیە بن (ح) وکریە (ج) مەعنا مالکێ تێکدا . دڤێت ببیتە :

ماهییەتا حالێ خوە تحسس

(33) او بونە لڤان جگر کڤاندن
او بونە کو ڤان بدل حبانذن

ئەڤ مالکە یا هاتییە سەرێك و بنێك کرن کەس ژ کوردا نابێژیت (کەڤاند) بەلی (کەواند) . و دروستییا مالکێ هویە :

ئەو بونە کو ڤان ب دل حەباندن
ئەو بونە ل ڤان جەگەر کەواندن

(24) رونشتنە بی مذاق و مشرب
وندا کرنە ذقن و غبغب

بێ خارن و ڤەخوارن ، درونشتی بون و سەرێ خو نخون کربون .
وەسا کو ئەرزێنکێد وان دناڤ بەرکوڕا وانڕا بەرزە ببو .
(ذقن) ئانکو : ئەرزێنك . (غبغب) ئانکو . بەرکوڕ .
مالك هوسا دهێت :

ڕونشتنە بێ مەذاق و مەشرەب
وندا کرنە ذِقِن د غەبغەب

(41) چلو بوی جوحمی د تازە
رنکی سمنی بجای غازە

(چلو) من نەدیت چ مەعنا بدەت . هەروەسا (جوجم) . بەلی یا دروست (جەلوا ، جەلواد) ئانکو ، داماییی ، بێهن طەنگ .
(جوجەم) ئانکو :
طای داری بێ تەڕ و ب کولیلك . (سەمەن) گولا ئاسمین یا سپیتاله .
(غازه) صوراف ، صوراتی . ل دوی ڤێ ئێکێ دڤێت مالك یا هو بیت :

جەلواد بویی جوجەمێد تازه
ڕەنگێ سەمەنێ ب جای غازه

(جای) شوینا .

(35) زیتی مه و آگری دئیسا
بربومه دلی مه پی دئیسا[34]

(ئەبیز) ئانکو ، چریسکا ئاگری .
یادروست :

زەیتا مه و ئاگرێ مه دیسا
بەربو مه و دل مه پێ ئەبیسا

بو هندێ دا مەعنا دیاربیت مالكا بەری وێ دێ بو هنگو ئینم ، دبێژیت :

قندیل و فتیله گەر ژوان بو
ئاگر ژ ڕوخێ مه هەردووان بو

ستی و زینێ ڕاوەستابون ل هنداف مەم و تاجدین هەردو لاوێد ژبەر جوانییا هەردو پەرییا کەتین بێ هوش و بێ های . و تەماشەی ڕوییێد هەردو طولازا دکرن ، ڕوییێد وان زەریان وەسا ژ عشق و ئەڤینێ و شەرما ، نەکە ڕێبارەك ببوریت ، صوربون هەروەکو ئاگرێ تێدا ب شەوق کەتن ، وەکو جرایەکێ کو فتیله و قندیله وئاگری بەرددەنە فتیلێ دا ڕوناهیێ بدەتە طاریێ . ڕوییێ هەردو لاوا ، ئێك چرا ، قندیل بو یێ دی فتیل بو و ئاگری وی ژ ڕوێ هەردو زەرییا شەوقدا .

(36) صوهتن خوه بخوه بزان چه حاله
هشیاریه خونه یا خَیاله[35]

دروستی :

صوهتین خوه بخوه نزان چ حاله
هشیاریه خەونه یا خەیاله

گوتن : ئەم صوتین هەما خوب خونزانین ژبەر چ ، ئەڤەیە حالێ مه ، ئەم دهشیارین ، ڕەشەیە خەونە چ یە ئەوان نەگوتیە پیرێ کا سەحکێ ئەم بو چ هولێهاتین دا بهێتە گوتن ، بزان چ حاله .

(37) دل وه نبت بکسفه مائل
قیز و ادانی و اراذل[36]

یا فەرە مالکە ل پێش و پاش ڤێ دانمە ڤێرێ دا هون ژێ باش سەحکمەنە مەعنا دروست .

ژ ئەوچەند عالەما رجالان
بەکزاده و ساده و ڕوئالان

دل قەط وە نەبت ب کەسفە مائِل
کیژن دئەدانی و ئەزاذل

بێ نام و نشان و غەیر مەعروف
قەلبێ وە ب وان کو بوویە مەشغوف

بومە دیاربو کو خانی نەگوتیە (قیز و ادانی و ئەراذل) ئانکو کچ و ڕوییتەلە وسێڤیل . بەلێ یێ گوتی هون هەمی خەلکێ جزیرێ ب کچ و کور و زەلامڤە دنیاسن ، ئەڤجارە ئەڤە دێ کی بن (کی‌نە ، کیژن) هند دبەرنەکەتی هون ناناسن ؟ دڤێت ژڤی توخمی بن ژبەرکومەزن و ماقویلا هون دناسن کەس نامینیت ژ بلی ڕاخویتە و ژاران . رودینکو وەسا تێگەهشت کو (کیژ) ئانکو (قیز) ژبەر هندێ خەلەتکر .

(38) لەوڕا بومە بوویە صەبر و سامان
ئەو بو منە خاتما سلیمان[37]

مەمێ گوت . صەبر و تەنایيا دلێ من ب وێ گوستیلێ دهێت یا ناڤێ زینێ ل سەر نەقشاندی ، خانێ پێدار گوتی :

(39) شینم تو دزانی او جزیره
تیکدا کبرا و کرد و میره[38]

ب دروست :

**شێخم تو دزانی ئەڤ جزیرە**
**تێکدا کوبەرا و کورە میرە**

ئەو بخول جزیرێ بون ناهێتە گوتن (ئەو) بەلێ (ئەڤ) . خر مەزن و میرزانە ، پسمیرن و میرن نە و (کرد) . چێدبو گردە مێر) بەلێ لێکناهیت .

**تکرار ل دەست و پێ و داڤان**
**صد بوسە ددان اوان دو لاوان**[40]

مەمێ و تاجدین صەد جاران دەست و پێ و دهمەنا کراسێ داینیێ ماچکرن . (دامان) دەهمەن نەکو (داڤان) .

دروست :

**تکرار ل دەست و پێ و دامان**
**صەد بوسە ددان ئەوان دو لاوان**

(41) **صدقی سر و زلف و خالی زینی**
**مستینە ژ دەست مە نکینی**

صەدقا سەرێ زینێ خودانا جوانیێ گوستیلێ ژ تبلا من نەکە

دروست :

**صەدەقە سەر ذیلجەمال زینێ**
**مەستینە ژ دەستێ مە نکینێ**

بێ گوتن ئەڤە دوماهی نینە ل گەل هندێ ژی هندەك تێبینێد دی یێد هەین دێ بینن ئەگەر خودێ کرە قسمەت و مەم و زینا خانی من چاپکر . خودێ ئانەها هەمی نڤیسا بدەت .

**دهمەن**

(1) احمد الخاني ـ شاعرا ومفكرا وفيلسوفا بغداد 1979 ب پ 15 .
(2) بروفیسور قەناتی کوردو ـ گوڤاری کوری زانیاری کورد بەرگی شەشەم
(3) احمد الخاني ـ شاعرا ومفكرا ، ب پ 63 .
4 - رودینکو ـ ب پ 56 .
5 - احمد الخاني ـ ب پ 30 .
67 - احمد الخاني ـ ب پ 33 .
7 - رودینکو ب پ 17 مالك 11 .
8 - رودینکو ب پ 18 مالك 27 .
9 - رودینکو ب پ 19 مالك 32 .
10 - رودینکو ب پ 19 مالك 40 .
11 - رودینکو ب پ 20 مالك 49 .
12 - رودینکو ب پ 23 مالك 90 .
13 - رودینکو ب پ 34 مالك 227 .
14 - رودینکو ب پ 34 مالك 240 .
15 - رودینکو ب پ 35 مالك 246 .
16 - رودینکو ب پ 35 مالك 348 .
17 - رودینکو ب پ 36 مالك 258 .
18 - رودینکو ب پ 36 مالك 259 .
19 - رودینکو ب پ 36 مالك 262 .
20 - رودینکو ب پ 37 مالك 267 .
21 - رودینکو ب پ 44 مالك 359 .
22 - رودینکو ب پ 45 مالك 384 .
23 - رودینکو ب پ 45 مالك 391 .
24 - رودینکو ب پ 46 مالك 397 .
25 - رودینکو ب پ 46 مالك 400 .
26 - رودینکو ب پ 46 مالك 409 .
27 - رودینکو بەر پەر 47 مالك 410 .
28 - رودینکو بەر پەر 47 مالك 411 .
29 - رودینکو بەر پەر 54 مالك 503 .
30 - رودینکو بەر پەر 54 مالك 509 .
31 - رودینکو بەر پەر 54 مالك 510 .
32 - رودینکو بەر پەر 54 مالك 511 .
33 - رودینکو بەر پەر 56 مالك 532 .
34 - رودینکو بەر پەر 58 مالك 565 .
35 - رودینکو بەر پەر 59 مالك 574 .
36 - رودینکو بەر پەر 60 مالك 600 .
37 - رودینکو بەر پەر 61 مالك 601 .
38 - رودینکو بەر پەر 61 مالك 607 .
39 - رودینکو بەر پەر 62 مالك 624 .
40 - رودینکو بەر پەر 64 مالك 651 .
41 - رودینکو بەر پەر 64 مالك 653 .
42 - رودینکو بەر پەر 66 مالك 691 .
43 - رودینکو بەر پەر 67 مالك 692 .
44 - رودینکو بەر پەر 68 مالك 708 .
45 - رودینکو بەر پەر 69 مالك 725 .
46 - رودینکو بەر پەر 72 مالك 765 .
47 - رودینکو بەر پەر 74 مالك 805 .
48 - رودینکو بەپەر 75 مالك 818 .



سۆران مەحوی

# مەلا ئەسعەدی مەحوی

# لە فەرهەنگی بەسەرکردنەوەدا

**سەرەتا : -**

گوایە هەندێ لە پسپۆرانی مێژووی ئەدەبی کوردی پێیان وایە ، دوا چۆری شیعری کلاسیکی کوردی ، بە مردنی خوا لێ خۆش بوو شاعیران (بێخود) و (کەمالی) ووشکایی دێت و ئیتر لەو رووەوەو هیچ شتێك لە گۆرێدا نامێنێ .

بەلام راستێکەی بە پێچەوانەی ئەو رایەوە ، بەشێکی تر لە ئەدیبان و رووناکبیران ، رایان لەوەدا جووت دەبێتەوە ، کە شیعری کلاسیکی کوردی زۆری بە دەمەوە مابێت و تادەرحال تك بر نەبووبێ . چونکە تا ئێمرۆش چەندان شاعیر هەبن ، بالە ناوەرۆکیش دا چەند باس و بابەتێکی نوێیان بەدەستەوە دابێ ، بەلام لە شێوەو دارشتن دا هەر لەسەر هەمان دەستوورو یاسای شیعری کلاسیکی کوردی بەرێوە بچن و پەیرەوی یەکی تەواوی ئەو هەل و مەرجانەش بکەن ، کە بۆ ئەو مەبەستە رەخساوە . جا یەکێك لەو شاعیرانەی لەسەر ئەو رێچکەیە شیعری هۆنیوەتەوەو سەر بە قوتابخانەی شیعری کلاسکی کوردی یەو کۆچی دواییشی زۆر دوای مردنی شاعیران بێخودو کەمالی کەوتوتەوە ( مەلا ئەسعەدی مەحوی ) یە [ 1898 — 1976 ] .

**پاشکۆی سەرەتا : -**

مەلا ئەسعەدی مەحوی ، کوری شێخ خالیدو[1] کورەزای شاعیری مەزن مەحوی یە ، ئەم شاعیرە لە سالی (1898) ی زاینی دا لە گەرەکی چواڕباغی سلێمانی لە بنەماڵەیەکی ئاینی و سەربەزانست و خاوەن تەریقەت هاتۆتە دنیاوە[2] بۆ یەکەمجار لە خزمەت جەنابی باوکیدا خوێندویتی و پاشان بۆ ئەو مەبەستە خراوەتە حووجرەی (خواجە فەندی) و لەوێ کەلکێکی زۆری وەرگرتووە .

دوای خوێندن لە حووجرەی خواجە ئەفەندی ، لە سالی (1915) ی زاینی دا چۆتە قوتابخانەی ئەعدادی یەو بە یەکێك لە قوتابی یە دیارو چالاکەکانی ئەو خوێندنگایە دادەنرێت . پاشان لەبەر ئەوەی لە بنە ماڵەیەکی ئایینی و (موقەیەد) بەچەند داب و نەرێتێکی تایبەتی دەبێت ، لەوێش خۆی دەگوێزێتەوە بۆ خوێندنگا ئاینیەیەکان و خوێندنی علومی مەلایەتی و وەرگرتنی دەرسی فیقهو شەریعەت .

جا وەك گشت فەقێیەکانی ئەو سەردەمە بە دوای خوێندنی مەلایەتی دا ، گەلێ شارەو شارو زۆر مزگەوتاو مزگەوتی کردوە . تا بۆ دواجار لە سلیمانی لەخزمەت مامۆستایان ( شێخ بابا عەلی ) و ( شێخ عومەری قەرەداغی ) و ( مەلا حسێنی پسکەنی[3] ) دەخوێنێ و دوایش هەر جەنابی مامۆستا مەلاحسێن ، ئیجازەی مەلایەتی دەداتێ .

ئاکام دەبێتە مەلایەکی ناودارو قابیل ، سەرەتا لە مزگەوتی[4] خومخانە تەدریس دەکات و پاشان لەبەر پیرو کەنەفتی باوکی دەچێتەوە خانەقای خۆیان و لە شوێن باوك و باپیری دادەنیشێت و ناهێلێت شوێنەواریان وەجاخ کوێر ببێتەوە .

**تێکی‌تر دەربارەی شاعیر : ـ**

ـعیر مەلا ئەسعەدی مەحوی تەمەنی ژیان‌و ژینی ئـەدەبی ـەکرێت بە (سێ) قۆناخ‌و بەشەوە : ـ

- سەرەتاو بەشی یەکەمی ژیانی شاعیر ، وەك لەمەوپێش لێی ـوایـن ، بریتی‌یە لە خوێندن‌و گەڕان بە دوای وەرگرتنی عیلم‌و زانست‌داو پێ گەیاندنی خۆی لەو بارەوەو ئامادە کردن‌و قال بوونی بۆ دوا ڕۆژو تاقی کردنەوەکانی ژیان ..
- شـاعیر دوای بـڕینی ئەو قـۆناغـەو تـەواو کـردنی عیلمی مـەلایـەتی‌و شـارەزایی لەو بـوارەدا ، ڕوو لە قـۆنـاخ‌و مـەیدانێکی نـوێ‌تر دەنێت‌و ئـەویش بریتی‌یـە لەو ژیانـە ڕامیاری‌و جم‌و جۆڵانەی شاعیر لەو بوارەدا نواندویەتی .

خـوا لێ خـۆش‌بـوو مـەلا ئـەسعـەدی مـەحـوی تـوانی بەتێکۆشانی دلسۆزان‌و هاریکارێتی چـەند کـەڵە پیاوێکی کـورد[5] لە سـاڵانی (1936) ی زاینی‌دا (پـارتێکی سیـاسی) بەناوی (کۆمەڵی برایەتی) پەوە دابمەزرێنن‌و مەبەستیش لەو پارتە بەپێی ئەو پرۆگرامەی بۆ خـۆیان دانـابوو ، دژ بـە ئیمپـریالزمی ئینگلیـزی بن‌و پەنـاوپشتی هەمـوو نیشمان پەروەران بگرن .

جا ڕاستی خزمـەتێکی باشیـان بەگـەلی عیراق‌و تـایبەتی نەتەوەی کورد کرد ، لەبەر ئەوە دەبینین شاعیر لەم بەشەی ژیانی‌دا زۆر چەرمەسەری‌و ئاوارە بوون‌و تـاڵ‌و سوێـری بینیوەو ئەنجام بەوە شکایەوە ، شـاعیر دوای زۆر گـرتن‌و بەربوونی لە بەندیخانەکانی سلیمانی‌و کەرکووك‌دا ، توانی لە ساڵی 1943 ی زاینی‌دا بەهاو بەشی کردنی [ شێخ لەتیفی حـەفید ] ڕوو بکـەنە کـوردستانی ئێـران‌و[6] لەوێش دژی دوژمنکارێتی فارسەکان بوەستنەوە .

ئێنجا ئەم هەموو هەڵچوون‌و داچوون‌و کسپەو سوێ‌یانـە شاعیر چێژتوویەتی ، بوونەتە هەوێنێکی بەپێز بۆ شیعرەکانی‌و وەك ئاوێنەیەکی بەلانمای بە شیعرەکانی‌یەوە دیارە[7] . جگە لەمانەش ئەگەر بەووردی سەیرێکی دیوانەکەی بکەین ، بێ لەو شیعرانەی ، پڕێ لە شیعرەکانی تری لە خانەی شیعری عەشق‌و ئاینی‌و کـۆمەلایـەتی‌دا جێگایـان دەبێتەوە . کـە هەربەشەی هەڵقووڵاوی موعاناتێکی تایبەتی شاعیرن .

- بەڵام دوابەشی قۆناغی ژیانی شاعیر ، بەرای من بەوە دەست پێ دەکات ، شاعیر چۆتە ژیانێکی گۆشە گیری‌و خۆکشانەوەو دوورخستنەوەی لە ژیانە ڕامیاری‌یەکەی‌و هۆی سەرەکیش بۆ ئەمە ، لاوازی‌و زەبووی‌و بێ‌تاقەتی شاعیرو ڕووەو پیرو کەنەفت بوونی تا ئەوەبوو ، سەرجەم ژیانی ڕۆژانەی خۆی تـەرخان بکـات ، بۆ مـوتالاکـردن‌و خوێنـدنەوەی پـەڕاوە ئاینی‌یەکان‌و چوونە ناو دنیای عالەمی تەسەوف‌و عیبادەت کردنێکی بێ‌ڕیاوە[8] .

**تێکڕای شیعرەکانی شاعیر : ـ**

گشت شیعرەکانی شـاعیر دەکـرێن بە چـەند بـەشێکەوەو کـەرتی هەرە گـەورەو زۆری شیعـرە ڕامیـاری یـەکـان‌و کــەرتـەکـەی تـریشی بـۆ شـیعـرە دڵداری‌و ئـایـنی‌و کۆمەلایەتی‌یەکانی دەمێنێتەوە .... ئێنجـا ئەوەی لێـرەدا جێگـای مـەبـەستـەو دەمـەوێ بیلێم : ـ بـاس‌کـردن‌و لێکۆڵینەوەی شیعرە ڕامیاری‌یەکان بۆ خوێنەران جێ‌دێڵین‌و من بە پێی توانـا کەمێ لە شیعـرە دڵداری‌و ئایینی‌کـانی شاعیر دەدوێم‌و لەو دەلاقەیەوە پەنجە بۆ ئەو راستییەیش درێـژ دەکەم ، کـە شاعـیر وەك [ وەرگرتن‌یـان لاسایی ] کردنەوەی شیعری بە چ شاعیرێکی گەورەی بەر لە خۆیەوە کارتێ‌کراوە .

ئێستاش ئێوەو ئەو ڕاستیانەو سەرەتا بەم شیعرەی شاعیر تێ‌هەڵدەچین ، کە شاعیر دەڵێ : ـ

بهێنە جامی مەی ساقی بە پێوان[9] .
گوڵ‌و بولبول بەجووتی بوونە میوان
ڕووناکە ڕەوزەنی سینەم ئەمێستا ؛
بە شوعلەی شەوچرای کوڵی جەوانان ..
هەناسەم لائەخا ، زوڵفی خەیاتەی ؛
شووعاعی دێتەدەر ، خۆری بەیان یان ..
بە دەم نووکی موژەی ئەو چاو غەزالە ،
پەرێشانە جەرگ‌و دڵم پەرێشان ..
بە کەیفی من برا ، باوەڕ مەکە قەد ،
لەسەر شانم خەمە بارستی کێوان ..
ئەزانن بۆچی غەم بوون بە جووتم ؟
بە دڵما دێ جودایی ڕویی خووبان ..
ئەوا مرد (ئەسعەد) ی بێچارە یاران ،
لە دەس جەورو جەفاکاری ڕەقیبان ..

دەبینین مەلا ئەسعەدی مەحوی تاچ ئەندازەیەك بە شیعرە پڕ لە بەلاغەت و ووردە کاری‌یەکەی شاعیری مەزن مامۆستا نالی [1797 — 1855] [ لە دووگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان ](10) ەوە کارتێ‌کراوە .. نالی سینەو بەرۆکی خۆشەویستەکەی شوبهاندوە بەخۆرو کاتێ دەکەوێتە ڕوو ، بەو نوێژی شێوان و تاریکی‌یە ، دنیا ڕۆشنا دەکاتەوە .. تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە سەرچاوی هەموو روناکی‌یەکە ، لەترس و خۆف ڕووی نازدارەکەی ، وەك شێت دیوانە دەبێت و هەڵ دێت بۆ کێوان و خۆی دەشارێتەوە ..
کەوابوو (ڕوو سینەی) یاری نازداری ، فیتنەیەکی وەهای گێرا خۆری بەو دەردە بردو شاعیریشی مەست و لە هۆش برد .. بە جۆرێکی وەها دوو دیدەکانی پڕن لە فرمێسکێکی سووروو سوێر .

ئەنجام مەگەر دوو ماچی لێوی یار ببێتە مەزەی شەراب و کەمێ هۆش و ئارام و تین و هێز بگەڕێنێتەوە جەستە .. ئەوەی جێگای سەرنجە مەلا ئەسعەد لەم شیعرەی‌دا بەپێچەوانەی نالی شاعیرەوە ، کە ئەو یەکەوڕاست لەگەڵ دلدارەکەیدا دەدوێت ، ئەم سەرەتا هاتووە پەنا ئاباتە بەر جامی مەی ساقی و لە ڕێگای چوونە ناو دنیای خەیاڵ و بێ‌هۆشی‌یەوە دەچێتە کرکۆکی جیهانی دلداری و ئەوین کاری‌یەکەوە . پاشانیش شاعیر کاتێ لە نازدارو دلخوازەکەی نیزیك دەبێتەوە ، ئەوەندە خەم بارستە لە سەرشانی دادەنێ و ترسی ئەوەی لێ دەنیشت یاربەو هەموو شۆخ و شەنگی‌یەی لێ‌ی جیا ببێتەوە .
مەلا ئەسعەدی مەحوی بێ لەوانەش بە پێچەوانەی نالی‌یەوە کە [ سینەو ڕوومەت و زلف و چاوی ] کردوتە هەوێنی شیعرەکەی ، ئەم [ کولم و موژەو جەرگ و دڵ و بەیەك گەیشتن و جیا بوونەوەی ] بەکارهێناوە .
شاعیر لە شیعرێکی‌تری‌دا دەڵێ : —

ئەی نووری چەمم بێت و ئەمن ڕەهگوزەرت بم(11) ،
ئەم جەژنە کە قوربانە ، بەقوربانی سەرت بم ..
شایانی (تحمل) نی‌یە دڵ ، بێ لەبی ئاڵت ،
مەیلێکە فیدای گۆشەی مەیل و نەزەرت بم ..
بێ نووری چەمت ، نووری نی‌یە ، نووری چەمانت ،
قوربانی چەم و ڕێ‌ی چەم و خاکی دەرت بم
بۆ دەفعی غەم و غوسەیی دڵ مەکتەبی تۆیە ،
بمنێرە سەرەو دەفتەری خۆت با نەفەرت بم ..
میحرابی منە تاقی دوو ئەبرۆی کەوانت ؛
تقدیربکە ، تاکو ئەبەد سەجدە بەرت بم ..
شادە هەموو کەس لەو چەمەن و ڕەومەنەی حوسنە ؛
بێ مرووەتی‌یە گیانە ئەمن دەر بەدەرت بم ..
تاکەی بەتەمای جیلوەیی تۆ (ئەسعەد) ی غەمبار
ئەی نووری دڵم فەرموو بە قوربانی سەرت بم ..

بەڵێ ئەگەر تێ‌ڕوانی‌نە ، ئەم شیعرەو لەو لاشەوە کەمێ بگەڕێینەوە دواوەو تەنانەت سەرنجێ لە شیعرێکی خوالی خۆش‌بوو ، مستەفا بەگی کوردی [ 1809 — 1849 ] بگرین .. گومان لەوەدا نامێنێ دەبینین مەلا ئەسعەد بەوەدا کەشوێن پێ‌ی مستەفا بەگی هەڵگرتووە چ لە شێوەو چ لە ناوەرۆك‌دا(12) ئەشێ بڵێین : — شاعیر تا رادەیەکی باش لە ژێر تەوژم و هێزی پالەپەستۆی کارتێ‌کردنی یەکێك لە شیعرەکانی ئەودا ، ئەو شیعرەی ڕسکاندوە .
لێرەدا ئەوەندە هەیە ، شیعرەکەی کوردی تام و چێژیك دەبەخشێ و شیعرەکەی ئەسعەد مەحویش جگە لەلایەنە کۆڕانکاری و داهێنان و لایەنە ئیبداعی‌یەکەی تام و بۆو لەزەتی تایبەتی خۆی هەیە ... من لێرەدا دەڵێم : — ئەو کەسەی کوردی ڕووی دەمی تێ‌کردوە ، دووڕنی‌یە لەگەڵ یەکێکی وەك (قالە) ی نەبێت ، کەچی ئەمە لای ئەسعەد مەحوی شاعیر ئاوەژوو دەبێتەوە بەکچە شۆخێکی ناسك و نازدارو لێو ئاڵ و دیدە ڕووناك و گەش . ئەو شۆخەی هەردەم شاعیر بۆ بینینی بۆتە بتی ڕێگای چەم و هەمیشە مەیلی نەزەریتی و دوو تاقی برۆشی شوێن میحراب و جێگای سوجدە بردنێتی .
سەرەرای ئەمانە هەمووی ، کەپڕن لە تازە گەریتی و داهێنانێکی وەستایانە ، شاعیر توانیویتی بە زمانێکی تەڕو پاراو بەدوی و ووشە ئارایی و جیناس و جوانکاری‌یەکی زیاد لە پێویستیش لە بۆتەی شیعرەکەی‌دا جۆش‌بدات .
بەلام شاعیر لەو شیعرەی [ سەد حەیفە ئەمڕۆ ] و [ دوابەری من دەم بەدەم(13) ] دا ، کە بەم جۆرە تێ‌هەڵدەچێت و دەڵێ : —

حەیف ئەمڕۆنی‌یە ، نەی ماوەتن ساغی ڕەواج ،
ە پارمن عالەمێ بۆ پارەیەکی عەینی ساج .

کی زەڕ ، ئـەهلی معـانی خستـە گـوڕ کـەمێشـەوە ، زەڕ
ستانی وولایەت ، ئابـڕو بێ‌سینە بـاج .. یان لە شیعـری
وبەری من ... ] دا کە دەڵێ : ـ

بەری من دەم بە دەم ، ناوی دەمی ئەغیارە بۆچ ؟
نەکا ئەو خونچەیەی نەشکوفتەیەی سەردارە بۆچ ؟

ە کۆتایی‌دا دەڵێ : ـ

کە مردی (ئەسعەدا) باگەنجی قاروونت ببێ ،
حومنی کفنێکی رووتی ، ئێکە ئەم بەدکارە بۆچ ؟ .

یەکسەرو کـوت‌ومت ، سێبەرو تـارمایی شیعـرەکانی خـواڵی
خۆش‌بوو مـەحوی [ 1830 — 1904 ] بـۆ [ پارە حـەیفە خـۆت
مکەی پولی نارەواج ] یان شیعری [ تۆ نەبینن نووری ئـەم
جوانە بۆچ[14] ] ی پێوە دیارە .

نەشێ ئەم کارتێ کردنەی شاعـیر بە مـەحوی بـاپیری‌یـەوە ،
هەروەها لە خۆیەوە نەهاتبێت ، ئەگەر کارتێ کردنی شاعیر بە
نالی‌و کوردی ] یەوە لە دوورەبێت‌و هونـەری شیعری ئـەو
شاعیرانە دەوورێکی گەورەی بووبێت ، ئەمیان مەحـوی هەر
زۆر لە نیزیکەوەیەو لایەنە تەسەوفەکەی هەر یەکجار زۆرکاری
ە شاعیرکردوە ..
ئینجا دەمێنێتەوە سـەر ئەوەی بڵێـین : ـ ئەم دوو شیعـرەی
مەحوی ئەگەر ناوەرۆکی وەك یەکێتی بابەت لە بەیتێکەوە بۆ
بەیتێکی‌تر جیاواز بێ‌و هەریەکەیان لەباسێ‌بدوێ .. ئەوا ئـەو
شیعرانەی شاعیر لەچاو شیعرەکانی مەحوی‌دا ، هەر زۆرتـر
یەکێتی بابەتی تیا ڕەچاو دەکرێ‌و ئەمەش بێ‌شك بە سیفەتێکی
گرنگ لە شیعری کلاسیکی‌دا دەژمێرێت ...ئەمانە بەهەرحال ،
ئێستا کاتی ئەوە هاتـووە پەنجـە بۆ شیعـرێکی ئاینی شـاعیر
ڕابکێشین‌و بزانیین لەو بوارەش‌دا ئایا چۆن لە شیعرە دڵداری‌و
هەندێ لە شیعرە کۆمەلایەتی‌یەکانی‌دا ، کەوتبووە ژێـر باری
تەووژمی کارتێ‌کردنی بەشێ لە شاعیرانەوە هەر بەو جۆرەش
ئەو دیاردەیە بە شیعرە دینی‌و ئاینی‌یەکانی یەوە دیارە ؟!
بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانە ، ئێستا ئەم شیعرەی شاعیر بۆ
خوێنەرانی هێژا بە نموونە دەهێنینەوە : ـ

یا ڕەبی‌چی‌یە ؟ هێندە بە ئازارە دڵی‌من ؛
حەیرانی خەت‌و خالی لەبی یارە دڵی‌من ..
سووتاو پەرێشان‌و جگەر قیمەوو جنراو ؛
شەیدای قەدو قامەتی دلدارە دڵی‌من ..
کون کونە سینە ، بەدەم نەشتەری موژگان
کاول بووە لەم خانە کە بێزارە دڵی‌من ..

تا کۆتایی شیعرەکە دەڵێ : ـ

بۆ ترسی جەزا هێندە بەخوڕ خوێن ئەڕژێنم ،
بێ عەینی ئەڵێی گەوهەرو گوڵزارە دڵی‌من ..
ئەی وای لە بۆ خاکی مەدینە (ئەسعەد)
بۆ وەسڵی ئەوە هارو بەهاوارە دڵی‌من[15] ..

بە خوێندنەوەیەکی سەرزارەکی ئەم شیعرە ، خوێنەر نەك لە
ڕووی شێوەو دارشتنی شیعرەکەوە ، بگرە لە ناوەرۆکیش‌دا ،
خۆو ڕاستان دەگەڕێتەوە بۆ شیعرە بەناو بانگەکـەی بێخودی
شاعیر [ لەو ڕۆژەوە تۆراوە دڵی من ][16] ..
هەر چەند بێخودی شاعیر ئەو سۆزو کسپەو دەربڕینەی بەهۆی
خنکـاندنی بـرازاکەیـەوە لە ڕووبـاری دیجلەدا بـووەو ئـەو
کارەساتە هەوێنێکی قووڵ‌و ووردی بە موعاناتی شاعیر داوەو
لەو ڕووەوە ئـەو شیعـرەی دانـاوە .کـەچی دەبینـین ئـەم
کەرەستانە لای ئەسعەد مەحـوی نین‌و لەگـەڵ ئەوانـەش‌دا
شاعیر توانیوێتی شیعرەکەی هاوتاو هاو سەنگی ئەو لێ بکاتەوە
.. ئەگەر شاعیر بـەو کارە پڕ لەوەستایـانەیـەی لە بێخودی
شاعیری تێ‌نـەپەڕانـد بێت .. بە بـڕوای من هیچیشی لە ئەو
کەمترنی‌یە .
بەهەر حاڵ ئەم دیاردەیە کەئێمە ئیمڕۆ پێ‌ی دەڵێین : ـ
**[ لاسـایی‌کـردنـەوە یـان وەرگـرتن یـان کـارتێ‌کـردن لە شیعردا ]**

لای شاعیرانی دوا شاعیرانی کلاسیکی بە کارێکی شیاوو باو لە قەڵەم دراوە .
جا بەبڕوای من هۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆو ئەم هۆیانەی تیشکی سەرنجیان دەخەینە سەر : ـ

1 — شاعیر ویستویێتی لە ڕێگای ئەو شیعرانەیەوە پەنجە بازی لەگەڵ ئەو کەڵە شاعیرانەدا بکات و خۆیان بخەنە ڕیزی ئەوان و شان بە شانیان بوە ستنەوە ..دیارە بەمەش ناوبانگی و ناو زراندنێکی گەورەی لەدواوە دەبێت .
2 — یان شاعیر ویستویێتی خۆی بەخاوەن هەمان بیروڕای یان پێچەوانەی ڕای شاعیرە کلاسیکی یەکە بزانێت و ئەم شتانە بۆ خوێنەر ڕوون بکاتەوە .
3 — زۆر جار شاعیر گومانی لەوە کردوە ، کە گوایە شاعیرە کلاسیکی یەکە ئەو بیرە فەلسەفەیەی دەری بڕیوە ، هێشتا کەم و کوڕی تیایەو وا ئەم دێت لەو فەلسەفەیە زیاد دەکات و ناتەواوی یەکانی دەخاتەڕوو دیارە ئەمانەیش لای خوێنەران هەمووی لایەنی چاکن و بەلام لەو شتە خراپانەش کە دەبێتە کۆسپێك لە بەردەم شاعیرداو ڕێگا لە بەرەو پێش چوونی شاعیر دەگرێت ، ئەوەیە ئەو شاعیرە بەو کارتێکردنەی یان وەرگرتن و لاسایی کردنەوەی ڕێگای داهێنان و ئیبداعکاری و زۆر شتی تر کەلەو جوغزەدا دەخولێتەوە نامێنن ..

**بەرهەمەکانی شاعیر : ـ**
بەرهەمەکانی شاعیر بریتین لە شیعر ... پەڕاوە ئاینی یەکان ... پاشان ئەو یاداشتانەی شاعیر لە دوای بەجێ ماون . لە مەیدانی شیعردا بەشێك لە شیعرەکانی بە ناوی [ دیوانی ئەسعەد مەحوی ] یەوە لە ساڵی 1970 ی زایینیدا لە چاپخانەی ڕاپەڕین بە چاپ گەیەنراوەو ئیستاش بە هیوای لە چاپدانی بە شێکی تری شیعرەکانین .
بەلام دەربارەی پەڕاوە ئاینی یەکانی کە زۆری بەزمانی عەرەبی نووسراون و بەچاپ گەیشتوون ئەمانەن : ـ

* عقائد الرحمانية * تحسين البيانية
* شرح على العقائد الرحمانية .. جگە لەمانەش چەند ووردە حاشی یەکی تری بەسەر هەندێ پەڕاوی ئاینی یەوە هەن ، کە هێشتا بەدەست نووسی ماونەتەوە .
ئەمانە لەلایە ، لەسەرێکی تریشەوە زووربەی زۆری یاداشتەکانی[17] شاعیر کە لەژیانی ڕامیاری دەدوێت دەربارەی چۆنێتی دامەزراندنی (کۆمەڵی برایەتی[18]) و ئەو جم و جۆڵ و خزمەتانەی بەگەل و نیشتمانیان گەیاندوەو هەروەها چوونی شاعیر لەگەڵ چەند کەڵە پیاوێکی کورددا بۆ ئێران و ئەو دەوورە کاریگەرەی لە حوکمڕانێتی [ شێخ مەحمودی حەفیدا ] گێرایان ، ئەمانە هەمووی چاوەڕوانی غیرەت و هیمەتی دلسۆزانە بۆ لە چاپدانی ئەو بەرهەمە بەنرخەو چوونی بۆ بەردەستی خوێنەرانی ئازیزدەکەن .

**کۆچی دوایی شاعیر : ـ**
شاعیر لە ڕۆژی [ 25 — 4 — 1976 ] ی زایینیدا بە نەخۆشی شێرپەنجە ماڵئاوایی لە دنیای فانی دەکات و بە یەکجارەکی کاروانی ئەدەب و ژیان بە جێ دێڵێت و لەسەر قسەو ڕاسپاردەی خۆی لە گردی سەیوان بە تەنیشت مامۆستا مەلا حسێنی پسکەنی یەوە بە خاك دە سپێرێت .... ئیتر هەزار سلاوو خۆشەویستی بۆ گۆڕی هەموو پیاو چاکان و هەموو ئەو زاتانەی بۆ گەل و نیشتمان سووتاون ..

پەراوێزەکان : ـ
(1) — باوکی شاعیر ناوی شێخ خلیدمو کوڕی پووکی مەحوی بووە .. ئەم زانا بە ناوبانگە زۆر خۆشەویست و هاوڕێتی لەگەڵ زانایانی هاودەمی بووە .. بەتایبەتی لەگەڵ مامۆستایان مەلاحسێنی پسکەنی و شێخ بابا عەلیو شێخ عمری قەرەداغیدا ..
تایلۆی پەیوەندی یەکی بەهێزو گەرمو گوڕیشی لەگەڵ ( شێخ مەحمودی حەفیدا ) بووە .. ئەم زاتە بێ پەروا ڕوانیوێتی بە ژیان و قەلەندەرانە ژیاوە لە تەمەنی (86) ساڵیدا [1875 — 1961 ] گیانی بە خاك سپاردووەو لە خانەقای مەحوی بەتەنیشت باوکی یەوە نێژراوە .
(2) — مەلا ئەسعەدی مەحوی ، وێنەی باوکو باپیرانی بەتەریقەت نەقشبەندی بووە . بەلام لە جەوهەرو ناخدا هەرگیز بڕوای بەتەریقەت هیچ نەبوە .. زۆرجار لێم بیستوە : ـ زیاتر .. مرۆڤ خۆی و کردەوەی بلەسەی خۆی ..
(3) — ئەو سێ زاتە ، سێ کوچکەی عیلم و مەعریفەت و ئەدەبیات و ڕشتەی مرواری قسە زانی و قسە خۆشی بوون .. هەریەکە سەربەخۆ ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی پڕ لە هونەرو زانست بوون .. گەلێ فەقێ و سوختەیان پەروەردەو پێگەیاندوە .. کە ئێستا مەلاچاکی ناوچەکەن و خزمەتی مزگەوتان و ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن .

(4) — مزگەوتی خومخانە ، مزگەوتێکە دەکەوێتە لای شەقامی مەحوی‌و نیزیك مەیدانی کلو ماست فرۆشەکان .. سەرەتا شاعیر لەوێ دەبێتە مامۆستا .. بەلام دوا جار ئەو شوێنە بۆ ( مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە ) بەجێ دیلێت‌و لەبەر پیرو کەنەفتی بلوکی دەچێتەوە خانەقای خوێلن‌و لەوێ دەست دەکات بە پێش نوێژی‌و دەرس ووتنەوەی فەقێیان .. ئیتر لەو ڕۆژەوە خانەقا دەبێتە مەلبەندی بوێژو گوێندەو جێگای کۆڕو دانیشتن‌و جێگای هاتوو چۆکردنی زۆر لە کەلە پیاوانی کورد ... بۆ ئەو مەبەستەش بڕوانە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (319) سالی (1976) فرمێسك‌و یادو بیرەوەری لە نووسینی سۆران مەحوی .

(5) — لەو کەلە پیاوە مەزنانە کورد [ شێخ لەتیفی حەفید ] و [ شێخ لەتیفی دانساز ] و مامۆستا [ ئیسماعیل شاوەیس ] و چەندان کەسانی گەورە پیاوانی‌تر .

(6) — بڕوانە گۆڤاری کاروانی ژمارە (8) سالی (1983) شێخ لەتیفی حەفید لە نووسینی کاك ئۆرخانی غالب ئەوەتا خۆشی شاعیر لەو ڕوووەوە دەلێ : ـ

ـحوی ڕوخساری وەتەن (سەردەشتی) کردە مەسکەنم
ـغی سینەم بوو بە خالی لێوی غەم خوارانەوە ...
ـالەیی دل خۆشترە (ئەسعەد) لە نالەی سازونەی ،
ـێکە مەی سا بەنەشئەی بەزمەکەی جارانەوە ..
دیوانی ئەسعەد مەحوی ل (3)

(7) — بۆ ئەم مەبەستە تکایە بڕوانە دیوانی ئەسعەد مەحوی چاپخانەی ڕاپەڕین سالی 1970

(8) — لەم دوایی‌یەی ژیانی شاعیردا ، شاعیر لەلایە لەبەر پیری‌و بەسەری لەبەر ئەوەی گۆشەگیرو لاتەریك بوو بوو ، تەنانەت بە سالیش لە خانەقا نەدەچووە دەرەوە هەر خەریکی خوێندنەوەو ریازیات کردنی نەفس بوو .. خوا فرسەت‌و ئەجری دۆست‌و هاورێیانی بداتەوە کە بێیان لێ نەدەبڕی‌و لایان چۆل نەدەکرد ...

(9) — بڕوانە دیوانی دەست نووسی شاعیر ئەسعەد مەحوی .

(10) — لەدوکەی سینەدوێنێ نوێژی شێوان ،
ـمیانی دا سفیدی باغی سێوان ..
ـترسی تەلعەتت ڕۆژ هەر وەکو شێت ،
ـەڕوو زەردی هەلات‌و کەوتە کێوان
ـکۆتایی دەفەرموێ : ـ
ـەرابی لەعل ڕومانی لە نالی
حەرامە بێ‌مەزەی ماچێکی لیوان

دیوانی نالی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

(11) — دیوانی ئەسعەد مەحوی چاپخانەی ڕاپەڕین سالی 1970

(12) — ئەوەتا شاعیر مستەفا بەگی کوردی وا دەلێ : ـ

جانا وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت‌بم ،
ـۆ تیری قەزای چاوی حەسوودان سوپەرت‌بم ..

شادن لە تەماشای ئەزەرت مەحرەم‌و ئەغیار ،
مرووەت نی‌یە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم ..

تا لە کۆتایی‌دا دەلێ : ـ

ئەرخەشمە ، وەگەرلوتفە ، بە (کوردی) ئەزەرێکە ،
قوربانی غەزەب گرتن‌و گۆشەی ئەزەرت‌بم ..

(13) — دیوانی ئەسعەد مەحوی چاپخانەی ڕاپەڕین سالی

ـ مەحوی شاعیر دەلێ : ـ
بۆ پارە حەیفە خۆ دەکەیە پولی نارەواج
بۆ پارووێکی نان ، ئەسەفە ڕوو دەکەی بە ساج

یان مەحوی لە شعرێکی‌تردا دەلێ : ـ

تۆ نەبینن نووری ئەم چاوانە بۆچ ؛
بۆ نیشاری تۆ نەبێ ئەم جانە بۆچ ..

تا لە کۆتایی‌دا دەفەرموێ : ـ

مەحویا بارێکی تۆ ، قودس ئاشیان ،
بوونە بوومی ئەم ویرانە بۆچ ..

دیوانی مەحوی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

(15) — دیوانی ئەسعەد مەحوی چاپخانەی ڕاپەڕین سالی 1970

(16) — لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دلی من ،
هەر چەند ئەگەڕێم بێ سەرو شوێن ماوە دلی‌من ..
ئاخۆ بەچ شاخێکەوە گیرساوە دلی من ،
ئاخۆ بە چ داخێکەوە سووتاوە دلی من ..

تامامۆستا بێخود لەکۆتایی‌دا دەلێ : ـ

(بێخود) مەبە ئیتر بە ئومێدو بەتەمای ئەو ،
نایەتەوە لات ، گەر سەری داناوە دلی من
دیوانی بێخود سالی 1970 بەغداد لاپەرە 67

(17) — وەك من پێ‌بزانم هەندێ لەو یاداشتانەی شاعیر بۆ کارێکی پێویست‌و شیاو لە سالەکانی 1970 دا ، کەوتنە لای مامۆستای ئازیز ، پارێزەر (جمال عبدالقادر بابان) ، ئیتر نازانم مامۆستا سوودی لەو یاداشتانە لە نووسینەکانی‌دا وەرگرت یان نەء ..

(18) — بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە ڕۆژ نامەی ژینی ژمارە [ 85 , 86 ] ی سالی 1972 [ کۆمەلی برایەتی ] لە نووسینی مامۆستا کەریم زەندو .
هەروەها [ ناوەندە ئەدەبی‌یەکی ئالۆزو ژیانی ئەدەبی‌مان ] لە نووسینی سۆران مەحوی‌یە پاشکۆی عیراق ژمارەی [ 2 ] سالی 1977 .

ڕەخنە

# دوا بەدوای ڕوونکردنەوەیەک

ناصر یوسف

بەر لە هەموو شتێك ئەبێ سەرکەوتن بۆ «مەغدید حاجی» بسەلمێنین چونکە ناچاری کردم وەلامی ئەو نووسینەی بدەمەوە کە لەژێر ناونیشانی «ڕوونکردنەوەیەك» لە ژمارە 14ی گۆڤاری کاروان‌دا بلاوی کردوتەوە .

مەغدید حاجی لە ژمارە 14ی کاروان‌دا دەلێت :

چونکە بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە مرۆڤ ناچار بکرێ وەلامی ئەو کەسە باتەوە کە هەولی‌داوە دزی‌ی لێبکاو لەپاشان‌دا پێی نەکرێ یان بۆی نەڕەخسێ دزی‌یەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بسەلمێنێ .

[لە هاوینی سالی 1974دا ماموٚستا ناصر یوسف بە عەرەبی چیرۆکێکی لە ئەدەبی فۆلکلۆری سۆفیتی‌یەوە بۆ ڕۆژنامەی «طريق الشعب» ئامادە کردبوو ... ئەم ڕۆژنامەیەش گۆشەی مندالانی نەبوو ، چیرۆکەکەش بۆ مندالان دەشیا ، بۆیە بە نیازی بلاوکردنەوەی بۆ کوردی بە «بیری نوێ»ی سپارد ، بێ ئەوەی دەست نیشانی ناوی کەسێك بکات . ئا بەم جۆرە لە بەرواری 1974/9/15دا لە هەمان ڕۆژنامەدا بلاوکراوەتەوە] .

ئیتر ئاوا !

ئایا مەغدید حاجی چی دەلێت ئەگەر سەلمێندرا کە چیرۆکەکە لە ژمارە 299ی پێنج شەممەی ڕۆژی 1974.9.12دا لە هەمان ڕۆژنامەو لە لاپەڕەی مندالان‌دا بلاوکرابێتەوە ، واتە بەر لە بلاوکردنەوەی کوردی‌یەکەی بە سێ ڕۆژ هەر وەك مەغدید حاجی دەلێت !! .

مەغدید حاجی لەسەری دەڕوات و دەلێت

[وەکە چیرۆکەکە لە «بیری‌نوێ»دا لە ڕێکەوتی 1974/9/15دا بلاوکرایەوە .. دووای ئەمەش ماموٚستا ناصر یوسف هیچ گلەیی‌و ڕەخنەیەکی دەربارەی شێوەی بلاوکردنەوەی چیرۆکەکە نەبوو] .

منیش لە وەلام دانەوەدا دەلێم : «من نەمدەزانی لەکاتی خۆی‌دا لەو ڕۆژنامەیەدا بەکوردی بلاوکرایەوە چونکە ، یەکەم من کوردی ناخوێنمەوەو دووەم : نەشم دەزانی کە بۆ بیری‌نوێ ناردراوە ، سێیەم : جگە لەمەش ناوی کەسی لەسەر نەبووە . چووارەم : هەروەها بەهیچ جۆرێك لەو بڕوایەدا نەبووم کە لە شوێنێکی‌تردا بلاوبکرێتەوە دووای ئەوەی کە دەقە عەرەبی‌یەکەی لە ڕۆژی 1974/9/12دا بلاوکرایەوە . ئەمەو چۆن بزانم کە گەیشتۆتە «دەستی پاك»ی وەك دەستی مەغدید حاجی بۆ ئەوەی «بەسووپاسەوە» بیگۆڕی‌و بێ ئەوەی پەنجە رابکێشێ بۆ ناوی کەسێ . بەهەر جۆرێك بێت ، مەسەلەکە بەم شێوەیە دەستی پێ‌کرد :

لە وەرزی ڕۆشنبیری‌ی ڕابووردوودا مەغدید حاجی هات بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری‌و داوای لێمان کرد بڕیار لەسەر سازکردنی کۆڕێك بدەین دەربارەی فۆلکلۆری کوردی لە وەرزی ڕۆشنبیری‌دا . کاتێ خۆمان بۆ سازکردنی کۆڕەکە ئامادەکرد مەغدید حاجی داوای لێکردم ئەو سەرچاوەیەی کە چیرۆکەکەم بۆی ئامادە کردبوو ، بیدەمێ تا بیخاتە پال کتێبێك بە نیازی لەچاپدانی !! ، چونکە ئەو هەر وەکو خۆی ئاگاداری کردمەوە لە کاتی خۆی‌دا بۆ کوردی

مرحبا يا اطفال

حكاية النهر العظيم



ناصر يوسف

ـگۆڕیبووی‌و لە ساڵ 1974دا لە «بیری نوێ»دا بڵاوی کردوتەوەو ـخوی بە خاوەنی دەزانێ‌و ماف ئەوەی هەیە لە کتێبەکـەیدا ـڵاوی بکاتەوە ، بێ ئەوەی دەستنیشانی ناووم بکات چ جورە ـووسەرێك بمویان چ ئامادەکەر یان وەرگێڕی بۆ زمانی عەرەبی ـە زمانێکی بێگانەدا . منیش پێم ڕاگەیاند چیرۆکەکە لە کاتی ـخویدا لەو ڕۆژنامەیـەدا بەعـەرەبی لە گۆشـەی منداڵاندا ـڵاوکرایەتەوەو ناوی منی لەسـەرەو چۆن ڕێگـای بە خـۆیدا ـبگۆڕیتە سەر کوردی‌و لە ڕۆژنـامەی تـردا بڵاوی بکـاتەوەو ـەولیش بدات بیخاتە پاڵ لاپەرەکانی کتێبێك ؟ .

بەسەر سورمانێکەوە داوای لێکردم ڕۆژنـامەکـەی پێ ـیشاندەم کە بە زمانی عەرەبی بڵاوی کردوتــەوە . بەڵام من ـڕێگام پێ نەدا نەك هەر ئەمە بەڵکو گلەییشم لێکـرد ، چونکـە ـکـارێکی وای کرد کـە لەگەڵ ڕەوشتی ڕاستگۆیی ئەدەبیدا ـەگونجێت . کەخۆیشی زۆر پێی لەسەر دادەگرت .

دووای تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك ، جارێکیتر مەغـدید حـاجی بۆ لام هـاتو داوای ئەو ڕۆژنـامەیـەی لێکـردم کـە چیرۆکەکە تیایـدا بە زمـانی عەرەبی بـڵاوکرایـتـەوە . منیش ـڕۆژنامەکەم نەدایەو ، ئەویش کەوتە دوودڵی : ئایا چیرۆکەکەی ـخاتە ناو کتێبەکەی دووای ئەوەی کە لە عەرەبییەوە بۆ کوردی گـۆڕیوەو لە ڕۆژنـامـەکـەدا بـڵاوی کـردوتـەوە بێ ئـەوەی ـووسەرەکەی یا خـود ئامـادەکەرەکـەی یا وەرگێـڕەکەی لە ـزمانێکی بیانیدا بێت ؟ . چۆن دەبێ بەعەرەبی بڵاوکرابێتەوە وەك ناصر یوسف دەڵێ ؟ . ئەمیش ناوی خۆی پێوەیە .. ئەوە کارەساتە وازی لێبێنێ‌و ئەو لاپەڕانەی لە کتێبـەکەیـدا بۆی تەرخانکراوە بە سپی بمێنێتەوە ؟ . بەڵام ئەو بە تەواوی لێی حاڵی نەبووە ، بۆیە بڕیاریدا چاوەڕوانی بێت .. و ... هتـد .

هەر کە ژمارە (9)ی کاروان دەرچوو ، ئەو ژمارەیەی بۆ شانۆ تەرخان کرابوو ، شانۆگەریی «دارستانی تینووی» تیایدا خوێندەوە کە صبـاح عبدالرحمن لە چیرۆکی «ناصر یوسف» وە ئامادەی کردبوو .. ئەو کاتە بە تەواوی بۆی ڕوون بۆوە کە ئەو لاپەڕانەی بۆ چیرۆکەکەی لە کتێبەکەیدا تەرخان کرابوو بە سپی دەمێنێتەوە ، سەرەڕای ئەمەش چیرۆکەکە کرا بە شانۆگەریی‌و ناوی صباح عبدالرحمن خرایە پاڵی .

ئا .. بۆیە بڕیاریدا بنووسێ .. ئەو نووسینەی کە لە ژمارە (14)ی کارواندا بڵاوکرایەوە دووای ئەوەی کە چیرۆکەکەی وونکردو نـەیتوانی مـاف ڕەوا بۆ دزینـەکەی بـدۆزێتـەوەو بـۆ خـۆی بچەسپێنێ .

زیاتر درێژەی پێنادەم ، چونکە ئەوەی مەغدید حاجی دەربارەی داوایەکانی صباح عبـدالرحمن خستویـەتە ڕوو لە کاتی خۆیدا نەبوو لەبەر ئەوەی من لێرەدا دووبارەی ناکەمەوە ئەوەی کە لە پێشوودا ڕوونم کردەوەو تەنها چیرۆکەکە دووبارە بڵاو دەکەمەوە هەروەك چۆن ڕۆژنامەکە بڵاوی کردەوە ، وەك وەڵامێك بۆ هەمووشتێك .

**تێبینی**

**کاك ناصر یوسف ئەم وەرامـەی خۆی بـە عەرەبی نووسیبوو . بەڵام لەبەر ئەوەی نووسینەکەی کاك مغدید حاجی بە کوردی بوو ، بە پێویستمان زانی وەرامەکەش بە کوردی بێ .**

**«کاروان»**

# سەرنجدانێكی پیاچوونەوەكەی كاك عوسمان هەورامی بە بەرگی دووەمی «كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردی» دا

محەمەدعەلی قەرەداغی

**لە ژمارە** (12) ی گۆڤاری (كاروان) دا كاك عوسمان هەورامی وتارێكی لەسەر بەرگی دوەمی كەشكۆڵی كەلەپووری ئەدەبی كوردی نووسیبوو ، لە وتارەكەیدا هەوڵی داوە هەندێ جێگەی كەشكۆڵەكە ـ كە ئەو بە هەڵەی زانیون ـ راستیان بكاتەوە .

**پێشەكی** : ـ سوپاسی كاك عوسمان دەكەم لەسەر پێداچوونەوەی كەشكۆڵەكەو ئەو خۆماندووكردنەی كە لەگەڵ بەرهەمەكەی مندا كردوویەو ، ئەو هەوڵە دڵسۆزانەیەی كە داوی‌یەتی . لەبەر ئەوەی كە هەموو هەر مەبەستمان خزمەتی ئەدەبی كوردی‌و دۆزینەوەو بووژاندنەوەی سامانی نەتەوایەتی‌یە .. بە پێویستم زانی ـ بە كورتی ـ چەند تیشكێك ئاراستەی سەرنجەكانی كاك عوسمان بكەم .

كاك عوسمان لە سەرەتاوە داوای ئەوەی كردوە ( رەنج‌و ئەركی پسپۆڕانی ئەم بوارە یەك‌كەوێ ... ) منیش دەڵێم : ئەمە زۆر راست‌و تەواوە ئەگەر ئەم كارە لەتوانادا بێت . بەڵام كەی ؟ ئێمەیەك كە هێشتا بەشێكی زۆری سامانەكەمان ـ ئەوەی لە چنگ لەناوچوون رزگار بووبێت ـ لای ئەم‌و ئەو وەك ( ئەسپێی مشتی كوێر كەوتوو ) دەستی پێدادەگیرێت‌و بە ئامان‌و زەمانیش لە مشتیان دەرنایەت‌و ، با لێی نادات‌و رۆشنایی نابینێت . من لە عاستی خۆمەوە زۆر دەمێكە هەستم بەم كارە كردوەو گەلێ هەوڵم داوەو ، وتارم نووسیوەو ، داوام لەم‌و لەو كردوە . بۆ نموونە پاش گەلێ سووڕانەوەو داواكردن‌و كۆششی بێ ئەنجام وتاری ( بۆ ئەبێ كەشكۆڵی شاعیرانی كورد لە زیندانی سنووقە كۆنەكان دەرنەچێ ؟ ) ـ هاوكاری ، ژمارە 312 1976 / 4 / 8 ـ م نووسی . دوای ئەمەیش كاتی وا هەبوە زانیومە بەرهەمی شاعیرێك لای یەكێك دەست‌دەكەوێت‌و ، منیش خەریكی لێكۆڵینەوەی بەرهەمی ئەو شاعیرەم ، هاتووم دوای گەلێ داواكردنی بێ ئەنجام بە رۆژنامە ناوی ئەو كەسەم بردوەو داوام لێ كردوە ، بەڵام دیسان هیچ‌و بە رۆژنامە وەڵام

-راوەوتەوە کە شتی وا نی‌یە[1] ! دوابیش هەر لای ئەو کەسەوە ئەو بەرهەمە سەری هەڵداوە . خۆ بانگەوازکردنم بۆ داوای یارمەتی لەم ولەم لەم بوارەدا لە دوان‌و سیان بەدەرە[2] ، بەلام بلێ : کەس بە دەنگمەوە هاتوە ؟ بەداخەوە زۆر کەم .

منیش لە عاستی خۆمەوە کە هەست بە راستیی ئەم رایە -ەکەم دەرگای کتێبخانە بچکۆلانەکەی خۆم ئاواڵەکردوە بو هەرکەسێك کاری پێم‌کەوتبێ‌و ، دریغیم لە یارمەتیدانی کەس نەکردوە . تەنانەت جاری وا هەبوە زانیومە نووسەرێك خەریکی ێکۆڵینەوەی بەرهەمی شاعیرێکەو شتێکیش لە بەرهەمی ئەو شاعیرە لای من هەیە لەوانەیە یارمەتی ئەو لێکۆڵەرەوە بدات ، هەستاوم - بێ ئەوەی ئەو کەسە خۆی بزانێت ، یان داوام لێ بکات - دەسخەتەکە ، یان وێنەی ئەو ئەندازەی کاری ئەو مەیسەر دەکات .. بۆم داوەتە بن‌هەنگڵم‌و بۆم بردوە . هەروەها لە شارەزایی‌کردن‌و رێگەپیشاندانی نووسەراندا بۆ لای دەسخەت‌و سەرچاوە دریغیم نەکردوەو ، چەندین کەس شایەتی ئەم کارانەن .

بەلام یەکخستنی رەنج‌و کار زۆری دەوێت‌و بە یەك کەس‌و دووکەس ناگاتە ئەنجام‌و ، ئێمەیش هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە ئەو قۆناغەو ، ئەوەی بۆ ئیمە لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە تا بتوانین زۆرتر کۆبکەینەوەو ، تا پێمان بکرێت زیاتر بلاوبکەینەوە چونکە گەلێ دەردو بەلا هەرەشەی لەناوبردن لەم سامانە دەکەن‌و ، لەوانەیە چاوەروانکردنی یەکخستنی رەنج‌و ئەرك‌و ، گەران بە دوای هەلی لەبارتردا فرە شتی بەبایەخمان لە کیس بدات . لەگەڵ ئەمانەدا ئەبێ ئەوە لەیاد نەکەین کە دەبێ بە وردی‌و ، بێ پەلەو ، لەسەرخۆ هەنگاو بنێین‌و ، بەرهەمی بەپێزو بوخت‌و - بەگوێرەی توانا - بێ‌هەڵە پێشکەش بکەین .

کاك عوسمان لە شوێنێکی دیکەی سەرەتای وتارەکەیدا دەڵێت : ( منیش لەم بوارەدا ئەزموونێکی زۆرو تایبەتیم هەیەو ... ) جا لەبەر ئەوەی ئەم ئەزموونە تا زۆر بێت کەمەو ، ئەم مەیدانە بەرینەیش سوارچاکی لێهاتووی دەوێت ، بە کاك‌عوسمان ئەڵێم : دەبێ ئەوە بزانین ئێمە لە خۆمانەوە نەچووینەتە ناو ئەم مەیدانەو ، یەکەم کەس نین دەستمان دابێتە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی سامانی نەتەوایەتی . بەڵکو زۆر پێش بیرکردنەوەی ئێمە دەیان‌و بگرە سەدان کەس رەنجی فرەو فراوانیان لەم رێگەدا داوەو ، شەونخوونی زۆریان کێشاوەو ، سەدان بەرهەمی نایابیان بە لێکۆڵینەوەی راست‌و پوختەوە پێشکەشی کتێبخانەکانی جیهان کردوە .

جا ئێمەیەك کە تازە بە گاگوڵکێوە ئەم رێگەمان گرتوەتە بەر با چاوێك بە رێگەی ئەواندا بگێرین‌و ، بزانین ئەوان چۆن ئەم مەیدانەیان بریوە ، تا خۆمان لەو کۆسپ‌و نشێوو تەکەزمانە رزگار بکەین لە ئەوان بەسەریاندا تێپەریون .

لە بن‌دەستمانەوە گەلی عەرەبی براو دراوسێمان بە خۆیان‌و بە موسوڵمانانی جیهان‌و ، رۆژهەلاتناسانەوە رەنجی بێ‌ئەندازەیان لەم بوارەدا داوەو ، ئەنجامی گەلێك لەو رەنج‌و ماندووبوونەیان بۆ هاوچەرخان‌و چینانی داهاتوو تۆمارکردوەو کاکڵەی ئەو ئەرك‌و گەران‌و پشکنینەیان کردوە بە کتێب‌و لەبەردەستدایە . بۆیە زۆر پێویستە بۆ هەرکەسێ کە بیەوێت بەم رێگەدا بروات‌و ، بە هیوای ئەوە بێت ئەو مەیدانە ببرێت بێ شارەزایی باش لەو کتێبانەی ئەو کاکلانەیان گرتوەتە خۆیان هەنگاو نەنێت‌و پێ‌هەڵنەگرێت ؛ چونکە رێبواری نەشارەزاو بێ‌چاوساغ تووشی گەلێ ماندوێتی دەبێت‌و ، رێگەی دەکەوێتە گەلێ هەڵەت‌و هەڵدێرو ، زۆر چورتم ئەبات‌و لەوانەیە خراپیش بگلێت .

یەکێك لەو راستیانەی کە زاناو لێکۆڵەرەوان پێیگەییشتوون‌و چەسپاندوویانە ئەوەیە : لێکۆڵەرەوە نابێ بە هیچ جۆرێك دەسکاری دەقی ئەو کتێبە بکات کە خەریکی لێکۆڵینەوەیەتی . تەنانەت ئەگەر ئایەتێك لە قورئان لە ناو دەقەدەکەدا بە هەڵە تۆمارکرابێ زۆر بە پارێزەوە دەستی بو دەبەن‌و لە پەراوێزەوە باسی ئەو دەسکاری‌کردنە دەکەن : چونکە لێکۆڵەرەوە بە هیچ شێوەیەك مافی ئەوەی نی‌یە شتی دانەری کتێبەکە بگۆرێت‌و ، قەڵەم بەرێتە ناو کتێبەکە .

کاك عوسمان وەك لەم خاڵە شارەزا نەبێت ، یان بروای بەم خاڵە کز بێت وایە ؛ چونکە بەشی هەرەزۆری سەرنجەکانی بریتی‌یە لەوە کە دەڵێ (دەبێ وابێ) یان (ئەمە راستی‌یەکەیەتی) یان (ئەبێ بەم چەشنە بێ) ... ئەمەیش وای کردوە کاك عوسمان رێگەی لێ‌هەڵە بووبێ .

هەر لە یەکەم سەرنجدا دەڵێ : (مالم) و (هیلالم) ئەبوایە ئیشارەتی راستکردنەوەی بەم چەشنە بکرایە : بێ ملك‌و (مالی) عیشقم ئەز ... قامەت (هیلالی) عیشقم ئەز . نازانم بە چ

شێوەیەك ئەم راستی یەی دۆزیوەتەوە ؟ من دەقی دەسخەتێکی کۆنم لەبەردەستدایەو، لەویم وەرگرتوە . ئەگەر کاك عوسمان ـ بەوردی ـ سەرتاسەری ئەو شیعرانەی بخوێندایەتەوە دەیبینی تا کۆتایی شیعرەکانی (کاریزی) و[*] ئەحمەدی کۆر (15) جار ئەو شێوە ( .. الم ) لە سەرهۆی شیعرەکاندا دووپات بوەتەوە . ئەو کاتە بڕوا ناکەم کاك عوسمان پرکێشی ئەوەی بکردایــە کە بڵێت : پازدە جار ئەم سەرهۆ بە هەڵە بە ( ... الم ) نووسراوەو راستی وایە ( ... الی ) بنووسرێت .

ئەگەر کاك عوسمان بهاتایە لە باتی بەکاربردنی رێگــەی بیرو قەڵەم وەکارخستن پشتی بەو دەسخەتانەی بەردەستی خۆی ، وەك دەسخــەتــەکــانی مــامــۆستــای خــاڵو ، مــام رەشیــد هــەمــەوەنــد .. و ببــەستــایــەو دەسخــەتــەکــانی لەگــەڵ کەشکۆڵەکەدا بەراورد بکردایە سواڵەیەکی باشی دەخستە سەر خەرمانی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ، بەلام بە بۆنەی ئەوەوە نووسەر رێگەی بە بیــری خۆی داوەوە پشتی بــە لێکدانــەوە بەستوەو ، دەستی ـ بێ پشتبەستن بە رێبازی لێکۆڵینەوە ـ خستوەتە دەقەکانو ، بێبەڵگە حوکمی بەســەر شیعرەکــاندا داوە .. لە زۆر جێگــەدا خۆی خستــوەتە بــواری وەهاوە کــە پەڕینەوەی ئاسان نی یە .

لێرەدا چەند نموونەیەك دەهێنینەوە :

1 ـ (کەرد بۆش) کاك عوسمان دەڵێ : « ئەبێ بنووسرێ [ کەرد بــوەش ] لە واتای بــۆنیکرد ... » . ئــەوەی لە هــەمــوو دەقەکانی شێوەی گۆرانیدا نووسراوە ئەوەیە (بۆ) بە مانا بۆنە ، نەك (بوە) . مەولەوی ئەمر دەڵێ :

گێج سەرکاوان چە سەردی بین کەیل

(بۆ) مدان چون (بۆ) ی بێ وەفایی لەیل (4)

کاك عوسمان خۆیشی لە دیوانی (وەلی دیوانە) دا لە لێکدانەوەی وشەی (بۆ) دا دەڵێت :

بۆ : وەرە ، [ بۆن ] ، ببێ . (5)

2 ـ یان لە ل : 60 دێڕ 6 دا دەڵێت : ( وەس شۆ [ تەفەککور ] ئینتیــظاری بــەی ) راستی وشــەی (تــەفــەککــور) بــەم چــەشنەیــە (تەفیکــر) ـ دیارە ئــەمەیــان هــەڵەی چــاپی گۆڤارەکەیەو کاك عوسمان مەبەستی (تەفکیر) ە . بەلام کە (تفکر) و (تفکیر) هەردوکیان مەصد هر بنو هەمان مانا بە دەستەوە بدەنو ، (تفکر) یش بۆ کێشی شیعرەکە لەبارتر بێت بۆ دەبێت ئەمەیان هەڵە بێتو ئەویان راست بێت ؟

3 ـ یان هەر لە هەمان لاپەڕەدا دێڕی (8) ( مەر قاتر (بزای)[*] کێکف بگــرێ بەر ) دەڵێت ( وشــەی بزای واتــا نادا بــە دەستەوە ... ) بەلام (بزای) مانــا بە دەستــەوە دەداتو مانای (بزێ) یەو ، زایینو بەچکــەبوون بــۆ قاتــر شتێکی روونەداوو ، نەبوەو ، وەك (موستەحیل) وایــەو ، شاعــیر دەیەوێ بڵێت : مەگەر قاتر بزێ ـ کە نازێت ـ یان کێکف بەربگرێت ـ کە بەر ناگرێت ـ ئەوسا ئەو شتە روو بدات . ( کوڵەگاو) یش بۆ دەبێ بکرێت بە (کەڵەگاو) ؟ بۆ نابێ شاعیر مەبەستی ئەسپێك یــان حەیــوانێکی تایبــەتیو ناســراوو دیاریی لای خۆیان بووبێت ؟

4 ـ کاك عوسمان لە عاستی لاپەڕە (230) دا هەندێك وەستاوەو ، چەند جێگەی بە هەڵە زانیوەو ، بــە بیری خــۆی راستی کردوونەتەوە .

دەڵێت : لە دێڕی یەکــەمدا (ئــامای) و (جــامەی) هەڵەنو ، دەبێت (نامای) و (جامە) بنووسرێت . ئەمە زیاد لەوەی کە دەسخەتەکەی لای من ئاوایە (ئامای) لە دێڕی دوەمیشدا بە هەمان شێوە دووپات بــوەتەوە ، ئــەمەیش راستی دێڕی یەکەم دەسەلمێنێ .

دەربارەی دێڕی شەشەمیش دەڵێت : ( مکێشیو ) ئەبێ (مەکێشەش) بێت بە واتای رای مەکێشە . بەلام من بێسێو دوو دەڵێم : ـ لەگەڵ داوای لێبوردنی ئەوەدا کە کاك عوسمان دەڵێ : شێوەی گۆرانی شێوە زاری زگماکی خۆمە ـ (مکێشیو) راستەو هیچ پەردەو تاریکییەك بەسەر مــاناکــەوە نی یە ؛ چــونکە شــاعــیر دەڵێت : ئــەوەی تــۆ

رای‌دەکێشی ڕێسمان‌و دەزوو نی‌یەو ، ڕیشەی گیانەو ، تۆبە گاز گرتووتەو ؛ چونکە گیری قولاپی گازی تۆ بوە (مکێشی‌و میۆ مەداراش نییەن ) چاری ناچارە تۆ دەیکێشی‌و ئەویش دێت بەدەستتەوە .

ئەو بەیتەیش کە دەڵێت :
نە ڕێسمانەن ....
ڕیشەی گیانمەن ...
ئەمەیش وە نەبێ لە کەشکۆڵەکەدا نەبێت ، بەڵکو ئەمە بەیتی دووهەمەو تۆزێك ڕواڵەتی گۆڕاوە .

بەم دوو سێ خاڵە دەست لە ڕاستکردنەوەی ڕاستکراوە هەڵدەگرمو ، ئەوەندە دەڵێم : چونکە کاك عوسمان سەرنجەکانی لە ڕوانگەی پشت‌بەستن بە بیرو لێکدانەوەی خۆیەوە نووسیوە .. زۆربەی سەرنجەکانی دەچنە خانەی ( دەستتێوەردانی دەقی شیعرەکان ) ەوە ، کە ئەمەیش لە گیانی خۆیدا - بەپێی ڕێبازی لێکۆڵینەوە - کارێکی نادروست‌و نارەوایەو ، ناشێ بۆ کەسێك کە بیەوێ ئەمانەت بپارێزێت کاری وا بکات . زیاد لەوەیش لە سەرەتای هەردوو بەرگەکەوە ئەوەم ڕوون‌کردوەتەوە کە ئەم کارەی من وەك دەرەوو ماشینەوە وایەو ، کاتی کەوو بێژنگ‌و خەرمان‌هەڵگرتن لە دواوەیە .

شەنکردنی ئەم کارە دەبێت لەبەر بای شەماڵی نوسخەی ڕاست‌و پوخت‌و باوەڕپێکراوداو ، لەسەر ملەی بەرزی بەرشەماڵی ئەمانەت‌و شارەزایی‌و بیندرێژیی بێت . کاتێکیش ئەم کەرەسانە دەستکەوتن دەبێ ئەو کەسەی ئەم کارە دەگرێتە ئەستۆی خۆی بە گیانێکی بێ لایەنی‌و ، لەگەڵ ڕاستیدا بوون‌و ... ڕێگە بگرێتەبەرو ، بیر لە کات‌و ماندووبوون‌و شەونخوونی نەکاتەوە . جا هەرکاتێ کارێکی وا ئەنجام درا ئەوە زیادکردن‌و دەسەبارەخستنە سەر خەرمانی کەلەپوورە .
وەك پێشتر وتم کاك عوسمان کە نوسخەکانی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ‌و ، مام ڕەشید هەمەوەندی لەبەردەستدا بوە کەرەسەی هەندێ بابەتی باشی بۆ ڕەخساوە بەڵام لێرەیشدا نابێ لە هەموو ڕوویەکەوە نوسخەکانی لای خۆی بە چاکتر بزانێ‌و ، هەرچی لەواندا بوو بە بڕیاری بێ سێودوو بە ڕاستیان دابنێ‌و ،.کاری زەلامەکەی دیکە بداتە دواوە . ئەگەر بهاتایە جیاوازی نوسخەکانی لای خۆی لەگەڵ کەشکۆڵەکەدا بەراورد بکردایەو ، بە شێوەیەکی زانستی‌یانە تۆماری بکردایەن‌و ، ئەنجامەکەی بدایەتە دەست خوێنەران‌و مێژووی ئەدەب کارەکەی گەلێ بەپێزتر دەبوو .

ئەم باسە گەلێ دەمەتەقێ هەڵدەگرێت ، بەڵام نامەوێ لەمە زیاتری لەسەر بڕۆم ، ئەوەندە نەبێ کە دوو خاڵی دیکە ڕوون بکەمەوە :

1 - کاك عوسمان لە چەند جێگایەکدا دەڵێت : ئەمە واتا نابەخشێ ، یان مانا نادا بەدەستەوەو ، لە پەراوێزیشەوە هیچ ئاماژەی بۆ نەکراوە . وەك لە لاپەڕە (59) دێڕی یەك‌و سێ‌و چواردا ئەمە دەڵێت .
لە سەرەتای کتێبەکەوە بۆ ڕێگەکورتکردنەوە یەك جار نووسیومە . « ئەو جێگەی بۆم ساخ‌نەکراوەتەوە یان جێگەکەم لەناو دوو کەوانەدا نووسیوەو ئەداتی (!) سەرسوڕمانم لە دوایەوە داناوە . یان هەر نوختەم داناوە . »
جا ئەوانەی لە هەردوو بەرگەکەدا بەو جۆرەن‌و ، ئەگەر خودا یارمەتی دا بەرگی دیکەیش بە دوایان هات ، هەر شوێنێك بەم شێوە بوو [ .... ... ! ] ئەوە بۆم ساخ نەکراوەتەوە . .

2 - دەربارەی باسەکەی عەبدوڵلاحەسەن‌و شیعرەکانی ، بەڵێ من هەر ئەوەندەم دەستکەوتوە کە بڵاوم کردوەتەوە . دەربارەی ئەوەیش کە ئەو شیعرانە ( بۆ سەردەمی ئێمرۆی کوردەواری ناشێن‌و دەبنە هۆی دڵگیری ) وەڵامم هەمان وەڵامە کە لە سەرەتای ئەو شیعرانەوە نووسیومەو ، مەبەست لە نووسینیان ئەوە نی‌یە کە بکرێن بە بەیت‌و باوو لە هەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا بخوێنرێنەوە ، بەڵکو تەنها

مەبەست تۆمارکردن و زیندووکردنەوەیەو بەس . ئەگەر بەو پێودانەی کاك عوسمان سەیری شیعر بکەین دەبێ دیوانی شێخ رەزایش ـ لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بە ئاگاداریی من دوو سێ کەس ، هەر کەسەو بۆ خۆی ، خەریکی لێکۆڵینەوەو لەسەرنووسینین ـ بۆ چاپکردن نەشێ . جا ئەگەر هەر بەو چاوەیش سەیری بەرهەمی شاعیرانی جیهان بکەین کە دەیان بابەتی وەك ئەو شیعرانەی ئێمەیان لە خوێندنگاو زانکۆ بالاکاندا بە لێکۆڵینەوەوە دەخوێندرێن دەبێ چی بڵێین ؟ دەربارەی شیعرەکەی مەڕ کابرای ئەفسەریش لە دەسخەتێکی مامۆستا نەجمەدین مەلام وەرگرتوون و پەیوەندیشیان بە (سیواستەپۆل) ەوە پەیوەندی لاقرتێکردن بە کابرای مەڕخاتوون یەکسمە . دیارە (سیواستەپۆل) یش جێگەی شەڕو پێکدادان بوەو بە ئاسانی دەستی بەسەردا نەگیراوە . وا دیارە ـ وەك لە دەنگی گێتی تازەدا دەڵێت ـ لە مانگی مایسی ساڵی 1944 دا گیراوە .

**سەرچاوەو پەراوێزەکان :**

(1) بۆ نموونە بڕوانە : هاوکاری ، ژمارە : 415 ، 27 / 2 / 1978 . هەروەها : هاوکاری ، ژمارە : 421 ، 10 / نیسانی 1978 .

(2) بۆ نموونە بڕوانە : هاوکاری ، ژمارە 449 ، 20 / 11 / 1978 .

(3) لێرەدا کە ناوی (کارێزی) م برد بە پێویستی دەزانم یەك دوو زانیاری تازە دەربارەی (کارێزی) لەم یەکەم دەرفەتەدا تۆمار بکەم .

ا ـ کارێزی ناوی (یوسف) ە .

ب ـ رەنجووری لە دەسخەتێکی خۆیدا ناوی هەندێ لە ناوداران و کۆچی دواییانی نووسیوە لەوانە ناوی (کارێزی) یە کە دەڵێت : لە ساڵی 1196 کۆچیدا لەجیهان دەرچوە .

(4) بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەوی ، تیبی (ف) پارچەی (2) .

(5) بڕوانە : عوسمان هەورامی ، ژیان و بەسەرهات و هۆنراوەی وەلی دێوانە ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، 1976 ، ل : 97

(6) بریا کاك عوسمان سەرنجێکی ژمارە (49) ی ئاداری 1983 ی پاشکۆی عیراقی بدایەت و ، وتارەکەی کاك (عبدالستار کاظم) ی بخوێندایەتەوە !




■محسن عثمان عبدالله■

... یاکو ئەز دزانم پاراستن و بشافتنا پەیڤێت کوردی ژپەیڤێت بیاني ژ فەرانە ...

چونکی شەنگستێت هەر زمانەکێ هەبن پیتن پاشی پەیڤن ، لێ مخابن ئەم ژ پێتاڤە دلاوازین ،بەلێ ژ پەیڤاڤە ئەم دەولەمەندین بەلێ ب مهانەکێ ئەم لدویف پەیڤێیت خو بچین و جودا کەین ژ پەیڤێت بیانی ...(مگرتي) ئەم گەلەك جارا پەیڤا بکار دئینین ئو ئەو پەیڤ بیانيیە وەکی (هەوڵ) ئەو بخو (حول ، حاول ، محاوله ) چونکی (ح) یا بویە (ە) وەکی (حديقة = هەدیقە) ، پەیڤا درست دانینە جهێ (هەول) (پێکول)ە...

ژبلی ڤان پەیڤا هندەك پەیڤێت دی هەنە بوینە هەڤکورێت پەیڤێت عەرەبي ژبەر ڤێ چەندێ من ئەڤ چەند پەیڤێت ژێ گرتین (هەلبژارتین) و مەبەستا من ئەوە ئەڤ هەردو پەیڤە ئێك رامانن ... وەکی

1) فەرق و جودایی: (فەرق و جودا )

ئەم گەلەك جارا دبێژین تۆ مرۆڤەکێ ب فەرق و جودایی ، یان ژي دێ بێژن ئەڤ تشتە ژویێ جودایە ،ئەم دشێین بەس

جودا بكار بنين ...هتد.

2) عه ڤ و ئازا:

گەلەك جارا دێ بێژن بێڤان كەس مر ، دێ بێژن خودێ عەڤو ئازا بكەت (ئەم دشێین بێژین خودا ئازا كەت بەلێ هندێت بو ینه

هەڤگور ژێن جودا نابن ئـەم ژی دسەر هنـدێرا بویتـه پێ ناكەین )...هتد.

3) كەفیل و دەمان:

هندەك جارا ئێك دێ بێژتە ئێكی ب كەفیل و دەمان ئەز دێ بوتە ڤی كاری كەم ، دیسا ئەم دشێن بێژین ئەڤێ چەمی بدەڤ من ب دەمان ...هتد.

4) پیروز و مبارەك :

هندەك جارا ئەم دێ بێژین (عەیدە هەوە پیروز بیت دێ بێژن وەی هەمی عەید ل هەوە پیروز و مبارەك بن)... ئانژی ئێكی تشتەكێ جوان هەبیت دێ برادەرێ بێژتێ

- ئەرێ تو وی تشتی نادەیە من ؟

- فەرمو بگرە

- من سوحبەت دكر تە سەد جارا پیروز و مبارەك بیت ...هتد

5) حەبس و زیندان : ( حەفس و زیندان )

گەلەك جارا هەڤال دێ بێژ تە هەڤالی تو خو دبێژی خانیێ هەوە ( حەفس و زیندانە )...هتد

6) فلان و بێڤان :

هندەك جارا دێ بێژن فلان كەس كورێ فلان كەسێ ئان بێڤان كەس كورێ بێڤان كەسێ ، ئان ژی دێ بێژن فلان و بێڤان پێ نەڤێت ...هتد

7) عەشق و ئەڤین :

ئێك دێ بێژیت ئەز ژعەشق و ئەڤینێت ڤێ كەچێ دا دین و هار بوم ...هتد

8) شین و تازی : (شین و تعزیە )

هندەك جارا دێ بێژن ڤێ مالێ شین و تازیە ، ئانـژی وەكی دبێژن (شین و تازی یا شەهیدان ...هتد)

9) هیڤی و رجا :

( هەرچە ندە هیڤی گەلەك رامانا د دەت لێ دڤێـرە دا رامان ئەڤەیە ) ئێك دێ بێژتە ئێكێ من هیڤی و رجا هەیە تو ڤێ جارێ ژی نەچە ...

ئانژی من هیڤی و رجا ژ تە هەیە تو ئەڤ سالە گەلەك بخوینە .... هتد

10) حەیف و مخابن :

دێ بێژن حەیف و مخابن بێڤان كەس هاتە كوشتن ئانژی دێ بێژن حەیف و مخابن تو ئەڤ گەنجە و تویێ ب كێر نەهاتی... هتد

11) كەرب و كین:

ئێك دێ بێژتە ئێكی ژكەرب و كینێت تەدا من وەكر و تـو چ دكەی بكە....هتد

12) گەه و دوور :

ئەڤ پەیڤە بو (سرا) دئێتە بكار ئینان ، ئانژی لسەر كانیـا دەمێ ژنك دبێژنە ئێكو دو داییێ گەها منە ... هەرێ ما ئەڤە هەمی تشت ب گەه و دورن ... هتد.

13) تا و تبعەت : (تاو طبیعەت):

هەر چەندە (تا) ل ڤێرە رامانا وێ یا جودایە ژ رامانێت دی ..

دێ ئێك بێژ تە مروڤەكێ خو :

هەكو تە هەر ژن دئینـا دا ئێكا ل دویف تـا و تبعەتێت خـو ئینی.... هتد

14) ساخ و سلامەت :

هندەك جارا دەمێ مـروڤ دچیتە مـالەكێ دبێژتێ : هـوین دچاوانن ساخن و سلامە تن ...

ئانژی دێ بێژن خوزی ڤێ جارێ تو بساخ و سلامەت هاتبایە ناڤ بچویكێت خو ...هتد

15) خویك و خەراج :

د چیروكاوا ئەڤ پەیڤەنە دئێنە بكار ئینان ،

وەكی هندەك جارا دێ بێژن بێڤان (قرالی) خویك و خەراجێت حەفت سالا ژ بێڤان كەسا ستاندن ...هتد

16) سر و سەقەم :

گەلەك جارا دێ بێژن ئەڤ سالە زڤستانا چیا ب سر و سەقەمە ...هتد

17) چام و عیبرەت :

گەلەك جارا ئێك دێ بێژ تە ئێكی ئەز دێ ڤی كاری كەم بو چام و عیبرەت دا كەسەكێ دی وە نەكەت ...هتد

# پیت یا دەنگ

عبدالخالق احمد عزیز

نابێت هەرگیزاو هەرگیز پیت و دەنگ تێکەڵ بەیەکتر بکەین و لە یەکتریان جیانەکەینەوە . گرینگترین و ئاشکراترین جیاوازی لەنێوانیاندا ئەمەیە کەپیت دەنووسرێ و دەبینرێ ، هەرچی دەنگە دەگوترێ وەبەهۆی گوێوە دەبیسترێ . بەلام پیت ئەو نیشانەیە کە لەبریتی دەنگ داندراوە وەلە (مێشکدا نوێنەرایەتی دەنگێك دەکات)[1] شێوەی ئەو دەنگە وەیا نزیك لەو دەنگە لەمێشکدا پەیدا دەکات .

(ئەگەر ئێمە زۆر بەباشی لەپیت وورد ببینەوە دەبینین ، هەر پیتە ناوێکی تایبەتی هەیە وەناوەکەشی پێك هاتووە لە زیاتر لە دەنگێك)[2] ؛ کەوابوو پیت بچوکترین یەکەی نووسینە ، بەلام بچوکترین یەکەی دەنگنییە . ئەم قسەیەی سەرەوەمان دەتوانین بەم بەلگانەی خوارەوە روون بکەینەوە : -

1 — ووشەی (مۆست - most) لە چوار پیت پێکهاتووە ، ئەگەر مامۆستایەك لە قوتابییەك بپرسێ چۆن (most) سپێل دەکەیت ؟ لەوەلامدا دەلێت ( ئێم - m ، ئۆ - o ، ئێس - s ، تی - t ) . لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ووشەکە ، ژمارەی دەنگەکانی زیاترە لە ژمارەی پیتەکانی ، واتە هەر پیتەی زیاتر لەیەك دەنگی هەیە کە بەم شێوەی خوارەوەیە : -

most (مۆست) = (m, o, s, t) چوار پیت
o (ئۆ) = 2 دەنگ (ء ، ۆ)
m (ئێم) = 3 دەنگ (ء ، ێ ، م)
s (ئێس) = 3 دەنگ (ء ، ێ ، س)
t (تی) = 2 دەنگ (ت ، ی) .

کۆی دەنگەکان (3 + 2 + 3 + 2 = 10 دەنگ با ئێستاش ووشەیەکی کوردی ، وەکو (شێر) تاقی بکەینەوە ووشەی (شێر) لەسێ پیت پێکهاتووە کە بریتین لە (ش - ێ - ر) ، ئەگەر هەر پیتێ لەم پیتانە بەتەنها گۆبکەین (تەلەفوزبکەین) دەلێین (شین - یێ - رێ) لە ئەنجامی ئەوەشدا حەوت دەنگمان دەسگیر دەبێت .

2 — ( زیادەی ژمارەی دەنگەکانی زۆربەی زمانەکان لەرووی ئەو وێنانەی کە دەست نیشانیان دەکات )[3] ، بەلگەیەکی بەهێزە بۆ دیارخستنی لەیەکتر جیابوونی پیت و دەنگ . بۆ نموونە لەزمانی ئینگلیزیدا (43 — 44) دەنگ هەیە کەچی وێنەی 26 پیتی هەیە . لەم نموونەو بەلگانەی سەرەوەدا بۆمان بەدیارکەوت کەپیت گەورەترە لەدەنگ و جیاوازن لەیەکتری .

وەلەبەر نەبوونی دیراسەیەکی ووردو دروست لەسەر دەنگەکانی زمانی کوردی ، تاکو ئێستا شارەزایانی زمانی کوردی نەیانتوانیوە ، ژمارەی دەنگەکانی زمانی کوردی بەتەواوی دیاربخەن ، بۆ ئەم راستییەش ئەم خشتەیە دەخەینە بەرچاو :

| زنجیره | ناوی نووسەر یان ناوی کتێب | ساڵ | ژمارەی | | ئەو پیتانەی بەکار هاتوون کە لەکوردی دانین | ئەو دەنگە کوردیانەی کەبەکار نەهاتون | ئەو دەنگانەی کە کەبەکار هاتون پیتیان بۆدانەنراوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | پیت | دەنگ | | | |
| | ئۆگست ژابا | ١٨٧٩ | ٣٤ | | ت ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ | ڵ ، ڕ ، ۆ ، ێ ، وو | سەر ، بۆر ، ژێر |
| | ل ١٠و . فۆسوم | ١٩١٩ | ٣٠ | | ذ | ڕ ، وو ، ێ ، ۆ | سەر ، بۆر ، ژێر |
| | دەستوری زمانی کوردی (توفیق وەهبی) | ١٩٢٩ | ٣٥ | | | | |
| | کتێبا ئەلفبا (حاجی جندی) | ١٩٣١ | ٣٠ | | | ڕ ، ڵ ، ع | |
| | ئەلفابێ یامن (کامەران بەدرخان) | ١٩٣٨ | ٣٠ | | | ڵ ، ڕ | |
| | (جەمال نەبەز) نووسینی کوردی بە لاتینی | ١٩٥٧ | ٣٥ | | | | |
| | ئەلفبا . (حاجی جندی‌و ف . جواری) | ١٩٥٧ | ٣٩ | | | | |
| | ئەلفوبێی کوردی وتینەدار (گیوی موکریانی) | ١٩٧٢ | ٢٨ | | | | |
| | ناری زمانی کوردی (محمد ئەمین هەورامی) | ١٩٨١ | | ٤٩ | | | |
| | رێنووسی کوردی د . نەسرین فەخری | ١٩٧٨ | ٣٤ | ٣٦<br>٣٧ | (بەئەلف بێی عەرەبی)<br>(بەئەلف بێی لاتینی) | | |

(تێبینی : ـ ئەم زانیاریانەی کەلەم خشتەیەدا بەرچاو دەکەون لە (1 ـ 8) لەکتێبی رێنووسی کوردی لەسەدەیەکدا وەرگیراوە ، کە لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە ، بەپێنووسی حامید فەرەج نووسراوە . وەهی (9) یەم لە کتێبی زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراووردا لەنووسینی ماموستا (محمد ئەمین هەورامی) وەرگیراوە وەهی (10) یەم لەکتێبی (رێنووسی کوردی) د . نەسرین فەخری یەوە وەرگیراوە ) .

پاش چاو خشاندنێك بەم لیستەی سەرەوە چەند شتێکمان بۆ بەدیار دەکەوێت لەمانە : ـ

1 ـ ژمارەی دەنگەکانی کوردی تاکو ئێستا بەتەواوەتی نەچەسپاوە بۆیە ، لەنووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی تر جیاوازیان هەیە ، وەهەندێ جاریش ئەم جیاوازی‌یە لەنووسینی نووسەرێکدا بەدیاردەکەوێت بۆ نموونە لە (کتێبا ئەلفبا)ی جندی‌دا ( زنجیرەی ژمارە 4 لەخشتەکەدا ) کە لەساڵی 1931 دا بلاوی کردۆتەوە وێنەی (30) پیتی کێشاوە کەچی هەمان نووسەر بەهاریکاری دەگەڵ (ف . جواری) لە کتێبەکەیان (ئەلفبا) دا (زنجیرەی ژمارە 7 لەخشتەکەدا) وێنەی 39 پیتیان کێشاوە .

2 ـ هۆی بوونی ئەم جیاوازی‌یە راستی‌یەك دەردەخات ئەویش بوونی دەنگەکانی کوردی‌یە لەگۆکردندا ، بەلام نەبوونی وێنەیان وای لەنووسەرەکان کردووە کە نەتوانن ئەم کەلێنە پربکەنەوە .

3 ـ رەنگە هەندێ لەم جیاوازیانە لەئەنجامی تێکەلاو بوونی چەند دەنگێکی بێگانە بێت لەگەل دەنگەکانی زمانی کوردی‌دا ، وە لەوانەیە نووسەرەکان (زمانەوانەکان) هەلوێستیان لە بەکارهێنانی ئەم دەنگانە لەئەلفو بێی کوردی‌دا جیاواز بێت وەکو هەندێ دەنگی عەرەبی ( ص ، ح ، ظ ، ث ، ذ ... هتد ) کە هەندێ لە نووسەرەکانمان (ص) بەدەنگێکی کوردی دادەنێن ، وە هەندێکی تر ئەم کارە بەڕاست نازانن .

4 ـ ئەگەر ئێستا بەراووردێك لەنیوان کتێبی ( زاری زمانی کوردی لەتەرازووی بەراووردا ) لەگەل هەریەك لە

لەئەلف و بێ یەکانی تردا بکەین دەبینین جیاوازیەکی گەورە لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت لەهی یەکەم ژمارەی دەنگەکانی کوردی بە 49 دەنگ داندراوە کەچی لەوانی تر بە هیچ جۆری ناگاتە 40 دەنگ لە 39 دەنگ زیاتر نین ، بەلکو بگرە کەمترن لە 39 دەنگ .

ئەوەی لێرەدا شایانی باسە مامۆستا هەورامی لە کتێبی ( زاری زمانی کوردی ... ) دا ژمارەیەك بـزوێنی دوولایەنی دیارکردووە کەچی هیچ نورسەرێك ( لەوانەی لە خشتەکەدا ناو براون ) ئەم دەنگانەی دەست نیشان نەکردووە ، تەنهـا د . نەسرین نەبێت کەیەك دەنگە بزوێنی دوولایەنی باس کردووە ئەویش (وێ)[5] یە ، وە د . نەسرین ژمارەی پیتەکانی کوردی بە 34 پیت وەژمـارەی دەنگەکـانی بە 36 دەنـگ داناوە ( ئـەمـە بەئەلف و بێ ی عەرەبی ) ، کەچی بەئەلف و بێ ی لاتینی وێنەی (37)[6] پیتی کێشاوە .

هەرچەندە نووسینی ئەمرۆمان ناتـەواوی زۆری تیایـە بەلام (زۆربەی ووشەکان و رستەکان وەکو ئەوەی گۆ دەکرێن دەنـووسرێن لەگـەڵ نەختێ جیـاوازیدا .... تـەنهـا دەنگی [ نگ ] نەبێت کەپێکهاتووە لە دوو پیتی [ ن ] [ گ ] بەلام یەك دەنگی نـوێ دەدەن کە لەهــەردوو دەنگی پیتەکـانی پێشوو جیاوازترە )[7] . ئەم دەنگە نوێیەش لەکلیلی دەنگەکانی زمانی ئینگلیزیدا هێمای g ] بۆ داندراوە هەروەکو لە کۆتایی ووشەی thing و long ی ئینگلیزیدا هەن وە وەکو لە ( تفەنگ ، چەلەنگ ، هەنگ ) ی کوردیدا هەن .
وەئـەگەر دەنگی [ ك ] یـان [ گ ] دەنگی [ ی ] یا [ ێ ] لەدواوە بێت ئەوا دەنگەکـە دەگۆرێت و دەنگی نـوێ دروست دەکەن کە جیاوازە لە دەنگی پێشوو .

وەنـابێت لەباس کـردنی دەنگ تیـز [ هێـز ـ stress ] و بەرزی و نزمی دەنگمان لەبیر بچێت چونکە هەریەك لەمانەش وەکو دەنگێکی سەربەخۆ کاردەکەن مانای ووشەکە یا رستەکە دەگۆرن . بۆ نموونە (هەرێ) و (هەرِێ) یەك ووشەن بـەلام بەدانانی تیز (هێز) لەژێر (ر) دا مانای ووشەکە جیاواز دەبێت لەمانای پێشووی ، لەووشەی یـەکەمـدا (هەرێ) بـەمـانـای (پـەیمان ـ وعـد) دێت ، بەلام لەدووەمـدا (هەرِێ) مـا (راکە) دێت واتە فرمانی داخـوزییە وەروبـەرت لادۆ دەا ( باس کردنی دەنگ دەبێت بچووکترین فۆنیم و فونیمی تێزد خالی بەیەك گەیشتن بگرێتەوە )[8] . چونکە زانینی کۆتایی وو تێکەیشتنی ووشە وەیا رستەمان بۆ ئاسان دەکات . وەکو دوو رستەیەی خوارەوەدا : ـ

1 — ئەو رستەیـەی کە لەنـاو کەوانـەدایە ، بـەبێ پشوو بخوێنەوە ( خوشکەکەتان ژنی کامتانە ) .
2 — هەمان رستە کە لەناو کەوانە دایە بەپشوودان بخـوێن ( خوشکە کەتان ژنی کامتانە ) .

لەوانەیە گوێگر ، وەیا خوێنـەر خۆی ، کـاتێ رستا یەکەم بەخێرایی دەخوێنێتەوە رستەکە زۆر بەسەیر تێ بگاو نابەجێی دابنێ . کەچی لەرستەی دووەمدا وای بەسەرنایا چونکە ووشەی (کەتان) ووشەیەکی سەربەخۆیەو ناوی ئافر ئەوکاتە مانای رستەکەی بۆروون دەبێتەوە ، کەچی (کەتا لەرستەی یەکەمدا لەکاتی خوێندنەوەدا بـەراناوی هـەبو (ضمیر تملك) تێ دەگات ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەرسـ بەتەواوی مانای بگۆرێت و رستەیەکی نابەجێ دروست . بکا

## پەراوێزەکان

J . D . O,Connor . Better English Pronunciation Cambridge Univevsity Press 1967 . p . 10 .

2 — فۆنەتیکی زمانی کوردی ـ محمد امین هەورامی ، بەغداد ، 1974 . ل25 .

3 — گوڤاری بەیان ـ بەغداد ، 1972 ژ 2 ل43

4 — مـامۆستـا حامیـد فەرەج ، لەکتێبی ( رێنـووسی کوردی لەسـەدەیـە لەلاپەرە 33 دا ژمارەی پیتەکانی ئـەم کتێبەی بـە 36 پیت داناوە ، کـ لەلاپەرە (25) ی هەمان کتێبدا وێنەی (30) پیت بۆ ئەم ئەلف و بێ یە کێشر جا وابزانم ئەمە هەلەی چاپە چونکە د . نەسرین فەخری لە کتێبی ( رێنو کوردی ) دا لەلاپەرە 74 وێنەی (30) پیتی دیار کردووە .

5 — بۆ زیاتر سوود وەرگرتن سەیری ل35 ی کتێبی رینووسی کوردی ـ د . نە فەخری ـ 1977 — 1978 بکە .

6 — سەیری هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (76) بکە .

7 — فۆنەتیکی زمانی کوردی ـ محمد امین هەورامی ـ بەغداد ـ 1974 ل 18 — ]

Robert Lado . Linguistic Across Cultures . University of Michigan . Ninth Printing 1968 . p . 13

غەفور میرزا

سەرنجێك دەربارەی ووتاری

# زمانی ئێستای کورد

# لە نووسینی ئەنستاس کەرمەلی

پێشەکی : ـ
هەندێ روشنبیری کوردم بیستبوو هەروەها لە هەندێ کتێبدا خوێندبومەوە کە مامۆستا ئەنستانس ماری کرملی مێژوونوسی گەورەی عێراقی دەربارەی کوردو مێژووی چەند نووسینێکی گرنگی هەیە کە هێشتا لە چاپ نەدراوەو لە دار الآثار بە دەستنوسی ماوەتەوە بۆیە منیش لە سالی 1978 چوم بو دار الآثار وەگەڕام بەشوێن ئەو دەستنوسانەی کە پەیوەندی بە مێژووی کوردەوە هەیە کە لە ئەنجام دا هەر ئەم دەست نووسەی خوارەوەم بە دەست کەوتوە لە سەری وێنەم گرت وا ئێستاش ئەو بەشەی کە پەیوەندی بەزمانی کوردی‌یەوە هەیە بە کوردی ئەیخەمە بەردەستی خوێندەواران تا خوێنەری کورد کەلکی لێوەربگرێ وە زمانەوانانی کوردیش بیروڕای خۆیان لەسەر ئەمەن وە بەباشی هەڵسەنگێنن . شیاوی باسە کە مامۆستا ئەنستاس ماری کرملی ئەم باسەی لە باوەڕترین سەر چاوەی فەرەنسی وئینگلیزی بەکورتی و پوختەیی وەرگرتوە .... کە ئەمەش دەقی وەرگێڕانەکەیە : ـ

## زمانی ئێستای کورد

لەبنەڕەتەوە زمانی کوردی ئەچێتەوە سەر ئاری وە لە زمانی فارسی‌یەوە نزیکە ، هەروەکو بە زارێك دائەنرێ لە زمانی زەندی وەکو جیمس دارمستر لە کتێبەکەیدا بە ناوی ( لێکۆڵینەوەکانی ئێرانی ) دا باسی ئەکا .
وا ئەبێ بە سەدەیەك کە زاناکانی ئەوروپایی کەوتونەتە لێکۆڵینەوەی ئەم زمانە ، هەروەکو تواناو هێزی خۆڕاگرتنی ئەم زمانە بەڕەنگێك‌بوو کە شایانی باس‌کردنە . بە واتایەکی تر زمانە دراوسێکانی ئەوەندە کاری نەکردۆتە سەر زمانی کوردی بەو جۆرەی کە کاری کردۆتە سەر زمانەکانی تر . لە تور عابدین و لە زۆر جێگای تردا زمانی کوردی هەڵەتی گەورەی بردۆتە سەر زمانی ئارامی ، ئەم زمانەی کە دیانەکان (النصاری ) قسەیان پێ ئەکرد ، کە لە ئەنجام دا بوو بەهۆی ئەوەی کە چەند لقو بەشی نوێی هەمە جۆری لێ پەیدا ببێ کە تا ئەمرۆش زانایانی ئەوروپایی بۆیان رێك نەکەو تووە لێی بکۆڵنەوە .
زمانی کوردی ئەدەبی زمانەوانی تایبەتی خۆی هەیە ... بەڵێ ئەدەبی زمانەوانی خۆی هەیە کەبەندە بەو نەتەوەیەوە کە ئەمەش لە توخمی ئەو ئەدەبە ئەچێ کە رۆژگاری هەمەرەنگلە هەندێ نەتەوەی بچووك‌و نیمچە شارستانیەتدا ... پێکەیاندووەو پەرەی‌پێ‌داوە وەك ئەفغان کە ئەکەوێتە ئەولای وڵاتی ئێرانەوە ، یاوەکو غائیل لە وڵاتێکی‌تردا . تا کۆمەڵێك لە نووسەران توانیویانە لەم ڕووەوە گۆرانی‌و داستان‌و چیرۆکی کوردی زۆر کۆبکەنەوە ، لەمێژەوە گەڕیدەکان زمانی کوردیان یا بەزمانێکی توندوتیژ یا بەزارێکی شێواو یابەبەشێك لە زمانی فارسی‌یان داناوە لایان وابووە کە کەس لەم زمانە ناگا تەنانەت ئەوانەی کە تێی ئەگەن مەگەر هەر ئەوانەبن کەهەر لە منالی‌یەوە قسەی پێ‌ئەکەن هەندێکی تر وا بۆی چووبوون کە ئەم زمانە دروست‌کراوەو بناغەکەی لەسەر ووشەی فارسی‌و ئەرمەنی‌و تورکی دامەزراوە ، ئیتر بەم رەنگە ئەم بیروڕایانە تا ئەم دوایی‌یەش هەر باو بوو ، هەرچەندە کە لە ڕاستیشەوە زۆر دوورە ، چونکە پاش لێکولینەوەیەکی وورد دەرکەوت کە ئەم زمانە شایانی ئەوەیە بخرێتە ڕیزی ئەو (9) نۆ زمانەی کە ئەمڕۆ لە ئارادایە وەکو تورکی‌و فارسی‌و .. ئەوانی تر .. هەروەکو ئاشکرایەو ڕونە .. باو باپیرانی مادو فارس بە دوو زمانی جیاواز قسەیان کردووە کە ئەویش بریتی بووە لە مادی یا ئاوێستایی‌و فارسی کۆن ، کە ئەمە زمانی ( لەسەر بەردنووس بوو ) هەرچەندە دوو زمانەکە بە جیا لەیەکتری پێکەیین‌و گەشەیان کردوە وەلە چوارچێوەی شێوازی کۆن نەماونەتەوە ، جاهەر وەکو زمانی فارسی زۆر ووشەی عەرەبی وەرگرت ، زمانی ئینگلیزی سەکسۆنی‌یش زۆر ووشەی لاتینی هاتە ناوەوە کە لە ئەنجام دا ئەم زمانە ئینگلیزی‌یەی ئێستای لێ پەیدابوو . بۆیە ئەبینین زمانی کوردی لە هەندێ دروووەوە جیاوازە لە فارسی هەروەکو لە هەندێ لای ترەوە لەیەك ئەچن ، کە ئەمەش ئەبێتە

هۆی ئەوەی کە لەسەرێکەوە ڕێگە لە ووشەی بێگانە بگرێ ، وە لە سەرێکی تریشەوە دەرگا بۆ هاتنە ناوەوەی ڕێزمانی بێگانە بکاتەوە ، هەرچەندە زۆر جار ووشەو دەستەواژەی فارسی لە زمانی کوردیدا ئەبینین ، بەلام ئەوەی سەرەنج ڕاکێشەرە داڕشتن و دەربڕین و قسەکردن لە چوارچێوەی شێوەی کوردیدا خۆی ئەنوێنی بەڕەنگێ کە ئەم زمانە وەك زمانێکی سەربەخۆ دێتە مەیدانەوە کە جیاوازی هەیە لەگەل زمانی فارسی داڕێژراودا - واتە بەوێنەی جیاوازی زمانی کوردی هەرەمەیی لەگەل زمانی فارسی ڕەراندا - دێتەبەرچاو هەروەکو کەنارگیری زمانی کوردی و تێکەل نەبوونی لەگەل زمانەکانی تردا باشترین ڕێگا بووە بۆ پاراستنی ، کە لە ئەنجامداو بەپێویستی بووە بەهۆی پێگەیاندن و پێشکەوتنی زارە بلاوەکانی تر لەو کەژو کێوە دابڕ دابڕانە دا کە لانەی نەتەوەی کوردە

بەڕاستی شوێنەواری ئەدەبی لە زمانی کوردیدا بەو ڕەنگە نی یە کە شایانی باس کردن بێ و بتوانی کاری خۆی بە قوولی لەسەر زمانەکە بگێڕێ . هەر ئەم حالەش بووە بەهۆی ڕێگاگرتن لە گەشەکردن و فراوانی ئەم زارانەوە بەو ڕێگە تایبەتی یانە دا بیان بات کە ئێستا تیایەتی .

دانەری ئەم کتێبە ڕۆژانێکی زۆر لە ناوچەرگەی هەمە جۆرەی دانیشتوانی کوردا ماوەتەوە لە پاش خۆتەرخان کردن و لێکۆلینەوەیەکی زۆر لەسەر ئەم زمانە بۆی دەرکەوتووە کە کورد زمانێکی پاك و خاوێن و ڕەوانی هەیە کە لە ناوچەرگەی کوردستاندا باو بووە لە دوایی دا ئەم زمانە شیاوی ئەوەی هەیە ببێتە بناغەیەك بۆ زارەکانی تر .

لەم خاکە دا کە دانیشتوانی بەتێکڕایی یا بەزۆری کوردن ئالوگۆڕێکی زۆری لەم ماوەی دو هەزار سالەی دووایی دا بەخۆیەوە دیوە ، کە لە ئەنجام دا دەرکەوت کە ئەم نەوەیە نیشتەجێی ئەم مەلبەندەیە کە ئەکەوێتە نێوان ئورمێ و گۆمی وان و ئەو کێوانەی کە سەرچاوەی گەورەترین ڕووباری دۆلی دوو زێ و خوارووی ئەو کەژانەی کە ئەمرۆ ناو ئەبرێ بە کوردستان ، هەروەها ئەم مەلبەندە ئەڕواو درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە باکوری مەلبەندی دانیشتوانی هۆزی لوڕو خێلی گۆران و ئەردەلانی کۆن کە ئەمرۆ بە کورد ناسراون .

جا خەلکی ناو سنووری ئەم وولاتە بە زما نێ ئەدوێن کەپێی ئەلێن کوردی یا کرمانجی .

لە ئاوابوونی ئەستێرە ئەم وولاتە بەهێزانەی کە گەماڕۆی ئەم دانیشتوانەی دابوو . ئەم کۆمە لە خەلکە دلێرە هەر ئەوەندەیان بۆ مایەوە کە بەرەو ڕۆژئاواو باکوور بکشێن و نیشتەجێ بن کە وەکو ئەمرۆ ئەیانبینین لە بایەزید کە ماوەیەکی زۆرە بە دەست بەگەکانی کوردەوە بوو کە ساف و پاك بە شارێکی کورد ناسراوە هەروەکو بەوێنەی ئاوارەیی و کۆچەری لە ئەرزەڕۆم و ئەرزنجان و ئەو شاخانەی کە کەوتونە باکوری حەلەب و سنووری باکوورەوە ئەژیان ، لەگەل ئەوەشدا کە دووسەد سالێك ئەبێ نیشتەجێن . بەلام هێشتا ژیانیان کۆچەری یا نیمچە شارستانی یە . کە هەمیشە ترس و لەرز ئەخەنە دلی گەلە دراوسێکانیانەوە وەلە هەموو کاتێك دا لە سەر پێن بۆ تالان و بڕین و کوشتن ، جا هەر چەندە ئەلێن کە ئەم هۆزو خێلانە بەتێکڕایی بە کرمانجی واتە بە کوردی ئەدوێن ، بەلام لەگەل ئەمەش دا لەڕیزی دانیشتوانی کوردستان دا هەندێ هۆز هەن کە بەکورد ئەناسرێن کە ئەورووپایی یەکان و تورکەکانیش زمانەکەیان بە زارێکی کوردی دائەنێن کە هەرە گەورەیان هۆزی زازایە ، کە تیرەو بەشەکانی بلاوبۆتەوە لە ناوەڕاست و خوارووی کوردستان دا . ئەم زمانی زازایە بێ سێ و دوو لێکردن زمانێکی ئێرانی یە ، بەلام لە ڕووی دەستەواژەو ڕێزمان ووشە داڕشتنەوە لە کوردی ئەچێ ، هەروەکو لە هەندێ ڕووی لێك چوون لە زمانی گۆران و لوور ئەچێ ، بۆیە هەندێ لە زانایان ئەم زازایی یە بە لقێك لە گەلانی زەردەشتی دوواکەوتووی نیشتەجێی وولاتی ئێران و تورکیا دائەنێن .

هەروەکو لە ویلایەتی دەرسیم لە ئاسیا دا لە ڕیزی هۆزەکانی کوردو زازا دا هۆزێکی تر هەیە کە پێی ئەلێن بلاکی کە زمانەکەیان تێکەلاوە لە عەرەبی و ئەرمەنی و کوردی وەنزیك ترین هۆز لە بنەچێ ئاری یەوە کە گومانی لێ ناکرێ هۆزی هەکاری و موکری یە .

بەلگەی چەسپاومان بۆ ئەوەی کە کوردەکان دانیشتوی ئەم خاکەن کە ئەمرۆ بە کوردستانی ناوەو دەورووپشتی ناو ئەبرێ ، کە تا ڕادەیەك دەستەلات و ئاسودەگی یان تیا بەدی هێناوە ، ئەوەیە کە زۆر لە شاعیرە هەلکەوتوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە ولاتی هەکاری دا چاویانی تیاهەلێناوە لە سەروی هەموویانەوە عەلی حەریری بەناوبانگ کە نوسینەکانی تا ئەمرۆ ناوی ئەدرەوشێتەوە ، ئەم شاعیرە کە لە سەدەی پانزەی

زاینی‌دا له ویلایه‌تی (شه‌مزینان) ی وولاتی هه‌کاری ژیاوه ، له سنوری ئێران ، که سامناکترین و سه‌خترین ئه‌م ولاته یه . جگه ئه‌م شاعیره‌ش ، شاعیرێکی تری به ناوبانگ هه‌یه که ناوی شێخ ئه‌حمه‌د جزیری یه که له هه‌کاری له سه‌ده‌ی دوانزه دا ژیاوه ودیوانه‌که‌شی هه‌مووی دۆزراوه‌ته‌وه که له‌م نزیکانه‌دا هێنراوه بۆ ئه‌لمانیا پاش وێنه‌گرتنی به‌رده نوسی [ الفوتوغرافية الحجرية ] له پاش ئه‌م دوو شاعیره هه‌تا کاتی محمد فه‌قێ ته‌یرانی له مه‌کسی هه‌کاری که له سه‌ده‌ی چوارده‌هه‌مین ژیاوه‌و نوسینه‌کانی هه‌موو دیارو له‌به‌ر چاوه که‌سی تر نه‌هاتونه ناوانه‌وه . پاشان مه‌لا ئه‌حمه‌د له « باته‌ی » هه‌کاری دێته ناو ناوانه‌وه که کتێبێکی تابلێ به ناوبانگی هه‌بوو که پێیان ئه‌ووت مه‌ولود نامه . له کاتی ئه‌م شاعیره تا دوایی ئه‌میش هه‌کاری‌یه‌کان به چه‌شنێ بلاوبونه‌وه تا گه‌یشتنه بایزید ، وه‌له‌وێ نیشته‌جێ‌دا که له ئه‌نجام بوون به‌ناوبانگترین شاعیرو نووسه‌ری کورد له سه‌ده‌ی شانزه دا له‌م مه‌لبه‌نده‌دا له دایك بوو که ئه‌ویش احمدی خانی‌یه که به‌رهه‌مه‌کانی له‌ڕووی ئامۆژگاری‌و په‌روه‌رده‌یی‌و هی تر زۆره . که له‌م مه‌یدا نه‌دا زۆر به‌ناو بانگ تره له نووسه‌ره‌کانی تر که توانی له بایزید قوتابخانه‌یه‌ك بکاته‌وه‌و بناغه‌ی مزگه‌وتێك دانێ . وه‌فه‌رهه‌نگێکی قوتابخانه هۆنراوه‌یی به عه‌ره‌بی‌و کوردی دانێ که ئه‌م به‌رهه‌مه به وێنه‌ی ده‌ستنوسی ئه‌مرۆ له مۆزه‌خانه‌ی به‌ریتانیا دا پارێزراوه .

له سه‌ده‌ی دوای ئه‌م له بایه‌زید یه‌کێکی تر له قوتابی‌یه‌کانی که ناوی اسماعیل بوو بو به جێگیری ، هه‌رچه‌نده که ئه‌وه‌نده‌ش به‌ناو بانگ نه‌بوو وه‌له‌دوای ئه‌م سه‌ده‌یه‌ش به‌ناوبانگترین نووسه‌ری کورد شرف خانی هه‌کاری هاته دنیاوه که به زمانی فارسی مێژووی کوردی نووسی ( شه‌ره‌فنامه ) که تا ئه‌مرۆ باشترین سه‌رچاوه یه بۆمێژووی ئه‌م‌نه‌ته‌وه‌یه . که جگه له‌مه‌ش زۆرله کتێب‌و هۆنراوه‌ی کوردی هاته به‌رده‌ست ، ئه‌وه‌ی که زۆر له‌ناو شاعیره‌کان دا ناوی دی مراد خان بایزیدی هه‌کاری یه هه‌رچه‌نده که زۆر به‌ناوبانگیش نه‌بووه ، له سالی (1784) دا کۆچی دوایی کردووه .

به‌لام له خواروو زۆر شاعیر له مه‌لبه‌ندی خانه‌کانی گۆران له شاری سنه له ئه‌رده‌لان هاتونه‌ته ناوناوانه‌وه که تێکرا هه‌موویان به‌زمانی گۆران هۆنراوه‌یان هۆنیوه‌ته‌وه . به‌م چه‌شنه شاعیری گه‌وره له خوارووی کوردستان په‌یدانه‌بوو تا دوایی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌هه‌مین له سلێمانی چاوی هه‌لهێنا پاش ئه‌وه‌ی سلێمانی‌و که‌رکوك بوو به‌لانه بۆ زۆر له‌نووسه‌رو شاعیره گه‌وره‌و بچوکه‌کان ، که له‌به‌ر زۆری ناتوانین لێره دا سه‌ر ژمێریان که‌ین . گرنگترین هۆزی کورد ئه‌مرۆ بریتی یه له کورده‌ملی‌یه‌کان که له کوردستانی مزوری دانیشته‌جێن ، وه‌حه‌سه‌ن ئالوکه له بانی ئه‌رمینیاو هه‌کاری نیشته‌جێن وبلاوبوونه‌ته‌وه له ناوچه‌ی وان‌و بدلیس له ڕۆژهه‌لاتی سنووری ئێران‌و دۆلی زێی گه‌وره‌و جزیره‌ی ابن عمرو ده‌ورووپشتی هه‌ولێر هه‌روه‌کو هۆزی ره‌واندوزو هۆزی حاله که نیشته‌جێن له ڕۆژئاواو باکووری سلێمانی ، که به‌بنه‌چه ئه‌چنه‌وه سه‌ر کرمانجی هه‌روه‌کو له خواره‌وه‌ش خێلێ جاف دێ که کوردێکی کۆچه‌ری ده‌سته‌لاتداری به‌زه‌برو زه‌نگن . که ناوچه‌که‌یان درێژ ئه‌بێته‌وه بۆ قزلربات . که هه‌ر له ڕێگه‌ی به‌غداوه ده‌ست پێ ئه‌کا تا ئه‌گاته کرمنشاه که زمانه‌که‌یان کوردی‌یه‌کی تایبه‌تی زۆر شێواوه‌و ، تێکه‌ل‌و پێکه‌له له ده‌سته‌واژه‌ی زمانی لوری .

له‌لای سنووری ئێران بۆ خوارووی ئورمیه تیره‌ی موکری دێته‌به‌ر چاوو که دیاره زمانه‌که‌یان به‌ڕه‌وانتر زمانی له ئارادا بووی ئه‌مرۆ دائه‌نرێ . جا له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌موو هۆزێ به چه‌ند تیره‌یه‌کی زۆره‌وه دابه‌ش ئه‌بێ ، له‌وانه‌ی به‌شی حسن‌ئالۆ که هۆزی وه‌کو سبکیه ، هیدران لو اومان لوو ، ئه‌کرێته که به‌دزی‌یه‌وه ناویان ده‌رچووه یا شکاك ئه‌و هۆزه‌ی که ناویان به ئازایه‌تی‌یه‌وه ده‌رکردوه که له سنووری ئێران دا به به‌شێك له هه‌کاری دائه‌نرێن هه‌روه‌ها (بلباس) یش به شێکه له هه‌کاری . که له کۆن دا گه‌وره‌و به‌هێزو لێهاتوو بوون به‌وێنه‌ی دانیشتوانی ڕه‌واندوز که سه‌رۆکه‌که‌یان له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی پێشوو دا سه‌ربه‌خۆبوو به‌ڕه‌نگێ که ده‌سته‌لاتدارێتی .
به‌هێزی زۆر جێگای گرتبوه‌وه .

ئه‌وه‌ی پێویسته بیلێین ، زاناکانی ئینگلیز بۆ چونیان بۆ لێکۆلینه‌وه له‌سه‌ر زمانی کوردی که‌م بوو ، ، و ابزانم به هه‌له دانانرێ ئه‌گه‌ر بلێم که که‌س نی‌یه له‌م ولاته گوێ‌ی دابێته ئه‌م به‌شه له‌ڕووی لێکۆلینه‌وه‌ی ڕۆژهه‌لاتی‌یه‌وه . له نێوان — 1890 1850 له ڕیزی دانا زمانه‌وانی‌یه‌کانی ئه‌ورووپایی دا هه‌ندێ که‌وتنه خۆته‌رخان کردن بۆ ئه‌م چه‌شنه لێکۆلینه‌وانه که

زۆربەیان ڕووس بوون بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا لەو کاتە دا هەر دوو کتێبیان دەرکرد . کە یەکێکیان حکومەتی فەرەنسا بڵاوی کردەوە کە لێکۆڵینەوەکە لە سەر زاری فارسیو کوردی بـوو ، هـەرچەنـدە لێکۆڵینـەوە ووردو باش نـەبوو . دووهـەم کتێب بـەردنـووسێکی وێنـەیی بـوو کـە لەدە ستنـوسێکی گـەورە وەرگیرابوو کە بریتیبوو لە دیوانی شێخ ئەحمەدی ناوبراو ، کە نەپەراوێز ، نەلێکۆڵینەوەی لەسەر نەبوو .

بێگومان فێربوونی زارێك لە زارە زۆرەکانی کورد وا ئاسـان نییە ، هەروەکو هەموو ئەوروپاییەك توانای ئەوەی نییە کە لە کوردستان دا ماوەیەك بمێنێتەوەو لە پێناوی ئەم مەبەستەدا تاڵو سوێری ژیان بچێـژێ . بۆیـە ئەبینـین کە زۆرتـری ئەو نوسینانەی لەم بابەتەوە ئەدوێ بەری ڕەنجی ئەو پیاوانەیە کە بە فەرمانبەری لە کوردستان دا مابوونەوە کە هەرە باشترینی ئەم لێکۆڵینەوەرانە ئەو ڕووسانە بوون کە لە کونسلویتی ڕووسی دا کاریان دەکرد ، یەکێك لەوانە (جـابا) کـە لە ساڵی 1860 لە بـطرسبورغ کـۆمەڵە یـادداشتو قسەو وشـەیەکی کـوردی بڵاوکردەوە کە بریتی بوو لە کۆمەڵە داستانو چیرۆكو هۆنراوە بەزاری کرمانجی باکووری کە بەبێ دەستکاری ، بێلێکۆڵینەوە ، بێ پـەراوێـزدانـان ، وەریگێـڕایـە سـەر فـەرەنسی کـە پێشـەکییەکـەی مامـۆستا لیـرخ (Learch) نوسیـوی دووبارە « جابا » بوو کە کتێبێکی بە ناونیشانی کتێبی ئەڵمانی وەرگێڕا سەر فەرەنسیو لە ساڵی 1857 دا بڵاوی کردەوە ئەم کتێبـە کە سەرتاپاگیر باسی لە زمانی کرمانجیو فارسی ئەکا لەگەڵ کورتە باسێك دەربارەی نیازی دانەر لە دانانی ئەم کتێبە لە ڕووی هەر دوو زارەکەوە فارسیو کوردی کە لەگەڵیا دووبارە بە لێکۆڵینەوەو بـە پـەراوێـز ووشـەی بـەرامبـەری کـرمـانجیو فـارسیو ڕازانبیویەوە ، هەروەکو زوربەی کتێبەکە تەرخـان کراوە بـۆ ووتەو چیرۆك لەگەڵ بەشی وەرگێڕاویا .

لە ساڵی 1877 بریمو سـرس کۆمـەڵە هۆنـراوەیەکی بـە زاری تورعابدین ، بۆتان هەکاری لەگەڵ وەرگێڕانی دا بە ئەڵمانی کە بە ناونیشانی « بـەئەڵـمانی » بطرسبـورگ 1877 بڵاوکـردەوە کە زوربەی ئەم هۆنراوانەی لە کاتی گەڕانیدا لە ناوچەی تیاری هەکاری دا کۆکردبۆوە هەرچەندە ئەم هۆنراوانە هیچ چەشنە لێکۆڵینەوەیەکی چ ووشەیی یا ڕێزمـانی پێوە نییـە . کە بـە پێچەوانەوە ئەگەر ئەم لێکۆڵینەوەی لە سەربـوایە ئـەم کتێبە ئەبوو بە کتێبێکی سوودبەخشی تەواو بۆ ئەوانەی دەستیان لە زمانەوانیدا هەیە بەڵام لە ئەنجام دا بێسوود بوو بۆ ئەوانەی کە ناتوانن لە زمان بگەن . ئەویش لەبەر کەمی سەرچاوەکانی ڕێزمانی لەم ڕووەوە بەڵام جسنی لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی ئەڵمانی بطرسبورگ 1877 کـەئەمکـە لەبەرەی تـاڕادەیەك پـڕ کردۆتەوە ئەویش بە تەرخان کردنی (150) لاپەڕە لە تێکڕای (250) لاپەڕەی کتێبەکە بۆ لێکۆڵینەوەی دووڕو درێژ لەسەر شێوەی دەنگ دەرچوون « مخارج الاصوات » ودرێژەدان بە بابەتی تر لە ڕووی پیتی ، دەنگو ڕاست کە ئەیتوانی ئەگەر بیویستایە بەکەڵك بێ . لە سنووری (20) لاپەڕەیەك دا کۆی بکاتەوە . کە ئەو دەمە قـوتابیـانی سەرسـام ئەکـرد کاتێ کـە ئەیـانبینی جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان دەنگەکاندا . بەڵام ڕێزمان ، بناغەی دەنگ هەرچەندە تەواویش بێ بەڵام هەر کەمو کوڕی پێوە دیارە لە ڕووی ڕێكو پێکیو دروستی یەوە هەروەکو جابا پێش ساڵێ فەرهەنگە کوردییە فەرەنسییەکەی بڵاوکردەو کە بریتی یە لە نامیلکەیەك ڕازاوەیە بە (14000) ووشە لەگەڵ کۆمەڵێ لە زار کە زوربەیان لە زاری باکووری هەڵبژێراوە . هەروەکو لە کتێبەکەی پێشـودا باس کـراوە ، ئیتر ئـەمەتـە ئەو نـوسینە گـرنگانـەی کە دەربـارەی ئەم زمـانە نـووسـراوەتـەوە کـە « دیمورغان » لە کتێبەکەیدا بە نـاونیشانی « لێکـۆڵینەوەی زمانەوانی » باسی ئەکا هەروەکو (مارتن هوفمان ) ناوبراویش لە هەمان ساڵ دا باسی ئەکا . جا زمانەکانی ناوچەی کوردستان بریتییە لە زارەکانی زمانی بنەچەیی کە کوردەکان پێی ئەڵێن کرمانجی یا کورد مانجی کە ئەمەش ووشەیەکە دوور نییە کە لە ڕیشەوە بچێتە سەر دو وشەی کورد ماهی ، کە دیاریشە ووشەی « ماە » بریتییە لە ناوی مادی هەروەکو هەندێ لە زاناکان لێی کۆڵاونەتەوە وەناونانی هەنـدێ جێگەو شـوێنیش بەم نـاوەوە بەڵگەی تـەواوە بۆ سـەلماندنی ئەو کێشـەیەی کـە دەڵێت ، کوردەکان نەوەی مادن . بۆیە ئەم ناوە لەم بیروڕایەوە هاتووە کە باسمانکرد ، وەئەم ڕاستییەش واتە ناوی ئەم نەتەوەیە یەکێك بوو لەو شتە نهێنی یانەی کە تا ئەمڕۆ پەردەی لەسەر لانەچوبوو .

زمانی کرمانجی زمانێکە کە کۆمەڵە خەڵکێکی ئاری بڵاوە بوو لە ناوچەیەکی فراوان دا قسەی پێ ئەکەن . کە ژمارەیان ئەگاتە

چوار یا پێنج ملیۆنێ که له سه‌رخۆو بلاوبونه‌وه به ناوچه شاخاویه‌کاندا ، که له‌م مه‌لبه‌نده‌دا له‌وه‌ری باشیان بۆ مێگه‌له‌کانیان دابین ئه‌کردو ئه‌یان کرده لانه بۆ هه‌له‌ت دان و په‌لامار بردن ، هه‌روه‌کو له پێشه‌وه باسمان کرد .
زۆرترینی ئه‌م هۆزانه به کوردی قسه ئه‌که‌ن و ئه‌وه‌ی سه‌رنج راکێشه‌ره له زاره جۆر به جۆره‌کاندا بریتی یه له یه‌کچون له یه‌کێتی بنه‌چه‌یی ، دارشتن‌وه ئیتر له‌هه‌ر لایه‌ك به‌م زمانه قسه‌بکرێ کورده‌کان به‌و ناوه‌وه ناوی ئه‌به‌ن ، واته پێی ئه‌ڵێن کرمانجی .

له لای خوارووی دووره‌وه له کوردستان خه‌ڵکی به‌و زمانه‌ی که پێی ئه‌دوێن پێی ئه‌ڵێن کوردی « له ناوچه‌ی کرمنشاه لور ، گۆران ، سنه » که دیاره ئه‌م زاره له توخمی زمانی کرمانجی نی یه ، ته‌نانه‌ت نزیکی یه‌که‌ی وه‌کو نزیکی دوورترین زاره له زاره‌کان ، که له هه‌وه‌ڵ کودا وا ده‌رئه‌که‌وێ به‌شێکه‌و جیابۆته‌وه زیاتر له‌وه‌ی که به‌شێك بێ له کوردی جا ئیتر زمانی کوردی وا ده‌رئه‌که‌وێ که زارێکه له فارسی و لوری که ژماره‌یه‌کی زۆر له ووشه‌ی کرمانجی و هه‌ندێ له شێوه‌ی (فرمان) ی تێکه‌ڵ بووه ، له‌به‌ر زۆری زاراوه‌کان له زمانی کوردی دا ناتوانین ووشه یا رسته‌یه‌ك بهێنین و به‌راوردی بکه‌ین له‌گه‌ڵ زمانی ئینگلیزی دا بۆیه پێویستی وا ئه‌کا که باسی جیاوازی نێوان به‌شه سه‌ره‌کی یه‌کان بکه‌ین که ئه‌توانین به‌گشتی بیکه‌ین به‌دوو به‌شی ئه‌گه‌روه‌وه ، یه‌که‌میان به‌شی خوارووی که سه‌رتاپا موکری (صوج بولاق) و بابان و سلێمانی ئه‌گرێته‌وه ، به‌شی باکوور که زاره‌کانی هه‌کاری باکوور ، ئه‌رزه‌رووم بایزید ئه‌گرێته‌وه . که هه‌ردوو به‌شه‌که له‌م کتێبه‌دا به‌م پیتانه‌ی خواره‌وه نیشان ئه‌کرێ .N.G) (G.۷ وه‌نه‌و جێگا یا ئه‌و به‌شانه‌ی که نیشانه نه‌کراوه مانای ئه‌وه‌یه هه‌ردوو به‌شه‌که ئه‌گرێته‌وه .
به‌وێنه‌ی زاری کرمنشاهی که سیمای خۆی هه‌یه ، زاری سلێمانیش وێنه‌ی تایبه‌تی خۆی‌بووه دیاره هه‌رچه‌نده ناتوانین بیخه‌ینه خانه‌یه‌که‌وه‌و پێی بڵێین زاری کرمانجی .

لێره‌دا مه‌به‌ستمان لێکۆڵینه‌وه نی یه له‌سه‌ر زمانی زازاو گۆرانی کۆن چونکه زمانی گۆران به کرمانجی دانانرێ‌و زمانی زازاش هه‌رچه‌نده به شێوه‌یه‌ك ئه‌ژمێرێ له زمانی کوردی به‌لام به‌ره‌نگێ جیاوازی له‌گه‌ڵ دا هه‌یه مرۆڤ ناچار ئه‌کا که لێکۆڵینه‌وه‌یه‌کی تایبه‌تی و سه‌ربه‌خۆی بۆ بسازێنی ، زیاد له‌مه‌ش زمانی زازاش هه‌ر به به‌شێك دائه‌نرێ له گشت ، وه‌له‌و په‌له‌و پایه دا نی یه که خۆی له هاوتای زمانه کرمانجی یه‌کان بدا .
ئێمه زۆر گوێمان به پیتی ده‌نگدار نه‌داوه ، هه‌روه‌کو جسنی هی تر کردویانه چونکه جیاوازی نێوانیان زۆر ووردو که‌مه ، ته‌نانه‌ت زۆر ووتن له سه‌ری نابێته هۆی ره‌وانی بێژه . که له ئه‌نجام دا ئالوگۆری جۆر به‌جۆرو شێواو له نێوان پیتی ده‌نگداره‌کان سه‌ر ده‌رئه‌هێنێ . بۆیه به‌وه وازمان هێناوه که هه‌ر به پیتی بزوێن (الحروف المتحركه) ناوی به‌رین ، ئیتر ده‌نگه‌کانی تر خوێنه‌ر خۆی ئه‌توانێ ره‌وانی کاو قسه‌ی پێ بکا وه له دواییدا بتوانێت به‌هۆیه‌وه له ناو کورده‌کاندا بژێن ، واته قسه‌ی پێ بکاو گوێ بۆ قسه‌یان راگرێ .به‌لام زۆر جار رووئه‌دا که خوێنده‌وار ئه‌گه‌ر پیتی ده‌نگداری‌یه‌کێ له زاره‌کانی ره‌وان کردو قسه‌ی پێ‌کرد زۆر لای زه‌حمه‌ت ئه‌بێ ئه‌گه‌ر بیه‌وێ فێری زارێکی تر بێت چونکه پیته ده‌نگداره‌کان له‌م کاته‌دا قسه‌ی پێ ناکرێ وه‌کو له‌زاری پێشودا قسه‌ی پێ ئه‌که‌ن . به‌لام پیته بزوێنه‌کان ، به لای روونی و تێکه‌یشتن دا ئه‌شکێته‌وه به‌راستی به‌شیرازه‌ی چاك و دروست دائه‌نرێ ، وه ئه‌م بیروڕایه‌ش ئه‌م باسه‌ی خواره‌وه ئه‌ی‌چه‌سپێنێ : به‌رێز جسنی به قوولی له ده‌نگه‌کانی ده‌ره‌وه (خارج الاصوات) ی کۆڵیوه‌ته‌وه بۆیه به‌ڵگه‌ی هه‌یه که بڵێ بێژه (لفظ) هیچ شیرازه‌یه‌کی ته‌واوی نی یه که هۆی ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌یه که زمانی کوردی زمانێکی نه‌نوسراوه که ئه‌م قسه‌یه تطبیق ئه‌بێ به‌سه‌ر زاره‌کانی تریش دا .
له دواییدا با خوێنه‌ر ببورێ لێم ئه‌گه‌ر که‌م و کورییه‌کی هاته پێش‌چاو له‌م نوسینه‌دا که نووسه‌ر هه‌وه‌ڵ جاره له زمانێك ئه‌کۆڵێته‌وه ، که که‌سی تر تا ئه‌مرۆ له ده‌رگای ئه‌م باسه‌ی نه‌داوه ، هه‌روه‌کو داوا ئه‌که‌م که به چاوێکی لێبوردنه‌وه بروانه ئه‌و هه‌لانه‌ی که نه‌مانتوانیوه خۆمانی لێبپارێزین له رووی لێکۆڵینه‌وه له‌سه‌ر ئه‌م زمانه ئه‌م زمانه‌ی که ته‌نانه‌ت ئه‌وانه‌ش که خۆیان ته‌رخان کردوه بۆ لێکۆڵینه‌وه له سه‌ری که ناویان بردوون ... ناتوانن رێزمانی و شێوه‌ی بزانن .
دوایی فێربوونی زمانی کوردی له کوردستان دا وه‌نه‌بێ کارێکی ئاسان بێ ، رۆژانێك هه‌بوو که لێکۆڵینه‌وه‌رانه‌کان ئه‌ترسان له‌ناو ساردو سه‌رمای ئه‌و شاخ و کێوه به‌فراوینانه‌دا ره‌ق ببێته‌وه‌و گیانی ده‌رچێ .. ئیتر .. سه‌لامه‌تیتان .

دیوانی کاروان

# سێ وەرزی وڵات

● محمد صالح دیلان ●

**پاییز**

ساڵ پاییزە ، گەرمەی گەڵا ڕێزانە
زێڕ[1] بارانە ، شێوەی ساڵی جارانە
گەڵای ڕژاوی ، دارمازووی چیای بەرز
ملوانکەکەی ئەئاڵانە ملی وەرز
هەناسەی شاخ ... کزەبای ساردی پێدەشت
تێکەڵ ئەبوون ڕووەو دامان بەبای وەشت
گرمەی هەوور ، لێزمەی خوری پەڵەی ساڵ
بە هورووژم خۆی ئەگەیانە ناو ماڵ
ڕوباری شین ، سوور هەڵگەڕاو بە لافاو
جاری بێدەنگ جاری بە هاژەو بە تاو
مۆسیقابوو بۆ شەو ، بەستە بۆ شەوگار
شەوی درێژی ، هەنسکی بە هاوار ... !!!

**زستان :**

کڕێوەیە لەو ملانە بەفری شاخ
سپیکاری[2] خۆی گەیانە پشتی باخ
بەفرباری سەرپۆشی کێو نەخشانە
لە کلیلە[3] کێوماڵ کردن گرانە
کێ ئەگاتە دەرەی سەختی پشتی کێو
ڕەز داپۆشرا سەهەن[4] گەیشتە سەر مێو
چلوورەیە لوورەی بای زەمهەریرە
چیا سپی لووسە وەك چوڕی شیرە
لەبەر دێدا شەرە تۆپەڵ هی گەنجە
سنگ بۆ کوانوو[5] چۆقە جێگەی سەرنجە
خۆراکی ڕۆژ خواردەمەنی کوێستان هات
بەفرو دۆشاو ڕەش و سپی زستان هات
چلەی جاران ، شێرە بەفرینەی جاران ؟؟
کوایت چیت لێهات بۆ چوویتەوە بە باران .. ؟؟

**بەهار :**

شینی چلە دەستی پێکرد بە تەرزە
ئاوەزێیە[6] چاوی زەوی ئەم وەرزە
قاسپەی کەوە تاریك و ڕوون بەیانی
لەو ملانە موژدەی گزنگی هانی
بای دارئاووس[7] شنگ[8] هێنەرە بۆ پیشۆك
گێلاخەی سەوزی لەیلاخە[9] هەڵەکۆك
زەردەپەرە ، نێرگسە چاوی زەردە
تارا پۆشە .. وا چارەیی نەبەردە ... !!
لەشکری سوور مەشقکەرە گوڵاڵە
لوولك ژەنی دوای نیوەڕۆ شەماڵە
چاوی شینی تێکەڵ ڕەشە وەنەوشە
نیگای مەنگی کراوەیە بێ خەوشە
کوای سای بەهەشت ، کوای دیمەنی یەزدانی .. ؟؟
کوای چیت لێهات بۆکەوتیتە نیهانی .. ؟؟

**ئەنجام :**

ئەی ... وەنەوشەی «شینی» بەرگی وڵاتم
کوچك و بەردە ژێرپێی ڕەوتی نەجاتم
هەر کڵۆکە شوێن بازرەقەی بەهارم
پڕ دووکەڵە جێ دەواری هەوارم
گورچك بڕە چنگی ئاراستەی گیانم
جەرێنراوە پەتی دەم و زمانم
هەڵخراوە بە ژمارەی تووکی سەر
تەناف سفت بۆ گەردنی گوڵ و بەر
کەچی نووزە خەریکە بێ بە ئاواز
جووڵە بزوون ئەوا ئەبێ بە پەرواز

**پەراوێز :**

1 ـ زێڕ = گەڵای درەختەکان کە پایز زەرد ئەبن .
2 ـ سپیکاری = مەبەست لە بەفرە کە چیاکان دائەپۆشێ
3 ـ کلیلە = بەفر کۆمەڵ بوون لە جێگایەکا .
4 ـ سەهەن = سەهۆڵ .
5 ـ کوانوو = ئاگردان .
6 ـ ئاوەزێ = زەویەکی ئاو لێ هەڵقوڵیو بە بارانی زۆر .
7 ـ بای دارئاووس = بای گژیکە کران بە درەخت .
8 ـ شنگ ، هەڵەکۆك ، گێلاخە ، پیشۆك = گیای بەهارن کە ئەخورێن .
9 ـ لەیلاخ = کوێستان .

# پێنج خشتەکی لە سەر هەڵبەستێکی حاجی قادر

یەزدانی تاك‌و تەنیا سەتتارو کرد گاری
بێ‌عەیبی عەیب ئەپۆشی کردگارو سەتتاری
ئاگا لەحکمەتت کەس بێ‌کارو هەم بەکاری
ئەی بێ‌نەزیرو هەمتا هەرتۆ کەبەرقەراری
بێ دارو بێ دیاری بێ دارو پایە داری

لەکارو کردەوەی خەڵك لە گێتی گشت ئەزانی
لەکارو کردەوەی تۆ مەحالە کەس بزانی
لەگەورەییت چ‌کەس‌بێ نەزانە گەر نەزانی
بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی خەزانی
بۆمەزرەعەی فەقیران سەرمایەکەی بووهاری

رەببی الاهي هەرتۆی خلاق‌و بەرزو ئەعلەم
بەآیەتی «لم‌یلد» و «لم‌یلد» بێ قەسەم
چاکەو خەراب ئەنووسی بەبێ زیادو بێ کەم
بۆ پادشا نیشانی بۆ هەر سەوادی ئەعزەم
بێ‌سەدرو شان‌و شینی بێ‌پەردە پەردە داری

یەك بەرز ئەکەی یەك ئەخەی پێشی ئەدەی سەبووری
فەرقی‌نی‌یە لە لای تۆ زرەك نزیك‌و دووری
قەبوول ناکەی لەهیچ کەس زولمو زۆرو غورووری
جباری‌بێ فتووری سولتانی بێ‌قصووری
رزاقی مارو مووری آودێری دێمەکاری

نازانی هیچ نەزانە بەشەر لەم هات‌و چۆیە
نەقسە بۆغەیری ذاتت ئەوەی کەڕای لەخۆیە
صانع نی‌یە لەصنعت بگا هەبێ درۆیە

پیرۆزەی تەختی گەردون مصنوعی نەفشي تۆیە
یاقوت‌و لەعلی رۆژە ئەستێرەکان دووراری

بەغەیری ذاتی پاکت هەموو دەبێ بەفانی
ئەوی هەبێ لەدوونیا نی‌یەو نابێ ئەمانی
ئەمنو ئەمان نەمانە بۆتۆ نی‌یە نەمانی
جێگاو مەکانی تۆیە بێ‌جێ‌یو بێ‌مەکانی
لەیل‌و نەهاری تۆیە بێ‌لەیل‌و بێ‌نەهاری

هەموو موحتاجی تۆنە مەلەك چ جن چ آدەم
ئەتۆ موحتاجی کەس نی حاشا لەهیچ کات‌و دەم
بەغەیری تۆبەتاڵە ئەتۆی کەریم‌و ئەکرەم
هەر ئەمری تۆمەدارە بۆکارو باری عالەم
هەرچەندە بێ وەزیرو بێ‌سەدرو کاروباری

« کُنْ‌فیکنْ » کە ئەمرت فەرموو ئەبێ بەیێك آن
تێکی ئەدەی دەس بەجێ رووس‌و فرەنگ‌و یابان
چ ڕووداوێ ڕووبدا بە ئەمری تۆیە قوربان
سەحرا نەوەردی شەوقت خورشیدو ماهی تابان
دوو جاریان شەوو رۆژبێ مەحمەل‌و عماری

دەرد دارو بێ‌دەوامە ئەتۆ دەرمانی دەردی
لوتفت بۆخاص‌و عامە کەسەیر ئەکەم بەووردی
(بێ‌بەش) و بەش خوراوم مەردم ئەڵێم بەمەردی
معلوومە بۆچی حاجی مەدحت ئەکا بەکوردی
تاکەس نەڵێ بەکوردی نەکراوە مەدحی باری

# ماچی مەرگ

جەلال مەدحەت خۆشناو
هەولێر 10 / 1 / 1983

شیرینەکەم ...
چەند لەمێژە
هەوڵ ئەدەم و نات گەمێ
لەم ڕێیە دوور و درێژە
هەر بۆ تاوێ هەر بۆ دەمێ
پارووم نەداوە لە جەمێ
ئای دەت زانی ...
ئارەزووی ئەم دیوانە گێژە
راموسانە لە ڕووی شەمێ !
شیرینەکەم ...

دەورانێکە بە تەمای تۆم
لە پێناوت دێم و دەڕۆم
کەپرم بۆت کردوە لە ڕەیحان
بۆ جێی ژووان !
تریفەی مانگم گرتووە
بۆ هۆنراوەی کەزی خاوت !
پەلکە زێڕینەم ڕستووە
بۆ ڕتووشی ئەبرۆ و چاوت !

بۆ ماچی تۆ ، تەما نابڕم
وەک باڵندە بەدوای دەفڕم
هەر چەندە زریانی لا ڕێ
دەردەسەریم بۆ بهێوێ
بەهارێک دێ
هێلانە بنێمە سەر لێوێ !
شیرینەکەم ...
ئای دەت زانی
چەندە خەمخواری تەشی تۆم
چەندە بە ژانی خەشی تۆم
چەند هۆگری باوەشی تۆم !

شیرینەکەم ...
خۆشەویستیم لەم هەرایە
وەک تونێلێکی ڕەش وایە
سەراپای گەردوون هەرلووشێ
زەریای حەزت خڕ بنۆشێ
هەرگیز تینوویەتی ناشکێ !
هەر چەندە خۆی کردوە بە سێو
تەما نابڕێ لە ماچی لێو
بریا ئەم خەونەم وەبایە
دڵەم بخەوێ بێ لایلایە
خۆزگەم ، کاشکێ !
شیرینەکەم ...
لیرانەدا

لە ناو لانەی شێرانە دا
دڵەی حەزی گەورەی ساوا
بە ماچێك دەبێ بە زاوا
با ناحەزی خەوتووی گوێی گا
بۆ خۆی بە با کات کەونە کا
دەبا لە ڕێی ڕاستی لادا
شان بلەقێنێ و سەر بادا
کەچی ئێستا لەسەر داوا
دڵداریکی کۆرپەی بە جەرگ
درنەگەی گرتووە ، ئاوا
بۆ ماچی مەرگ ....
مەمکی دایکی خۆی بەر نادا
هیچ بەر نادا !!!

# سێ تەڵ سەرنج

کاکەی فەللاح

(1)

ئەستێرەیەك
لە ئەستێرە گەشەکانی
ئاسمانی خۆشەویستیەك
گوێم لێ بوو سکالای ئەکرد
جارجارە بە مانگی ئەوت :
بۆچ وەك ئەستێرەکانی‌تر
تریفەی زۆرم نادەیتێ و
- تیری گەشەی خۆتم ناکەی
مانگیش ئەیوت:
پیش ئەوەی لەدایك ببن
لەناخی دلسۆزی منو
خۆشەویستی‌ی بێ سنوورا
چەن مرواری‌و گەوهەرێ بوون
یەك لەدوای‌یەك
هەر وەکوو یەك
رووناکی‌ی خۆمم پێدان‌و
خەڵاتی ئاسمانم کردن
تا گەش بن‌و بجریوێنن

(2)

لە خەوما باخەوانێ بووم
باخێکی بچکۆلەم هەبوو

# بۆ سکاڵای یارە دێرینەکەم..!

مدحت بێخەو

1983 / 6 / 5

یاری دێرین
سەرچاوەی سروش و ئەوین
لەبیماریت ئاگادارم
بەسیە ناڵە
بەسیە سکاڵاو زویری
ئەی مایەی ژین

تەمەنێکە تیمارکارم
ئالوودەی داوو دەرمانم
گیرۆدەی ناو دەردوژانم
هێندە بەرازت ئاشنام
تەنانەت هەست بە ئازارو
ناڵەی بێدەنگیشت دەکەم

لە پێناوت لە سووتانم
زامەکانت هێندە زۆرن
یەکێ نیەو پێی بوەستم

دیدەو گۆناو هەنیەی بەرزت
واشێواوو ئالۆزاون
چۆن بیانخەمە هەڵبەستم

* * *

یاقووتی خۆڵ و دۆواوی
بەسیە ناڵە
بەسیە زویری و سکاڵا

یەکێ لەشەتڵە کۆرپەکان
ویستی بەجیمان بهێڵێ
رووی تێ کردم :
ـ تۆ ئەڵێی چی ؟
ـ گەر ئەزانی، هەواری نوێ
سەوزیی و بەرزیی و گەشەی پێیە
مەیلی خۆتە، وا بەجێیە
ئەویش کە لێکی دایەوە
زانی هەڵەت و رەقەنە
لە باخەکەی خۆی مایەوە

(3)

رۆژێ لە کەناری چەمێ
گوێم لە شەپۆلێکی ورد بوو
بە خورەی ئاوەکەی ئەوت:
ناتوانی وەکوو من مەنگبی؟

وا بێ دەنگ بی؟
خورەش وتی:
ئەگەر وابم
شایستەی ناوەکەم نابم
ئەگەر خەو بچێتە چاوم
ونی ئەکەم دەنگو ناوم
شەپۆل وتی:
نەخێر کە ئەگەینە دەریا
کە لەوێ کۆ ئەبینەوە
گەورە ئەبین
هەرچی هێمنی ی دنیایە
تاوێتەی ناخی دەریایە
هەرچی جوانیی و پیرۆزییە
لەوە دایە
بەو مەزنیی و تەوژمەوە
هاژەی نایە

لەگەڵ خوێنم تێکەڵاوی
زویر بوونت ..
پەرستنت پتر دەکا
لەم دەروونە هەلقرچاوە
بەسیە ناڵە

لەوزە بەدەر بۆ چارەت هەوڵم داوە
بۆ خزم و هاوڕێ و دڵداران
هانام بردوەو هێناوە
وەکو باران ..
ئارەق .. فرمێسکم رشتوە
تامی گوژارکم چێشتوە
خەو لەچاوانم تۆراوە ..
بەڵام ئەی یار
بۆ دەردەکەت من بڵێم چی
کە پزیشکان
راچیتەیان پێکتر ناچێ و جیاجیان[1]
هەریەك لە ئاشێ لێ دەکاو
ئازمۆنگەکانیش هەر ئاوان[2]

ئەی پزیشکان گەلێ نەنگە
یاری دیرینم هەروابێ
تاکەی چارەتان یەك نابێ
ئەی پزیشکان
داد لە دەستتان ..

(1) راچیتە = ئەو پسوولەیە کە پزیشك چارەی تیدا دەنووسی
(2) ئازمۆنگە = جێی شیکاری و تاقیکردنەوە = (مختبر)

پێشکەشە بۆ کاروان

## فەلسەفەی ئامۆژگاری

دەرس وەربگریت لەم ژیانانە
لەم نەوعە حاڵە لەم کردەوانە
کەس بە ئەلف وبێ ناگاتە ئامانج
هەزار فەیلەسووف بۆتە دێوانە
لەم ووتارانەم توزێ فام بکرێ
ئەزانرێ چی یە حوکمی زەمانە
دڵ بۆ بەخەفەت بزێ و بناڵێ
بۆ دائم کزبێ ئەم دوو چاوانە
بۆ ئەم دەستانە بێکار بوەستێ
بۆ ڕێگە نەبڕێ ئەم دوو قاچانە
بۆ ئەم کەللەیە پڕ دەماغ نەبێ
بۆ ئەم کوێرانە ، ئەم هەژارانە
ئەم پرچانە بۆ هەر بەتۆز نەبێ
کە خوێ جێ خوێ گرت بۆچی یە شانە
بۆ لەبۆ ئەغیار قامەت خوار بکەین
خواری کەین بۆ یار کاری ئینسانە
بۆ بە لووت بۆن کەین بۆنی بۆگەنیو
بۆن مەگەر بۆنی گوڵ و ڕەیحانە
بۆ گوێچکە بدرێ بە قسەی بێتام
گوێ ئەعزاییکی پاک و جوانە
ئەم دەست و کەف و ئەم ئەنگوستانە
ئەم دان و دەم و ئەم دوو لێوانە
بە چاکی و پاکی بەکار بهێنرێن
دووا ناکەوین قەت لەم ژیانە
هەرشت بۆ شتێک مەگەر دانراوە
بێ سەبەب نی یە ئەم ڕووح و گیانە
ئەگەر هات شیعرێک پووختە دانەنرێ
ئەڵێن ئەم شیعرە زۆر بێ میزانە
هەموو شت لە ژین کێشێکی هەیە
ئەمەش تەجرەبەی شیعری (بورهانە) !

برهان جاهید

---

غریب پشدەری
قەڵا دزێ

## ووشەی زیندوو

ووشەکانم ...
هەموو تێکرا ، پشکۆی سوورن
هی ناگردانی ، شوانکارەی ...
لوتکەی دوورن .

ووشەکانم ...
هەورە تریشقەی بەهارن
لەگەڵ گەواڵە بارانی ...
بەهاراندا ، دا دەبارن .

ووشەکانم ...
لافاوێکی بێ بەستێنن
کەنار ، خۆیان بۆ ناگیرێ ..
بی وەستێنن .

ووشەکانم ...
گەردەلوول و ڕەشەبایە
کام چیا ، ئەستەم و سەختە
دەروەستی ، هاتنی نایە

ووشەکانم ...
کەوی سرک و تۆرەوانن
بۆ هیچ کەسێ ، ماڵی نابن
فێری ، ڕەوەزو کوێستانن

ووشەکانم ...
ڕەگ و ڕیشەی دارەبەنن
فێرە ژیانی ئەستەمی ...
ناو ، لێرەوارو بەندەنن .

ووشەیەك ، ئاوا ڕەسەن بێ
هیچ زستانێك ، نای تەزێنێ
ووردە تۆوی ، کێڵگەیەکن
هەر زیندووەو هەر دەمێنێ .

---

## دڵم دەکەم بە مەنزڵگەت

لە دوورەوە خۆشم ویستی
شیرینەکەم وا تێ نەگەی کەدوورم لێت
چوونکە گیانە .. ئەگەر ساتێ دڵی وێڵم
دووربێ لەباڵای شیرینت .. شێت ئەبم شێت
دڵم ڕووباری ئەوینە ..و
هەموو شتێ جێ دەهێڵێ هەرتۆ نەبێ
بۆت دەگەڕێم .. گەر میان کوێستان
چیا ، سەرا ، ڕوبار ئاسمان
بەشوێنتا دێم .. ئەگەر دەستم ،
لەهیچ شوێنێ نەگەیشت پێت
وەکو جاران
لە گلێنەی چاوی خۆما بەدیت ئەکەم
وەکو جاران
تۆ دەبیتە سوورە ماسی و ..
ناخی دڵم دەبێتە جێت !

مستەفا گەرمیانی
کەرکوك
1988/8/22

# کاروانە ڕاناگیرێ

دەڕۆین ، دەڕۆین
سوێند بە شەهید
سوێند بە مێژوو
سوێند بە ئازارو مەینەتی
یادگارەکانی ڕابردوو
سوێند بە پرچی ئاڵۆزاوی
دایکی غەمگینی نیشتمان
سوێند بە قاقۆڵی تۆزاوی
گشت منداڵە هەتیوەکان
سوێند بەم پەیامە پیرۆزەی
بڕوامان پێیە بە ڕاستی
سوێند بەوانەی وەکو ئێمە
ئاوارەن و وێڵن بەدوای
هەناسەیەکی سەربەستی !

-***-

دەڕۆین ، دەڕۆین
هەموو پێکەوە سوێند دەخۆین
هەر بە یەك دڵ
هەر بە یەك دەست
هەنگاو بنێین بۆ پێشەوە ..!
ئازایەتی و
مەردایەتی سەرکەوتنمان
وەدی بێنین
چرۆ بدا
لەیەك چاوگەو یەك ڕێگەوە ..!

باپەیمان بێ منداڵەکان
گەر هاتینەوە بۆ لاتان ....؟
یەك یەك هەمووتان بگرینە
سینگ و باوەش
لەکەناری جۆگەلەی خوێن ...؟
لەیەك سەنگەر ...!
دەچنین نێرگز
دەچنین گوڵ و هەلالەی گەش ..!
دەخەینە سەر
گۆڕی شەهیدێکی بێناو
لەڕێی گەل و خاکی کوژراو ...!

-***-

دەڕۆین ، دەڕۆین
بەدڵێکی گەشی زیندووی
پڕ کڵپەو گڕ
لەسەر خاکێکی بەپیتی
پڕ لەهیواو بیرو باوەڕ .
دەزانین ڕێگامان هەمووی ..؟
پڕ کۆسپ و هەڵدێرو دژە ..!
قۆناغی کاروانمان دوورە
تەم و مژە ..!
بەلام ئێمە بڕوامان هێندە بە تێنە ...!
هەر دەیبڕین

ئەم قۆناغە ناهەموارە
لێمان ڕوونە هەر دەگەینێ
نامێنی بەردە تراوێلکەی
سەر سنووری
نێوان ئەم گوندو ئەم شارە ...!

-***-

دەڕۆین دەڕۆین
دوێنێ کەشۆڕە سوارێکمان
لەکاروان ڕۆیی و دابڕا ..!
کێوی ڕووخا
ئەستێرەیەك لە ژیانی
ئەم نەتەوەیە داڕژا ..!
دەی کوڕینە ..!
ڕۆژ درەنگە ئێوارەیە ، بێ هەڵگرن ..!
لەپێش کاروان ، (حاجی ) و (خانی)
وا بە تەواوەتی مردن ..!
هەتا زووە ...
هەڵەت بەرن
خۆر بکەینە تاجی سەری
کلۆرانی ساڵەهای پیرەدار بەڕوو ..!
صەد خۆزگە دەماندی کە چۆن ...
شەهیدەکان یەك یەك هەموو ...
زیندوو دەبوونەوە لەگەڵ ..!
گڕی نەورۆز ، گیانی مێژوو
گەر مرد یشین
ئەی برایان ، ئێوە زیندوو ..!

جیهانی چیرۆک

# تەنها حەوت هەنگاو

عەبدولا ئەحمەد ساديق

هەرچەند تیغی هەنگاوەکانم ملی ئەو شەقامە بە چەند هەنگاو دەبڕێت ئارەزووی ژماردنی هەنگاوەکان لە مێشکمدا گینگلە دەدات « یەك ، دوو ، سێ ، ... ، ... ، ... ، ... ، حەوت » سەرجەمی هەنگاوەکان لەشۆستەی ئەمبەر تا ئەوبەر حەوتە ، تەنها حەوت هەنگاو ، ئارەزووی سەدان جار ژماردنەوەی ئەوان بەهێزترە لە بێزاربوون و ماندوو بوونی لەشە لاوازەکەم .

حەزی کەم کردنەوەی ژمارەی هەنگاوەکان مەلیکەو بەرەو گۆرستانی ڕەحیم ئاوە باڵە فرەدەکەن ، ئەم حەزەم تەنها جارێك هاتەدی کاتێك فراوان کردنەوەیان هەست پێ کراوبوو ، ژمارەی هەنگاوە گەورەکان تەنها چوار هەنگاو بوو چواری گەورەو حەوتی ئاسایی بەهەشت و دۆزەخ لێك دادەبڕێنێ . لەگەڵ ماڵ ئاوایی کردنی دوا هەنگاو تیشکی ڕوناکی لە دەرگای تاریکی دەدات و خۆی دەکوتێتە ژوورەوە جیهانی بەهەشت بەخێر هاتن لە تەماشاکەرانی پێشانگای شەقامە پاکەکانی دەکات ، لە تابلۆکانی ئەوێدا وێنەی ئۆتۆمبێلی نایاب و خانووی جوان و شەقامی پاك و کچی ناسك و نازدار بەرچاوی تەماشاکەرانی دەکەوێ کە حەزی هونەرمەندی تابلۆکان لە چەند ڕەنگێکی نامۆ جیهانێکی وای هێناوەتە کایەوە ، تەنها حەوت هەنگاو پێشانگای ئەو تابلۆ ڕێك و پێکانە لە جیهانی ئازار و تێکۆشان و جۆگە چڵپاوی گەورەتر لە خڕی خاسە لەیەك جوێ دەکاتەوە .

هەست کردنی دووریم لە حەوت هەنگاو لە بەختیاری هەتا هەتاییەوە شتێکی ئاساییە ، لام وایە گەر بێتو جارێکی تر چەقۆ لە ملی ئەو ڕەش مارە بنێم و بەرق و کینەوە بیکەمە دوولەتەوە ئەوا هەموو شتێکی کۆن کۆتایی دێت و هی تازەش دەست پێ دەکات . بەڵام ئاخ هەزار جار وەك تینووی چاو لە ئاو بە تاسەوە ئەو شەقامەم بڕی و لە ناسۆری و هەست بە نامرادی کردن بەولاوە هیچی ترم لە هەگبەی ئەم گەشتە سەختەمدا نەبینییەوە ، ئەوبەری شەقامەکە مۆسیقایە ، بەزمە ، خۆشی یە ئاهەنگە ، برسیەتی و هەژاری لەفەرهەنگی ئەوێدا ووشەی نامۆن و مانایان نی یە . « ئاخۆ دووری نیوان بەهەشت و دۆزەخ حەوت هەنگاو نی یە !؟ » بێ گومانم لەوەی کە کەمتریشە گەربێتو ڕاستەو ڕاست ملی ڕێگای ئەو بەربگریتە بەر ، کاتی بڕینی ئەم ماوەیە لە پێنج چرکە تێ ناپەڕێ هەر چوار چرکە دەبێت بەدوور لێ ڕامان و سەیرکردنی سەدەیەکی وێڵی پیویستە بۆ پەڕینەوە ، سەیرە حەوت هەنگاو تەنها حەوت هەنگاو سەدەیەکی پیویستە .

* * *

چاو پێکەوتنی یەکەم ڕۆژمان ، ئەوان هەموو پێکەوە بوون تەنها من نە بێت کە لە جیهانە نامۆکەوە بە نوێنەری ڕاستەقینە هەڵبژێرابووم ، پێکەوە دەدان ، ئازاری هەستی برینداریم لە جیهانی خەیاڵی بێ پایاندا بەرەو دەریایەکی ڕەش ڕای دەماڵیم . ئارەزووی دەست لە نێو دەست نانیان مەلیکی سپی بوو لە قەفەزی تەلبەندی شاپەڕەکانی قەلە ڕەشکەیەکدا فرەفڕی بوو ، ڕۆژی دووەم لە جیهانەکەی خۆمە وە پیرۆسکۆبی غەواسەی خۆمم لێخستەکار بەرەو چوار جیهانی تازە کە بەچوار مرۆڤ نوێنرابوون سێ کوڕو کچێ ، دوو کوڕی ئەسمەرو یەکیکی سپی کچەکەش هەرسپیبوو ، بەڕاستی جوانییەکی ڕوخێنەری هەبوو چاوم بڕی یە چاوی هەستی ڕوخانی کۆنە قەلایەك لە ناخەوەمدا دەستی پێ کرد ، ئاوێنەی دەروون وورد و خاش بوو ،

بینین تێ‌ی‌دا بوو به ستەم ڕۆژی دوایی دەرگــا شەق و پــۆق بووەکەی کۆنە جیهانەکەم کردەوەو بــەرەو پچڕانــدنی تەوقی دووره پەڕێزی کەوتمەڕێ .
هــەستانــە پێوەیــەکی دەوویست تانــوینەری بــەڕێــز دەست بەکارەکانی بکات و سەرەتا بکــەوێتە دووان . ڕاڕایی و دوودڵی تەنگیان بە ناخەوەی جەنابی هێنابوو بۆ ڕزگاربوون لەو دێوە زمانە یەکسەر ڕووم کردە کوڕە پێست سپی‌یەکەو ووتم : -
( تاکەی ئێمە وابین ؟ بایەك بناسین » وەلامێکی هێمن بۆ ئەم پرسیارە چەکەرەی‌دا « من ناوم فریادە ... ئەویش کاروان ... ڕزگار ئەمیش خوشکە گزنگە »

گزنگ بەیانێکی ڕوونە ، هیوایە ، دەست پێ‌کردنی کاری جیهانی ئەمبەرەو مژدەی ڕۆژێکی تازەی لە ژێر باخەڵی‌دا شاردوتەوە ، بەیان حەزی کارکردن لەمبەر دەبزوێنێ کە هێشتا نووستن باڵی هێمنی بە سەر ئەو بەردا کێشاوە ، کارکردنی ئەمبەر بەردەوامە تا ئێوارەو ئێوارەش نامرادی‌و بێ بەشی میوانی ڕەش و ڕووتەکە دەکات و مژدەی دەست پێ‌کردنی ڕابواردن بۆ وورگ زلەکانی ئەو بەردەبات . لغاوی ئەسپی خەیاڵی گزنگم شــل کردبــوو ، پەنجەی هەرەشە بەرەو چاوی نا خەوەم دەچوو ، دەیقیژاند « تۆ ماف بیرکردنە وەی وات‌نی‌یە ... شتی ئەو بەر بۆ ئەمبەر یاساغە پێویستە گومرك بدرێت بە تۆش نادرێت نەکــەی کوڕە نەکەی بیر لەشتی‌وا بکەیتەوە ، گزنگ ئەو بەرەو تۆش ئەمبەر ئەو ئەوەو تۆش تۆ » . هەستی وێڵی باڵی ڕەشی ماتەمی بەسەر شانۆی دەروونداکێشا ، بێ دەنگیەکی قووڵ وەکو قوناغی سڕ بوونی ژیانی بۆق ڕایەخی خۆی ڕاخست .

بۆم دەرکەوت کە ڕزگار خەڵکی ئەمبەرەو حەزی نزیك بوونەوەم چەکەرەی‌دا بەلام ئەویش ئارەزووەکانی خــۆی لەوبەر تــوور کردبوو ، چەکەرەیان دابوو ، ڕەگ‌و ڕیشەیان بەزەوی‌دا چوو بووە خوارەوەو جیاوازی لەگەڵ ئەواندا نەبوو .
تێبینی : « فریاد زۆر حەز لەگۆرانی ڕۆژ ئاوایی دەکات گوێ لە ڕۆژ هەلاتی ناگرێت ، بە تەواوی پێچەوانەی منە ئەوەی ئەمەگی ڕۆژ هەلاتی پێوەنەبێ حەزی لێ‌ناکەم » « حەوت هەنگاو ، تەنها حەوت هەنگاو ببڕەو ببەرەگەشت کەرێکی نامۆی ئەو جیهانە .. بڕۆ .. بڕۆ مل بنێ‌و حەوت هەنگاو ببڕەو ڕیزە ماڵێکی ڕێك‌و پێك ببینە کەگەلای دارەکانیان لەسەر دیواری حەوشــەکانیانەوە پێش‌وازی لەگــەشت کەران دەکــات ، هێمنی‌یــەکی تــەواو ، تەنانەت دەنگی پشیلەکانیشیان نایەت »
وەکو باسیان دەکرد ئەوە ماڵی کاروانە ئەوەش ماڵی گزنگە پاش چەند هەنگاوێکی‌تر ئەوەش ماڵی فریادە بەڕاستی کــە تیشکی ئاراستە کراوی خانــووەکە لەچــاومدا جێگیــربوو لە نــاخەوە قاقاپێکەنیم بزەیەك کەوتــە سەرلێــوم بەرەبــەرە قاقــاکەنــزم دەبووەوە تابوو بەکوڵی گریانێکی بێ فرمێسك بۆ خەڵکە ڕەش‌و ڕووتەکە ، لە دڵی خۆمدا ووتم « هەقی‌یەتی گۆرانی ڕۆژ ئاوایی نــەبێت حەزی لێ‌نــەکات چــونکە ئــەم خانــووە لە ئێستگــەی تەلەفزیۆن دەچێت هەر بۆ ئەوە کراوە تیپە ڕۆژ ئاوایی‌یەکــان ئاهەنگی تیابگێڕن .

* * *

چاوێکم بە خۆمدا گێڕاو گەڕامەوە پێستی خۆم تەنها ئەوەندەم لەو ژیانە ڕاڕایە بۆ مایەوە لەکوێوە هاتووم ڕووی گــەڕانەوەم ئاراستەی ئەوێ بکەمەوە .

تەنها حەوت هەنگاو بکێشم‌و بگەڕێمەوە پێش سەدەیەك حەوت هەنگاو ئەمگەیەنێتەوە ســادەیی سروشت‌و ســادەیی مرۆڤ‌و ژیانی پڕ چــەرمە ســەری‌و تێ‌کۆشــان ، ئەو ژیــانەی کــە لە سەرەتاوە بۆم دانراوەو لێ‌ی ڕاهاتووم ، ژیانی ڕەش‌و ڕووتایەتی « بەبێ ترس حەوت هەنگاوەکەت بکێشە » .
لەسەر شۆستــەکە ڕاوستــاوم ، ئاوڕێکی دواوە دەدەم بینینی گزنگ ئارەزوویەکی بــەدی نەهــاتووە بێ‌پــەشیمانی و تــرس پێ‌یەکانت هەڵبێنەوە .
« ئــەوە یەك ، دوو ، سێ ، چــوار ، پێنج ، شــەش ، ئــەوەش هەرحەوتی » .
هەموو شتێ گەڕایەوە جێ‌ی خۆی ، سادەیی‌و ئازار ، هەرگیز لە کێشانی ئەو حەوت هەنگاوە پەشیمان نابمەوە بۆدوا جاریشە کە کێشام ئەو چەند ڕۆژەش بوو بەڕابــردوویەکی لە یــاد چووی تۆمار نەکراو لە دەفتەری یادەکانمدا .

**ئەیلو لی 1981**
**کرکوك**



جلیل محمد شریف

کەرکوك
١٩٨٣/٧

لەسەر سووچێکی ناو بازاڕەکەدا ڕاوەستابوو ، سەبەتەیەکی بەگونیە بەرگ کراوی لەشان بوو ... بەسەرکزیەکەوە سەیری ئەم هەموو خەڵکەی ئەکرد کەبەیەکدا ئەهاتن و ئەچوون ، هەریەکە بۆمەبەستی تاوی ئەدا . ناو بەناو شانێکیان لێئەدا ، یان هاواریان لێئەکرد (خەبەردار ... ڕێگەبدە) .. ناچار شوێنی ڕاوەستانەکەی ئەگۆڕی .

تەمەنی لە حەفتا ساڵ تێپەڕ بوو بوو .. شەرواڵو مرادخانیەکی پەرپووتی ڕەنگ کاڵەوە بووی لەبەر بوو ... لەبیری دێیەکەم جار کە گوندەکەی بەجێ هێشت و هاتە ئەم شارە ...

دەسی بەکرێکاری و حەماڵی کرد بەڵام بەرەبەرە توانای ئیشی نەماوبێ هێز بوو ... لەگەڵ ئەوەشا ئەم بازاڕە بوو بوو بەدونیایەکی تایبەتی بۆی نەی ئەتوانی پێی لێ ببڕێ .. خەڵکی دەستی یارمەتیان بۆ درێژ ئەکرد ...

«ها مامەکە بگرە» .. ئافرەتیکی گەنجی پرچ زەرد نانێکی بۆ درێژ کرد ئەمیش وەری گرتو خستیە ناو زەمبیلەکەیەوە «قەبووڵی بکا» شێوەی ئەم ئافرەتە بەگورجی شریتیخوا مێشکی بەرەو ڕۆژگاری ڕابووردوی گێڕایە دواوە . بەرە بەرە تەمو دوکەڵ لەسەر وێنەیەکی کۆن رەویەوە ... «ماشەڵلا خوایە چەند ئیشت جوانە» .. «کوتومت لە جاحێڵی فاتە ئەچێ .. بەتایبەتی سەرو پرچەکەی» دوای رەنجێکی زۆرو دڵداریەکی پاك . دوای ئازارو شەونخونیەکی درێژ توانی فاتە بخوازێ و ببێ بەخێزانی ... مام عەلی ئەوسا کوڕێکی تر بوو .. کەواو سەڵتەو فەقیافەی سپی هەر لەخۆی ئەهات .

بەپشتێنی حەوت ڕیزو خەنجەری دەبانەوە لەهەمو شایی و ڕاوو شکارێکدا ئامادە بوو دڵی بەدونیا خۆش بوو .. بەو بایە دەژیا کە لەلای فاتەوە دەهات . «ئەم هەموو بازاڕو ئۆتۆمۆبیلو حەشاماتە هەموو بەقوربانی خشتێکی کەلاوەکانی گوندی (ق) بن»

«خۆزگەم بەوسای کەهەموو خەمێکم چاوپێ کەوتنێکی فاتە بوو .. خوزگەم بەوسای لەگەڵ کوڕانی ئاوایی بەشەو کۆ ئەبووینەوە بۆ گەڕە لاوژەو کلاوێن»

هۆڕنێکی زلی ئۆتۆمۆبیلێك ڕایچەڵەکاند .. بازاڕەکە تا ئەهات چڕتر دەبو لەبەر چاوی .. بانگەوازی سەوزەو میوە فرۆشەکان ئەگەیشتە ئاسمان .

«هامامەکە» ... بە شێوەیەکی نیوەئاگا دەسی پان کردەوە ... دە فلس لەناو لەپی جێگیر بوو . دیقەتی دەفلسەکەیداو لێی ورد بوەوە .. بەرە بەرە چاوی ئەبلەق بوو .. دە فلسەکە بووبە نیگاریك چوار چێوە یەکی خڕی بەدەردا .. بوو بەوێنەی خەرمانێکی گەورە .. بوو بەدیکۆر بۆ نواندنی ئەو کارەساتەی پێش بیست ساڵ شێوەی ژیانی سەرە ژێر کردەوە .. ژیانی کرد بەبرینێك (نەزەر ئەبێ و نەدەر ئەبێ) ناو بەناویش دەکوڵێتەوە .

«شەنەبام دەکرد لەسەر خەرمان کاتێ فاتە بەهەڵەداوان هات بۆلام ... هاوارە زووکە با دەربازبین ... ئاوایی بەجێ بهێلین .. خەڵکی هەموو بەرەو ژوور بۆی دەرچوون هەموو ڕایان کرد ... لەسەر خەرمانەکە هاتە خوارەوە پیلی فاتەی گرتوو ئیتر ئاوڕی دواوەیان نەدایەوە .

«ئێستاش نەم وێرا جارێکی تر سەرێ لە کەلاوەکانی ئاوایی بدەمەوە ...

ـ ها خاڵۆ خێرم کردوە ئەم نانەم لێ وەرگرە .. !

کەماڵ سەعدی
1983/1/2




هاوینێکی دوورو درێژ چاوەڕوانی پێگەیشتنی باخچە ساواکەیان بوون ... هەموو ئێوارانێك باسی هاتو نەهاتی‌ یی ساڵەکەیان دووبارەو سێبارە دەکردەوە .. هەتا وەهای لێهاتبو منالانیشیان لەجیاتی لای‌لایە بەم قسانە خەوەکوتکەیان دەبردەوە ...

باخچۆڵە پێگەیشت ... هەموو بەیانیانێك کە بەرەو باخچە خنجیلانەکەیان دەچوون بۆ لێکردنەوەی بەروبومە پێگەیشتوەکەی دەیاندیت ئەو شتەی بەکەڵکی خواردن دێت لێکراوەتەوەو پێشێل کراوەو ئەوەی بێکەڵکیش بێت دەستی لێنەدراوە . تەنانەت ئەوشفتیانەی کە لەژێر لیم شاردرابونەوەش ، سیخوڕی بەدفەڕ خۆیَ گەیاندبوویەو لەت و پەتی کردبوون ....

ئەوەی بەدەستەوەمابوون ، تەنیا کودووە ئاویە پایزیەکان بوون کە تورولەیان وەکو لاولاوە باوەشیان بە تاشەبەردەکانی ئەو قەدپاڵەدا کردبووو بەرەو لێواری ڕووبارەکە درێژ ببونەوە ... باس باسی ئەوبوو کەساڵەهای ساڵە ئەم ئاواییە شتی وای بەخۆیەوە نەدیتووەو ... لەوانەیە بە پنجێکی خێزانێك بحەسێتەوە ... کەچی ئەوانیش گوڵیان دەگرت و هەڵدەوەڕین .

زۆرجاران دڵی خۆیان دەدایەوەو دەیانگوت :

- بەری سەرەتا بۆ هەڵوەرینە ... دوواییەکەی باش دەبێت . کەچی هەتا وای لێهات گوڵ گرتنەوەکەشی بەخۆیە نەدیتەوە .

ئەم هاوینە لەم باخچەیە زیاتر هیچی تریان شك نەدەبرد بۆ دابین کردنی پێویستیەکانیان لە تەماتەو میوە بۆیە پێویستی بە بیرکردنەوەیەك هەبوو .

شەوێك بڕیاریاندا کە بچنە ناو باخچەکەو لە ژووانی هاتنی سیخوڕبن .

بەپەلە نانی ئێوارەیان خواردو بەرەو زەوی نزار کەوتنەڕێ هەر کە گەیشتنەجێ ، چاڵێکیان لەبەردەم دەرگای پەرژینی باخچەکەدا هەڵکەندو بەپوش و دڕك و داڵ سەریان گرت بەهیوای ئەوە کە سیخوڕەکە لەکاتی هاتنەوەیدا بکەوێتە ناوی ئەوانیش بەداربکەونە گیانی و تۆڵەی ئەم زیانە زۆرەی لێ بکەنەوە . خۆ کوشتنی سیخوڕیش خراپ نیە ، گۆشتەکەی خۆشە .. ماوەیەکیش بوو گۆشتیان نەخواردبوو ، چونکە تەنیا چوار سەر ئاژەڵی شیرداری بێچودایان شك دەبرد ، ئەویش لەبەر ماستو پەنیرەکەی دەستیان لێی بەرنەدەبوو ... خۆڕاوشکاریش .. ئەوا ئەم ساڵیان پیاوەکانی ئاوایی خولیای چەلتووك چاندن ببوون و بەلای ڕاووشکاریەوە نەدەچون .

بیری ئەم شتانەیان دەکردەوە ... شەوێکی سامناك بوو ، لوورەی گورگو قیرەی بومەو خوڕەی ئاوو خشەی گیاو گوڵو خشپە خشپی کەروێشکانیش تێکەڵ بەیەك ببون و شەویش هەر نەدەبڕایەوەو پلکە ئایش و بایزی کاکەبراش لەناو کەندەلانە تەنگەبەرەکەی بنار پەرژینەکە خۆیان خزاندبووە باوەشی یەکترو بە هەردوو دەست مێشولەیان لەدەم و چاویان پاس دەکرد ... ئەم شەوەیان هەتا بەیانی خەو نەخزایە چاویانەوە ... ئاسمان تاریك و ڕوون بۆوە . وەکو سیخوڕ شتێکی زانیبێت لە ژووان گرتنەکەی پلکە ئایش هەر بەم لایەشدا نەهات . بەناهومێدی گەڕانەوە ئاوایی .

هەرچۆنێك بێت ئەم ڕۆژەشیان بە بژارکردنی تووتنەکە بەسەر برد ..

خۆ سەرئێشەی تووتنیش لەمەسەلەی سیخوڕەکە پیسترە ... هەمووو ڕۆژێك بۆڵەیان بوو بە دەست مام سۆفی لەسەر بەردانەوەی جۆگەی کانیاوەکەی ژوور باخچەکەی مام سۆفی .... تووتنەکە هەتا بڵێی سەوزو جوان و گەلاپان بوو ، بەلام تۆ بڵێی لەکاتێکی وادا ئاویان لەسەر نەگرنەوە کە ببێتە هۆی ووشك بوون و تیژبوونی تووتنەکە ؟ ! ئەمەشیان هەر خووا بەخۆی دەزانێت . چونکە مام سۆفی بیانووبە تڕی خۆیەوە دەگرێت .

ئێوارە داهات ... پلکە ئایش و بایزی کاکەبرا نانەکەیان خواردوو دووبارە بەرەو باخچۆلانەکەیان کەوتنەڕێ ... بەلام ئەمجارەیان سەگەبۆرەیان لەگەڵ خۆدابرد .. سەگە بۆرە مەگەر بێچوی بەشکۆ نەبێت ، نێچیر لەدەمی شێر دەردێنێت .

بەم شێوەیە خۆیان گەیاندەجێ و کەوتنەوە چاوەڕوانی .

پلکە ئایش ڕووی کردە بایزی کاکە براو پێی گووت :

- ئەگەر ئەمجارە سەگەبۆرە سیخوڕەکەمان بۆ بگرێت بەیانی

خواردنی گۆشتیشمان دەبێتوماڵی ئاواییش لەم خواردنە خۆشە بێبەش نابن .... خۆ ئەم دوومانگەی ماویشە بەشی خواردنمان تەماتەو گندۆرەو کوودو شفتی پێ دەگات .

ئەستێرەکان ئاسمانیان تەنی بووەو چاوەڕێی دەرکەوتنی مانگ بوون . پلکە ئایشیش خەو چاوی دەبردەوە نەرمەباوشکی دەهاتێ ... لەناکاوێکدا سەگەبۆرە لوورەیەکی لێوەهاتو خۆی هەلکوتایە ناو باخچەکەو کەوتە حەپە حەپ ... پلکە ئایش ڕاچلەکی ، دەتگوت لە حەوت باری خەودابووە ... دەستی دایە دار بەڕووە مەترەلۆزەکەی تەنیشتیو بایزی کاکە براشی بە ئاگاهێنار بە دووقۆلی کەوتنەگیانی سیخوڕەکە . حەپە حەپی سەگە بۆرەش ئەژنۆی سیخوڕی شکاندبوو .

زۆری نەمابوو ئاسمان ڕووناك ببێتەوە ... سەگەبۆرە خۆی لە سیخوڕەکە کێشایەوە بۆ ئەوان بەجێی هێشت . سەگەبۆرە زۆر ڕاووشکاری پێکرابوو بۆیە شارەزاییەکی باشی وەرگرتبوو ، نەی دەویست گۆشتەکەی پیس بکات ... بەلام هێندەی پێنەچوو سیخوڕی بەدفەڕ تامێزی لە گیان دابوو خۆی ڕاشەقاندو پەڕێکی تیژی لە پلکە ئایش گرتو بە باڵەشۆڕەی خستو بۆی تێ قوچاند . هەرچەند لەبەر ئێشو ئازاری قۆڵی ئۆقرەی نەبوو بەلام قەت ڕزگاربوونی ئەم نێچیرەی لەبیرنەدەکرد . بایزی کاکەبراش زۆر خەمگین بوو ، بەزامدار بوونی دایکی ، بە خەمناکیەوە بەدایکی گووت :

- قۆڵێکیشت لەسەر داناو هیچیشمان بە هیچ نەکرد !

پلکە ئایش بەزەردە خەنەیەکەوە :

- ئەوەی ئێمەویستمان هاتەدی ، تەنیا لەخواردنی لاشەکەی بێبەش بووین .

بایز بەسەر سوڕمانەوە :

- چۆن دایکە گیان ؟

پلکە ئایش لەکوڕەکەی هاتەپێشو دەستە زامدارەکەی خستە سەرشانی بایزی کاکە براو پێی گووت .

- کوڕم زامدار بوونی قۆڵم بەفیڕۆ نەچوو ! بزانە هەتا ئەم هاوینە دەبڕێتەوە جارێکی تر شوێنەواری ئەم سیخوڕە نابینینەوە .... وامان لێنەدا وازوو لەبیری بکات .

باخچەکەشمان هێشتان ساوایەو بەبەریەوە ماوە ، گوڵی نوێ دەگرێتەوەو بەشی هەر سێ ماڵی ئاوایی یەکەمان بەردەگرێت .



## چیرۆکی : ـ خەسرەو شاهانی

## وەرگێڕانی : ـ محمد حسن ڕۆژبەیانی



ساڵەکەیم لەبیر نییە، بەلام ئەو ڕۆژەی کەبیستم «مازیار»ی. هاوڕێم بە تومەتی سیاسیو ئاژاوە نانەوە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا گیراوە. سەرسام بووم. وەك ئەوەی رادیۆ بکەیتەوەو کوتو پڕ هەوالی ئەوەت گوێ لێ بێ کە دوێنێ سەعات دەی سەر لەبەیانی دوو کەسی خەلکی مەریخ بەخۆیانو کەشتیەکەیانەوە لەپایتەخت دابەزیونو بۆچاو پێکەوتنی وەزیری کاروباری ئاسمان ڕۆیشتن.. چونکە ئەوکابرایە بە هیچ جۆرێ ئاگای لە سیاسەتو سیاسەت بازی نەبوو، پچە پچی پشت پەردەی نەدەزانی، ئەشێ ئەوانی تر ئەم جۆرە کارانەیان هەبێت. بەلام «مازیار»ی هاوڕێم نەء.. ڕاستە نیشتمان پەروەر بوو، تا بڵێی نیشتمان پەروەر بوو، لە نیشتمان پەروەریەتیدا هاوتای نەبوو. لەگەل ئەوەشدا پیاوێکی سادەو دلپاكو بێ فڕو فێلو خۆش باوەڕو پڕهەستو گران بوو، نەك هەر خۆی، باوکی خوا لێخۆشبووشی لەنیشتمان پەروەریەتیدا بێوێنە بوو.. منو مازیار هەر لەمنداڵیەوە هاوڕێو هاوپۆل بووین. لە دەرسی جوغرافیادا ناوی چەندەها وولاتمان دەخوێندەوەو دەبیست، کەچی ئەو پێی دەووتم فلانی من لە دونیادا تەنها ناوی یەك وولات دەزانم، ئەویش وولاتە شرینەکەی خۆمانە، ئیتر چۆن دەبێ پیاوی وا بە توومەتی سیاسیو ئاژاوە نانەوە بگیردرێ؟. تەنها عەیبی ئەوکابرایە ئەوە بوو لەنیشتمان پەروەریەتیو هەستی نەتەوایەتیدا دەمارگیر بوو.

خۆمم گۆڕیو بۆ چاوپێ کەوتنی بەڕێ کەوتم، ووتیان نابێ: پاش سێ ساڵ بەندیی ئازادکرا، چوومە ماڵو هۆی گرتنەکەیم پرسی:

ویستی باسی خۆیم بۆ بکات، وتم پێویست ناکات نەك تەنها خۆت باوکی خوا لێخۆشبووشت زۆر چاك دەناسم. بڵێ بزانم

# هەستی نەتەوایەتی

هۆی گرتنەکەت چی بوو؟. خۆ تۆ لەو پیاوانە نەبووی؟. ووتی گوێ بگرە، سێ ساڵ لەمەوبەر شەوێ لەشەوان برادەرێك بە زۆر بۆ «بار» یێك بردمی. ناوی بارەکەم لەبیر نی یە، تا ئەو کاتە پێم نەکە وتبووە هیچ بارێکەوە، بەڵام کاتێ کە چووینە ژوورەوە بە شوێنێکی خراپی تێ نەگەیشتم، ڕووناکیەکی کز هەموو لایەکی داپۆشیبوو، مێزێکی خڕی وەکو حەوز لە ناوەڕاستی دانرابوو، چەند کەسێکیش ڕاوەستابوون و خانمەکانیش لەم لاو لەو لاوە عەرەق و بیرەو کۆنیاك و ویسکیان بە میوانەکان دەداو ئەوانیش دەیان خواردنەوە. دوو بیرەشیان لە بەردەم ئێمە دانا. تا ئەو شەوە بیرەی وا خۆش و بەتامم نەخواردبۆوە، لە سووچی بارەکەش هەندێ ژن و پیاو دانیشتبوون و بیرەیان دەخواردەوەو چرپە چرپیان بوو. سەرەتا وام زانی ژنی خۆیانە. لە هاوڕێکەمم پرسی :

- ئەمانە چۆن ژنی خۆیان بو ئەم جۆرە شوێنانە دەهێنن؟..

ووتی :- ژنی خۆیان نین، بەڵکو بۆ سەر گەرم کردنی پارەدارەکان لە بارەکەدا ئیش دەکەن، هەر کەسێ دڵی بیەوێ پارەی زیادە دەدات و یەك، دوو سەعات لە گەڵیاندا ڕادەبوێرێ. بابەتەکە پەیوەندی بەمنەوە نەبوو، ئیتر درێژەم پێ ی نەدا.. هەمووی نیو سەعاتی نەبرد بارەکە قەڵەباڵغ تر بوو، هەر پیاوێك کە دەهاتە ژوورەوە تەماشا دەکەم بیانی یە. ئەمە چی یە؟. ئەم هەموو بێگانەیە لە کوێوە هاتوون؟. پاشان بیرم هاتەوە کە ئێمە بە میوان پەروەر ناسراوین و ئەمانەش میوانی ئێمەن و پێویستە ڕێزیان لێ بگرین، هاوڕێکەشم ووتی پێویستە بە گوێرەی داب و نەریتی خۆمان میوانداریان لێ بکەین، کاتێ کە بینیم بۆمان پێدەکەنن و میهرەبانی دەنوێنن و ڕێزمان لێدەگرن، زۆر شادمان بووم، لەوە چاکتر چی دەبێ، سبەی کە بۆ وولاتەکەی خۆیان دەگەڕێنەوە باسی پیاوەتی و میهرەبانی و ڕاستگۆیی و بێفرووفێڵی ئێمە بۆ هاوولاتیانی خۆیان دەگێڕنەوەو بەچاکی و باشی ناوی وولاتەکەمان دەبەن، ئەمە خۆی لەخۆیدا جۆرە ڕاگەیاندنێکەو بەبێ ئەملاو ئەولا هەست و سۆزی ئەوان بەلای خۆماندا ڕادەکێشین من و هاوڕێکەم لە قسەی ئەوان تێ نەدەگەیشتین، ئەوانیش لەئێمە تێ نەدەگەیشتن، بەڵام خۆ زمانی نێو میللەتان ماوەتەوە. من بۆ ڕێز لێنانیان کەوتمە سەر لەقاندن و بەدەستیش پەرداخە بیرەکەم بەرز کردەوە، واتە بفەرموون !. ئەوانیش بەم کارە هەڵسان، واتە بە سەلامەتی یەکتری دەینۆشین، مزەپێکەنینیش سەر لێوانمانی داپۆشیبوو، پاشان ئەوان خەریکی ئیش و کاری خۆیان بوون، ئێمەش ئیش و کاری خۆمان، کە بێگانەکانم دەبینی وا بەبێ جیاوازی و بە میهرەبانی و دڵسۆزی و جۆشەوە ڕەفتارمان لەگەڵدا دەکەن، زۆر دڵشادو بگرە لە خۆیشم بایی دەبووم.

هەمووی نیو سەعاتی نەبرد، تەماشا دەکەم نووشتاونەتە سەر مێزە خڕەکەوەو بەدەنگێکی بەرز لەگەڵ یەکتردا قسە دەکەن، ئەوەی ڕاست بێ ئەم ڕەفتارەیانم بە جۆرێك لە بێ ئەدەبی و بێ حورمەتی بەرانبەر بە خاوەن ماڵ دانا. لەبەر خۆمەوە ووتم : ڕاستە ئێوە میوانن و ئێمە خاوەن ماڵ، بەڵام حورمەتی خاوەن ماڵ و ڕێزی میوان لە کوێ ما؟. بۆچی بەدەنگی بەرز قسە دەکەن؟. بۆ وا خۆتان بەسەر مێزەکەدا داوە؟. لە هاوڕێکەمم پرسی ئەمانە کوێندەرین؟.

ووتی :ـ نازانم . بەڵام بێگومان خەڵکی وڵاتێکی ترن.
منیش ووتم ئەوە دەزانم، مەبەستم ئەوەیە خەڵکی کام وڵاتن؟.
ووتی نازانم. بەڵام ئەم نیشانانەیان هەبوو، باڵا بەرز،
سپی‌ڕەنگ، موو زەرد، چاو ڕەش بوون. دەنگە دەنگیان زیاتر
بوو، خۆم ڕاگرت و بۆ ئەوەی لە بیری خۆمی بەرمەوە داوای دوو
بوتڵ بیرەی دیکەم کرد، ئنجا بەزمانەکەی خۆیان کەوتنە
گۆرانی ووتن و پێکەنین و زمان لێدەرکردنی ئێمە... ئەمە
چی‌یە؟. خۆ ئێمە شەڕتان لەگەڵدا ناکەین. ئیتر بۆ کاتمان لێ
تاڵ دەکەن و گاڵتەمان پێ‌دەکەن و زمانمان لێ‌دەر دەکەن؟. ئەمە
کاری لە هەستی نەتەوایەتیم کرد، بۆیە بە هاوڕێکەمم ووت
دەمەوێ منیش گۆرانی بڵێم. ووتی بۆ من و تۆ نەهاتووە
لەبەردەم ئەمانە گۆرانی بڵێین دەنگ هەڵبڕین. من زیاتر تووڕە
بووم. بۆچی بۆ ئەو بێگانانە هەیە لەسەر مێزی ئێمە گۆرانی
بڵێن و قڕە قڕ بکەن و بە ریشی ئێمە پێ‌بکەنن و ئەمە بۆ ئێمە نەبێ؟.

یا ئەوەتا بەوان بڵێ گۆرانی نەڵێن، یا هەڵدەستم و تێر تێر
دارکاریان دەکەم. یاخود ئێمەش پێکەوە گۆرانیەکی خۆماڵی
دەڵێین. ئەگەر تۆیش نەڵێی ئەوا بەتەنها دەیڵێم. ووتی نەء...
جوان نی‌یە، با بڕۆین، دوایی پێیان ناخۆش دەبێت.. ووتم، من
نایەم قسە هەزارەو یەکی بەکارە. یا ئەوان گۆرانی نالێن، یا
دەبێ ئێمەش بڵێین، ئەی ئیتر هەستی نەتەوایەتی و بەرپەرچ
دانەوەی کاری نارەوات لەکوێ ما؟.

ئێمە چیمان لەوان کەمترە. بۆ چی ئەوان لەماڵی ئێمە
ئاوازو گۆرانی خۆیان بڵێن و بەمست لەسەر مێزی ئێمە بدەن،
بەڵام ئێمە ئەو جورئەتەمان نەبێت، چی‌یە وەڵلا پێیان ناخۆشە.
ووتی ئێمە زۆر شتمان لەوان کەمترە.. کە ئەمەی ووت من زیاتر
دەمارگیر بووم و بەدەنگێکی بەرز دەستم بەووتنی گۆرانی
[[[ئەی خودا لەم ئاگر بارانە]]] کرد هاوڕێکشم هەستی
نەتەوایەتی هەڵساو لەگەڵ مندا دەنگی هەڵبڕی، کاتێ کە
هەستم‌کرد بەتەنها نیم، زیاتر فشەوە بووم، سەرەتا ئەوان هەر
مزە مزیان بوو. بەڵام کاتێ دەنگی ئێمە بەرزەوە بوو، ئەوانیش
زیاتر دەنگی خۆیان هەڵبڕی، ئەوان دەنگیان بەرزتر کردەوە،
ئێمە لەوان بەرزتر، ئەوان بەرزتر، ئێمە لەوان بەرزتر. ئەوان
ئاوازو جۆری گۆرانیەکەیان گۆڕی، ئێمەش گۆڕیمان، لەپڕ
یەکێکیان دەستی بۆ باخەڵی بردو نایێکی دەرهێناو دەستی بە
نای لێدان کردو یەکێکیش شان بەشانی نایەکە دەستی
بەگۆرانی ووتن کرد.

کاتێ کە نای لێدان و گۆرانیەکەیان تەواو بوو، من بە
تەواوەتی پەست و تووڕە بووم!. لە لایەکەوە تەماشا دەکەم
نەنایێم هەیەو نە دەشزانم نای لێبدەم، ناچار بەدەم ئاوازی
فیکە لێدانەوە ئەم گۆرانیە کۆنەم ووت:

**شیرینێ و شیرینێ و شەمامە**
**شەمامەی چوار بێستانی**

**بەژنی ڕێک و پێک و جوان**
**خەرمانی گوڵانی**

کە ئاوازی فیکەکە دەگەیشتە کۆتایی، فیکەکەم
رادەگرت و بە تەنهایی شیعری گۆرانیەکەم دەووت، چونکە
هاوڕێکەم شیعرەکەی نەدەزانی . پاشان دیسانەوە دەستم بە
فیکە کێشان دەکرد، کە تەواوم کرد، تەماشا دەکەم هەر هەموو
پێم پێ‌دەکەنن، یەکێکیان چووە دەرەوەو پاش چەند دەقیقەیەك
بە خۆیی و گیتارێکەوە هاتەوەو دەستی بە گیتار لێدان کردو
ئەوانی تریش بۆیان دەسەندەوەوە شتی ئەوتۆیان دەووت کە
تێی نەدەگەیشتم، نەم دەتوانی وەڵامیان بدەمەوە، بەڵام
هەستی نەتەوایەتیم بەسەر شۆڕی و شکستی رازی نەدەبوو،
بە هاوڕێکەمم ووت تا تۆ پەرداخێکی دیکەی بیرە دەخۆیتەوە من
دەگەڕێمەوە، ئیتر چاوەڕوانی وەڵامم نەکردو بۆی دەرچووم و
سواری تاکسیەك بووم و خۆم گەیاندە یەکێ لەو چایخانانەی کە
مۆسیقا ژەنەکانی خۆمان ئاهەنگی تیا دەگێڕن، بە «5» دینار
رازیم کردن بۆ ماوەی دە دەقیقە سازو ئاوازی خۆمانی
لێبدەن... ئەوان لەوسەری بارەکەوە، ئێمەش لەم سەرەوە،
کاتێ کەبینیان ئێمە سێ، چوار کەسی تەپڵ و تارو ویلۆن ژەنمان
هەیە .. دووانیان بە پەلە لەبارەکە دەرچوون و پاش چوار، پێنج
دەقیقە لەگەڵ دوو کەسی تردا هاتنەوە، کە یەکێکیان کەرەنا
لێدەر بوو، ئەوی تریشیان ترامپێت ژەن بوو. ئەو دووانە
دەستیان بەکەرەناو ترامپێت لێدان کردو ئەوانی تریشیان بە

هات‌و هاوار گەرمیان کرد.. ژمارەیەك لە هاوولاتیانی خۆمـان لێمان نزیك بوونەوەو کەوتنە هاندانمان، کەزانیم چەند کەسێکی ترم لێ بۆتـە پشت‌و پەنـا ئازاتـر بوومـەوە. یەکێکیـان ووتی: ئەی‌ئێستا چی دەکەی؟ بەهیچ جۆرێ نابێ سەریان بۆ شـۆڕ بکەین، دەبێ وەلامیان بدەینەوە.

بە یەکێکیانم ووت کە ئەشم دەناسی ئۆتۆمبیلت هـەیە؟ ووتی بەلێ.

ووتم تۆ لەگەلْ مندا وەرەو هەقت بـەسەرەوە نـەبێت. چونکە ئەویش هەستی نەتەوایەتی جۆشی خواردبوو، بەبێ سێ‌و دوو وەپێشم کەوت، ئەوانی ترمان بەجێ هێشت‌و دوو قۆلی بوی دەرچووین.

ووتی بۆکوێ بڕۆین؟ وتم:

هاوڕێیە کم هەیە جاران زوڕنا ژەنێکی بێ وێنـە بوو، ماوەیەکە وازی هێناوە، بەلام هێشتا بۆ یادگار کەرەستەکانی هێشتۆتەوەو ئێستا بۆلای ئەو دەڕۆین. بە ئۆتۆمبیلی کابرا تا بەر دەرگا ڕۆیشتین. لە دەرگامان‌دا، خۆی دەرگای لێکـردینەوە، بەچەند ووشەیەك باسەکەم بـۆی گێڕایـەوە، ئەویش لەبـەر ئـەوەی پیاوێکی دلسـۆزو نیشتمـان پـەروەر بـوو، هـەستی نـەتەوایـەتی بەرزبـوەو بەسـوپاسـەوە دەهۆڵ‌و زوڕنـاکەی پێ‌داین، ئێمەش لەچاو نووقانێکدا گەڕاینەوە.

ئەوان هێشتا بەکەڕەنا سروودی نیشتمـانی خۆیـانیان دەووت‌و هات‌و هاواریان دەکرد، گیروگرفت لەوەدابوو، کە هیچ کام لەئێمە دەهۆڵ کوتان‌و زوڕنا ژەندنمان نەدەزانی، بەلام خۆ بۆ ئەوان هیچ جیاوازی‌یـەکی نیە، هـەر وەك چۆن ئـاوازی کەرەناو ترامپێتەکەی ئەوان لای ئێمە بێ‌تام‌و ناخۆشە، دەنگی دهۆڵ‌و زوڕناکەی ئێمەش هەمان ڕۆڵ لای ئەوانی دەگێڕێ.

من دەستم بەزوڕنا ژەنـدن کردو پـەتی دەهۆڵەکـەش هاوڕێکەم کردی بەشانیداو کەوتە کوتان. ئەوان لێیان‌داو ئێمە لێمـان‌دا، ئەوان دەنگی کـەڕەناو تـرامپێتیان بـەرز کردەوە، ئێمەش زیاتر «با» مان بە زوڕناکەدا کردو توندتر دەهۆڵەکەمان کوتا. یەکێکیان کەزیاتر هەستی نەتەوایەتی بەرزەوە ببوو، بە پەستی‌و توورەییەوە توێکلە فستقێکی تێ‌گرتم‌و بەر ناوچەوانم کەوت، دنیام لەپێش چاو تاریك بوو، دەتگوت قورسـایی دنیا بەجاری کەوتە سەر سەرم.. تۆ بوویتایە چیت دەکـرد؟. ووتم نازانم.

ووتی زوڕناکەم لە قەراخ بارەکە داناو نیوە جگەرەیەك کە بەدەم هاوڕێکەمەوە بـوو گرتم‌و بـەرەو رووی تووڕم هـەلدا. وابزانم بەر چاوی کەوت، چونکە دەست بـەجێ بە دەستێکی چاوی گرت‌و بەو دەستەکەی تری پاکەتە جگەرە بیانیەکـەیی تێ‌گرتم هەقی خۆی بوو، منیش ووتم جێی مشت پێ‌لەقەیە، تەپلەکە جگـەرەیەکی شـووشەی گـەورە کەوتـە بەردەستم‌و بەهەموو پیسایەتیەکەی ناویەوە ئاراستەی سەرو سـەکوتیم کرد، سەری خۆی‌لادا. ئەگەر لای نەدابایە، هەر هیچ نەبوایە یەکێکیانم کەم دەکردەوە، ئیتر بە پەرداخ‌و بوتلە بیرە کەوتینە گیانی یەکتر، کاتێکم زانی دەنگی میل هێنانەوەی تفەنگ‌و تەق‌و تـۆقی گوللە بـەرز بووەو ژمـارەیەك لەو پـۆلیسانـەی کە بـۆ پاراستنی ژیانی ئێمەو یاسا لە شەقامەکان پاسەوانیان دەکرد، لە هـەراو هوریـای ئێمە بـەڕێوەبـەری بـارەکـە ئـاگـاداری کردبوونـەوەو هاتنـە ژوورەوە، ئێمە کـە چاومـان بە پـۆلیسی خۆمان‌کەوت هێزو توانامان دوو قات بووەو مارشی نیشتمانیمان دەووت‌و وەك نەڕەشێر هێرشمان دەبردو بەیـەکدا دەهـاتین‌و بەرەنگاری هێرشی ئەوان دەبووینەوە.

خوێن بەری چاومانی گرتبوو، خۆیشمان نەمان دەزانی چی دەکەین، دەمان کوتاو دەمانخوارد، هەر چیمان بەردەست بکەوتایە، کام لامان لێ نزیکترو حەواڵەتر بوایـە ئاراستـەمان دەکرد.. ئەوەندەمان زانی چوار دەورمان بـەپۆلیسی خـۆمان تەنراوە.!

... تەماشام کرد فـرمێسك وەکـو لافاو بـەچاوەکـانی. مازیاردا هاتنە خوارێ. بەدەم پرمەی گریانەوە دەیووت هـەر هـەموومـانیان گـرت‌و داوای لێبـووردنیشیـان لەوان کـرد. لەبەردەم ئەواندا قسەی ناشیرینیان پێ‌ووتین‌و کەلەپچەیـان کردین، ئەمە لەباتی ئەوەی ئەوان تەمێ‌و دارکاری بکەن.

پاشان ئێمەیان وەپێش خـۆیان‌دا. کـاتێ کە لە بـارەکە دەرچووین، هێشتا دوو، سێ هـەنگاو دوور نـەکەوتبـووینەوە دەنگی ئەوان بەرز بۆوە، ئەو گۆرانیەی کە دەیان ووت هەر لە مارش دەچوو. وەك بلێی سروودی سـەرکەوتن دەلێن. ئێمـە تێ‌نەدەگەیشتین.. خۆ ئێمە زمانی ئەوان نازانین...

# ژساشه‌ڤه‌كێ

**لقمان مصطفى محمد**
**- دهوك -**

راست لسه‌ر ملێ خوه زڤرى ، ره‌نگێ وى زه‌رو دامـاى بوو . ناڤ چاڤێت وى تێك‌چوون . له‌رزينه‌ك كه‌ته له‌شى ، وه‌كى هێزكا دارى لێ‌هات ژ ڤێ قاما جه‌هدێ دچوو قاما دى .
- ئه‌ڤه چ ديڤه‌لانكه به‌لا خوه ژ من ڤه‌ناكه‌ت ؟!
ده‌لنگێت خوه هه‌لدان كارێ ره‌ڤێ كر ، راست رابوو بده‌نگه‌كێ بلند گازى‌كر ، بدوو سێ پێلا ئاخڤتن ژ ده‌ڤى ده‌ركه‌ڤت .
- ئه‌هريمه‌ن بوو ..... ئه‌هريمه‌ن بوو ...
- كورێ من ناڤێ خودێ بينه ، ته چى‌يه ؟ ته ئه‌ز بزداندم ..
زانى ئێكى گول ده‌نگى وى بوو . خوه زوى خلاس‌كر . ئه‌ڤه‌ژى نه‌ئه‌وه يێ لديڤ من دهات .
- چ نه‌دايى ، ئه‌هريمه‌ن بوو ..
- ئه‌هريمه‌ن كورێ من چ ژ ته دڤيا ؟

نه‌دڤيا ترسا خوه دياركه‌ت ، به‌لێ ديمێ وى دره‌وا دگه‌ل كه‌سێ ناكه‌ت . وه‌سا دياره كو ترسه‌كێ يا خوه د لنگا ئالاندى . پشتى دوجا ستوهێ خوه باداى بو ڤرڤرا گه‌هێت ستوهێ وى . دا هزار سونيدا خوى ئێك پێ و پێ چوو سه‌رته‌به‌ڤا نانێ ته‌نكى . به‌زى هنده‌ك ئاڤا ته‌زى ڤه‌خار . هركره دخانى‌فه‌و ژور كره سێ پێنكاڤ . چوو سه‌ر جهێ خوه لحێفك كێشا سه‌ر خوه . دڤيا وێ ترسێ به‌رزه‌كه‌ت دكا ده‌يكا وى چ ژێ نه‌زانيت ڤورچه‌كا حێل لده‌رێ گه‌وريا خوه دا .
- دادێ چ زاد نينه ئه‌ز گه‌له‌ك يێ برسى‌مه ؟
- بسملا كورێ من ئه‌ڤه ته‌چى‌يه ؟ يا خودێ دا بو ته سه‌ح‌كه‌مێ

- نه ... نه .. ئه‌ز تێربووم . برسا من شكه‌ست .
لحێفكا خوه كێشا سه‌ر خوه ، پێت خوه برنه بن زكێ خوه ، خوه كره گولچك ، ما هزرێت خوه كرن ، هه‌ر جار بوو جارێ پتر يێ خوه تێك‌دبه‌ت . سه‌رێ وى دوو كـون‌زركێت‌كێت تێدا بڤێنـا وانه . « ئه‌هريمه‌ن بوو به‌لێ وى چ دڤيا ..... نێ ئه‌هريمه‌ن خوه دكه‌ته كچك‌و تێت مروڤى ... ئه‌ڤه زه‌لام بوو ... تودێ بێ‌ى يێ ژ جه‌هنه‌مێ ئيناى ده‌ر .... ئاخ ئه‌ڤ شه‌ڤه چه‌ند درێژبوو ، نه‌كو روژ نه‌هێت پاش .... پاش .. نه ... نه بلا هه‌ر شه‌ڤ بيت چنكو مروڤ ب شه‌ڤێ ته‌ڤنا رادچينيت .... »
- كورێ من گه‌له‌ك هزرا نه‌كه ، دخرابن .
چه‌ند بازێر تارى‌تر لێ دهێت ، پتر هزر لێ مشه‌دبن‌و دگه‌ل جانێ وى دكه‌ن « باشه ئه‌ڤ جيهانه يا چاوه‌يـه هه‌رشـه‌ڤ‌و روژن چدى‌نه ..... پا چ مفا تێدا هه‌يه مرن بيت يا ژين؟ چ مفا هه‌يه ... چ مفا هه‌يه » هه‌رێ خوه تێك‌دبه‌ت دا هزر ژێ ديركه‌ڤن ، به‌لێ چه‌ند ده‌رگه هه‌كێ بگريت ده‌هێت دى يێ ڤه‌دبن‌و تێنـه پێش چاڤا . گرمينه‌كا مه‌زن هات راست ژ ناڤ جها ده‌ركه‌ڤت ، لدور خـوه زڤرێ چـه‌ند پينگـاڤه‌ك هـاڤێتن رونـاهى‌يـه‌كێ خـوه ، دپه‌نجه‌رێدا هاڤێتێ ژور شه‌هده‌دا ناڤێ خودى ئينا ، ما به‌رێ خوه‌دا جهێ خوه . ده‌نگه‌كێ بلندتر هات . چاڤێت خوه گرتن خوه د جها ڤوتا نزانيت كا جيهان ده‌ه‌ژيت يان ئه‌و دله‌رزيت .
- ما ئه‌هريمه‌ن تێته پشت په‌نچه‌راو مروڤێ هشيار .
- نێ وێ هه ئه‌وه يێ به‌رى بێنه‌كێ من ديتى . ئه‌ز نزا بوچى به‌لا خوه ژ من ڤه‌ناكه‌ت .
- ئه‌ڤه چ قه‌ره‌بالغه ناهێلن ئه‌ز بوه خوه بنڤم .
بوو كرگرا عه‌ڤرا چ يێ وه‌سا پێڤه نه‌چوو . ده‌نگێ سركا بانى هات . بوو شرێنا ئاڤێ . ئه‌و مروڤ هه‌ر يێ لپێش چاڤا هه‌رێ چاڤێت خوه دگريت . ده‌ستێت خوه پێڤه‌دنيت ....
- به‌لا خوه ژ من ڤه‌كه .. ته چ هزروبير بو من نه‌هێلان .. دێ هه‌ره ژ پێش چاڤێت من ...
- دا بێى‌نه‌كێ بنڤم نڤستنا لبه‌ر ده‌نگێ بارانێ يـاخوه‌شـه . چاڤێت وى چوونه سه‌رێك . له‌شێ خوه ژێك راكێشا هه‌روه‌كى مارى يێ ده‌ركه‌فتى به هه‌تاڤێ ئه‌ڤه چه‌نده يێ كه‌ڤتى‌يه كونێ هه‌تاف نه‌ديتى‌يه لحێفكا هريێ يا ستوير بوو . دبن‌ڤـه خوهێ دابوو له‌شێ وى هه‌مى يێ كران بوو . روژه‌كێ ژ سه‌رێ بهارێ دگه‌ل يارا خوه چووبوو پشتا بازێرى يێ سـه‌رخوه‌ش بـوو د

دەریایێ ئەڤینێدا دەستێت یارا خوه دگرتن بدەنگەکێ بلند گازیدکر .

ـ ئو هەیڤی .... ئو روژی .... جیهان ....

یارا وی چاڤێ گلدای بەرهنگاری وی دکرن . بدلەکی پەرتی تیر دهاڤێتنە یارێ خوه . چەند جار ئاوازێت بلبلا ژ دەڤی دەرکەڤتن .

ـ ما هەکە هەیڤێ لبەرنەبن کەر بچەرن بوو چی یە ؟

ـ مانێ توکەوی ژبەر هندێ ، ئەز هەیڤمو ئەزا بهامە .

یێ سەرخوەش بووی د دەریایێ چاڤێت یارا خوەدا روژێ کەزیێت خوە ڤەهاندن ، دەهمەنێت خوە هەلاندن . کارێ چوونێ کر رێك دا تاریێ دا بسەر جیهانێدا بگریت هەردوو نێچیرڤانا قەستا مالێت خوە کر بدلەکێ پڕ کەیف و شاهی .

ـ جارەکا دی ئەز زڤریم ناڤ چار دیوارا بلا جیهان هەمی ژدە ڤەبا .... نەء .. نە باش دا ئەهریمەن هەمی گاڤا لدەڤ مروڤی بێت چ حال بو کەسێ نە دهێلا ..... رینشتە خارێ دەست دا پاکیتا خوە جگارەك ژێ ئینادەر .. بەرکێ ماکینێ خڕ پێڤە

خلاس کر هەتا شیای هەلکری . دیکێلێ خوە ژ دەڤ و دڤنا تاڤێتەدەرو بلندبوو . ما دیکێلێ فکری . ئاخینکەکا کیر راهێلا ژ سەرێ تبلێت پێ ی هەتا پورتا سەری ژ دەڤ و لیڤا پەش ( ئاخ دێ بلا هزرێت وی ژ شتی دیکێلێ ژ سەرێ من ڤڕیبان و چووبان ئەسمانا ) ژ دەریایێ هزرا دەرکەڤت ، دەما کو گول دەنگێ دەری بووی گەلەك دژوار هاتی .. راست رابوو سەرخوە بدنگەکێ پڕ ئێش وژان . چەند پەیڤەکێت پرت پرت ژ دەڤی دەرکەڤتن .

ـ ئەو کی یە ؟ هوییێ دژوار .....

ـ دەرێ ڤەکە .

ـ تو ..... کی ... تو ... کی ؟

ـ ئەز ئەوم یێ تە دگوتێ ئەهریمەن .

ـ تە چ دڤێت . تو هاتی چ ؟

ـ دەری ڤەکە دێ بێژم تە .

ـ دێ هەرە بەلا خوە ژ من ڤەکە . هەرە ... هەرە ... لەشێ وی ساربوو لدیف دەنگێ خوە هشیاربوو . راست قەستا دەری کر هێدی دەر ڤەکر . ئەیڤێ سەرێ خوە شەکربوو . پرچێ خوە ژ بەر پیا هەلاندبوو .. دەنگێ دیکلا ژ دویر دهات ..

**ئاسۆ عمر «سوارە»**

**سلێمانی**

**1983**

ڕێگاکەی کە هەموو ئێوارانێك پیایدا گوزەرمان ئەکرد ، ئەوە ئەم ئێوارەیە تەنها منی لەئامێزدا گرتووە ، هەست ئەکەم ئەو شەقامەی بەلای هەرچی یەکدا ڕائەبووری ، لەشەقامی ترو

کوچەو دارو پەردووی فرێ دراوی ئەوکەلاوانەی کەبەم لاولای شەقامەکەی وەك شمشێر کەرتی کردبوون ، تەنانەت ئەو خەڵکەش کەوەستانی ناو پەنجەرەی باڵە خانە کانیان کردبوە

خۆ ، که سەرنجیان ئەدام ئەبلەق بوو بوون ، واقیان وڕمابوو گەلێك پرسیاری وەك : ( بۆچی ئەوی لەگەڵ نی‌یە ؟! )

( تۆبڵێی تاوانی خۆی بێ یانەو ؟! ) لەقورگیانا گیری خواردبوو . منیش وورده ووردە بەملکەچی‌و ڕزەنیگای ئەو دیمەنە سەیرانەدا هەنگاوم دەنا هەرچەندە لاقەکانیشم بەدواما نەئەهاتن ، هەرچۆنی بێ گەیشتمە ئەوبن دارەی کە لە تەمەنێکی درێژی خۆشەویستیماندا بوو بوو بە دایکێکی دڵسۆزو هەمیشە لەئامێزی ئەگرتین ، تاتێر ووشەی خۆشەویستیمان بەگوێ‌ی یەکدا ئەچرپان . بەلام جێ‌ی ژوان ، ئەو جێ‌ژوانەی جاران نەبوو تابتوانێ نازی دڵشکستێکی وەك‌من هەڵگرێ ، گەلای دارەکە بەکزی‌یەوە خۆش هاتنی لێ‌کردم ، ئەوجۆگە خاوێنەی کە زۆر بە سەربەستی‌یەوە بەبەردەممانارەوتی ئەکردو لەگەڵ دوانماندا ووردە شەپۆڵەکانیمان بەرێ ئەکرد ئێستا ووشك بووەو لەجیاتی ئاو جانەوەرێکی بارگەیان تیاخستووە .

بۆنەگبەتی نەگەلای درەختەکە بەسەوزی مابووەوە تاوێنەی ئەوی تیا ببینمەوە نەئاوی خاوێنی جۆگەکە ، لەبەرخۆمەوە ووتم : ( ئەوە چی‌یە ئەڵێ‌ی سەرەتای پاییزە ؟! ) ئەو کاتانەم هاتەوە یاد کەپێکەوە نازی یەکترمان ئەکێشا : ( ئەزانی ئەم شوێنەشم وەکو تۆ خۆش ئەوێ ؟ زۆرسەیرە ، لق‌وپۆپی شۆڕی ئەمدرەختە هەر بەبسکەکانی تۆئەچێ‌و ئەوئاوە خاوێنەش هەرئەڵێ‌ی چاوە شینەکانتە .

- دەوازبێنە کەملەخەیاڵی بسك‌و چاوەکانما بژی ، باکەمێ لەیەکتری بگەین ، ئەوسا ..... ئەوساچی ؟! ) لەناکاوگرمەیەك هات‌و بۆچەند ساتێ بەری‌چاووم تاریك‌بوو ، پاش‌کەمێ تەمەکەی سەرچاووم ڕەوی‌یەوە بینیم ئەولقەی دارەکەیە کەخانم دەستی‌پێوە ئەگرت‌و لەوێوە بەدەم بیرێکی قووڵەوە سەیری ئاسۆیەکی دووری ئەکردو زۆر جار ئەم پرسیارەی لێ ئەکردم :

( - باشە چۆن بوو بۆ یەکەم جار منت هەڵبژارد ؟! ) منیش هەموو جار بێ‌ئەوەی هیچی لێ زیادوکەم بکەم وام وەلام ئەدایەوە : ( - ئەمویست منیش وەك خەڵکی هاوڕێیەکی خۆمم هەبێ ) ئەویش لەبەر خۆیەوە کە بەئاستەم دەنگی ئەبیسترا ، وەك بەزەحمەت لەگەرووی بێتە دەرەوە :
( - ئاوا .. ئێ .. ئێ .. ئاوا ! )
هەر ئەولقەیەو لەتەوقی سەری مندا گیرساوەتەوە ئالێرەوە بۆم دەرکەوت تەنانەت ئەولقەش لایەنی پاکی ئەوی گرتووە ، بۆیە کەوتۆتە ویزەی‌من .

ئەمویست بگریم ، فرمێسکێکی زۆر هەڵڕێژم ، تاهەرچی تاوانم هەیە بیسرمەوە ، ئەوپاساریە خنجیلانەم هاتە بەرچاو کەهەتا زەردەپەڕ بەسەر سەرماندا ئەیجریواندو ئەیویست پیمان‌بلێ : ( بدوێن ، یەکتری گۆش‌کەن ، باسی جوانی سروشت بکەن ، مرۆڤتان خۆش بوێ ، باسی پاشەڕۆژی خۆتان بکەن ، سل لەهیچ مەکەنەوە ، من‌پارێزگاریتان ئەکەم ) کەچی پاساری هەرکە چاوی بەتەنیایی‌یەکەی من کەوت کەلەو گۆڕانە سەیرو سەمەرانە ئەڕوانم زوو تێ‌گەیشت کەڕەنجی بەخەسار چووە بۆیەهەر زۆر زوو گوری نایە بەر باڵە بچکۆلەکانی‌و بەرەو هەوارێکی‌تر کۆچی کرد . بەڕاستی ئەمان لەسەر هەقن لەدارو گەلاو ئاوو جۆگەو سێبەرو پاساری هەرچی قوربانیان دابوو ، هەرچی ئارەقی ڕەنجیات ڕشتبوو بۆبنیان نانی کوشکێکی‌بەرز ، بەدەستی من بەفیڕۆ چوون . خۆزگە بمتوانیایە بۆچەند ساتێ لێتان نزیك بکەومەوە تاپڕ بەدڵ داوای لێ‌بووردنتان لێ‌بکەم ، بەلام هەیهوو تەواو لەمن دوورکەوتنەوە ، لەگەرمەی ئەم کێشەیەدابوو بەهۆش خۆمدا هاتمەوە کەئەڕوانم بێ‌پاساری نەك زەردەپەڕ بەڵکو وەك تاریکایی‌یەکی چڕ بەڕقەوە تێم بخوڕێ (هەستەبڕۆ) بەلام هەرچەند خۆی‌و لایەنگرەکانی زۆر تووڕەبن ، ئەبێ چاوەڕوانی ڕۆژێك بم ژیان بگێڕمەوە بۆ دارەکەو ، ئاوێکی بەخوڕ گیانی جۆگە نەشئەدارتر بکەنەوە ، هەوار لەجانەوەران تێك‌بەم ، ئەبێ ئەمجارە ووشەی « خۆشەویستی » یەکی پیرۆز بەگوێیدا بچرپێنمەوە . ئیتر لەوە زیاتر نەمتوانی شەرمەزاری دامبگرێ لەباوەشی ئەم شوێنەوارەداو تیا بمێنەوە . ووردە ووردە بەدەم ڕێگا ڕۆیشتەوە ، لێوە ووشکەکانم ئەبزواندو لەبەر خۆمەوە ئەموت : « تاوانە بنیادەم سۆزبکاتە جلەو گیری بیرو هۆشی » کە گەیشتمەوە لانەکەی خۆم بڕیارمدا دوێنێ لەبیرخۆم بەرمەوە ، لەسەرەوە نەخشە بۆ هیواکانم بکێشمەوە .

# هەندێ زانیاری دەربارەی کانییەکانی کوردستان

**فەرەج عەلی**

**سلێمانی**



لە ژمارە (14)ی گۆڤاری کاروان‌دا وتارێکی زانستی - جیۆلۆجی لەبابەت (کانی‌یەکانی عیراق‌و سیفەتی جیۆلۆجی‌و سوودیان) بە قەڵەمی ئافرەتێکی زانای کورد کەوتە بەرچاوم، ئەوی ڕاستی‌بێ، من بەشبەحاڵی خۆم کەم وابوە ئەو وتارە زانستی‌یانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان‌دا بڵاوئەکرێتەوە سەرنجی ڕاکێشابم، بەتایبەت چونکە خۆم لەگەڵ زانست‌دا سەرو ساختم نی‌یە. بەڵام ئەو وتارە هەر لە ناونیشانەکەیەوە سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشام‌و زۆرم حەز ئەکرد زانیاری زۆرتری تێدابوایە بەتایبەتی لەسەر کانی‌و سەرچاوەکانی کوردستان‌و جۆرەکانیان، هەروەکوو زۆرتریش حەزم ئەکرد ئەو وتارە زانستی‌یە کوردییەکەی ڕەوان‌ترو سازگارتر بوایە.

لێرەدا هەوڵ ئەدەم هەندێ زانیاری گشتی خۆم دەربارەی کانی لە زمانی کوردی‌و ناوچەکانی کوردستانی عیراق‌دا بە دیاری بۆنووسەری وتارەکە، بەوهیوایەی کەڵکی لێ وەربگرێ‌و ببێتە هاندەرێکی ئەوکە زیاتر خەریکی لێکۆڵینەوەی کانیەکانی کوردستان بێ‌و ناوو وشە کوردییەکان لەگەڵ وشەو ناوە زانستیەکان‌دا بەراورد بکات.

یەکەم: - لە زمانی کوردی‌دا کانی بەو ئاوە ئەڵێن کە لە زەوی هەڵ ئەقوڵێ‌و دێتە دەرێ، بەتایبەتی ئەو ئاوەی جۆگەیەکی بچووکی لێ دروست ئەبێ. زۆر جار چەندین کانی

لەیەك ناوچەدا لەنزیك یەكەوە هەڵ ئەقوڵێن و تێكەڵ ئەبن و سەرچاوەی چەمێك یاخود ڕوبارێك دروست ئەكەن، یاخود كانییەكە خۆی ئەوەندی ئاوی لێ هەڵ ئەقوڵێ، بەتەنیا ئەبێتە سەرچاوەی چەمەكە وەكو:

سەرچاوەی زەڵم، سەرچاوەی كانی ئاسكان (لەناو شاری سلێمانیدا)، كە لەڕاستیدا كانی گەورەن.

كانی دیمەنێكی سروشتی جوان و دڵگیری هەیە، بۆیە سەرنجی بەشی هەرە زۆری شاعیرەكانی كوردی ڕاكێشاوەو شیعریان پێدا هەڵداوە. گۆرانی نەمر لە (جوانی بێناو)دا لەبابەت كانییەوە وتویەتی:

**كانییەكی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو**
**لەبنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو**
**جوانترە لەلای من لە دەریاری بێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەر تیشكی ڕۆژ شلپ و هوور**

هەروەها شاعیرێكی هەولێری (كانی) كردووە بە نازناوی خۆی. سەیران لەسەر كانی و ئاو ئەكرێ، گوندو ئاوایی و شارەكان لە نزیك كانی بنیات نراون، خەڵكی دێهات ئاو لە كانییەكان ئەخۆنەوە.

لەشێوەی هەورامیدا بەكانی ئەڵێن (هانە) و هەر لەبەر ئەوەش چەندین گوندی گەورەو بچووك لە هەورامان بە ناوی كانییەوە ناونراون وەكو (هانە سوورە، هانە ژاڵە، هانە گەرمەلە، هانەی زن.......).

دووەم:- لە خواردنەوەی ئاودا خەڵكی كوردستان سەلیقەیەكی ژیرانەیان هەبووە، لە ئەنجامی تاقیكردنەوەی هەزاران ساڵدا، ئاوی كانییەكانیان پۆل پۆل كردوە بۆ نمونە ئەڵێن:

ئاوی كانی شیلان (لە ئاسۆس) سازەكارە، ئاوی كانی بۆگەنە (لەچەمی) ڕێزان) ناسازە، چونكە بە ئاوی كانی شیلان خواردن لە زگدا هەزم ئەبێ، بەڵام بە خواردنەوەی ئاوی كانی بۆگەنە مرۆڤ نارەحەت ئەبێ.

ئاوی كانییەكانی ناوچەیەك ڕەنگە لە ڕووی تەندروستییەوە هیچ زیانێكی نەبێ، بەڵام دیسانەوە دابەش ئەبێ بۆ دوو جۆرە ئاو كە پێی ئەڵێن:

ئاوی كانی كنێر سووكە، بەڵام ئاوی كانییەكی‌تر قورسە، هەروەها لە ڕووی تامەوە ئەڵێن:

**ئاوی كانیەكانی خوێڵێن سوێرە**
**ئاوی هەزار كانی ترشە**
**ئاوی گەڕاوی خورماڵ تاڵە**
**ئاوی گەڕاوی چەلی بۆگەنە.....**

ئەو كانییانەی كە لە هاویندا وشك ئەبن یاخود بەدرێژایی ساڵ ئاویان لێ هەڵ ناقوڵێ، لە هەندێ شوێن پێیان ئەڵێن: بوارەكانی، لە هەندێ شوێنیتر پێیان ئەڵێن: كانییە (درۆزنە، یاخود زنە)، هەروەكو لەچەن شوێنێكیش پێیان ئەڵێن: كوێرەكانی. ئەو كانییانەی ئاوی مەعدەنیان لێ هەڵ ئەقوڵێ، كە بۆ خواردنەوە ناشێن لەبەر ئەوە تاڵ، ترش یا سوێرن و بۆگەنیان لێ دێ، كە ڕەنگە هەندێكیان گۆگردو هەندێكیان نەوت و هەندێكیان حامضیان تێدا بێت، لە زۆربەی ناوچەكاندا پێیان ئەوترێ گەڕاو، چونكە ئەوانەی نەخۆشی پێستیان هەیە، یا پێستیان ئەخورێ خۆیانی لێ ئەشۆن و كەڵكی لێ وەرئەگرن.

سێیەم: - لە كوردستاندا لەچەندین شوێن كانی ئاوی مەعدەنی هەیە كە تا ئێستاش لە سنوورێكی زۆر تەسكدا، وەتەنیا بۆ خۆشتن نەخۆش كەڵكیان لێ وەرئەگیرێ وەكو:

1 - گەڕاوەكەی خورماڵ كە چەن كانییەكەو بۆ خۆشتن كەڵكیان لێ وەرئەگیرێ، (سەر بە قەزای هەڵەبجەیە).

2 ـ گەراوەکەی بەینی جەلی و گەلی کە بە (حەمامی جەلی) ناو ئەبری و گەراوێکی تر هۆرە مەرزان و جەلی (سەر بە قەزای کۆیە).

3 ـ گەراوەکەی دەرزیلە لە شاخی ئاشداخ کە ئەویش لە سەنگاوە (سەر بە قەزای چەمچەماڵە).

4 ـ گەراوەکەی خوێ لێن (مەملەحە) لە سەنگاو (سەر بە قەزای چەمچەماڵ).

5 ـ گەراوەکەی بانی خێلان (سەر بە دەربەندیخانە).

6 ـ خوێ لێنی مەملەحە چەن کانی یەکی لێیە کە خەڵك گۆلی بچووك بچووکیان لەبەردا کردووەو ئاوەکەی تێدا کۆ ئەکەنەوەو هاوینان ئاوی گۆلەکان ئەبێ بە هەڵمو وشك ئەبێتەوەو خوێ لە گۆلەکاندا ئەمێنێتەوە.

چوارەم: ـ لە کوردستانی عیراقدا هەزاران کانی گەورەو بچووك هەڵ ئەقوڵێن، هەموو کانی یەکیش ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە. رەنگە لێکۆلینەوەی ناوی کانی یەکان خۆی لەخۆیدا باسێکی زمانەوانی خۆش بێ هەروەها سەدان گوند بە ناوی کانی یەوە ناونراون، کانی و وشەیەکی تر لێکدراون و ناوێکی یان لێ دروست کراوە بۆ نموونە:

1 ـ بەناوی گژو گیاوە وەکو: کانی کنێر، کانی کووزەڵە.

2 ـ بەناوی دارەوە وەکوو: کانی سێو، کانی هەنجیر، کانی مازوو، کانی درکە، کانی تو‌و.

3 ـ بەناوی رەنگەوە وەکو: کانی زەرد، کانی رەش، کانی شین، کانی سپی، رەشەکانی.

4 ـ بەناوی رەنگی شوێنەکەوە وەکو: کانی شینکە، کانی سپیکە، کانی سوورکە.

5 ـ بەناوی وڵاخەوە وەکو: کانی مانگا، کانی گوڵك.

6 ـ بەناوی دەعبای ئاوی یەوە وەکو: کانی ماسی، کانی بۆق، کانی قرژاڵ، کانی ماران.

7 ـ بەناوی هۆزو خێڵەوە وەکو: کانی گۆران، کانی کوردە، کانی خێڵ.

8 ـ بەناوی مەزنەوە وەکو: کانی خووا، کانی پێغەمبەر، کانی ئەسحابە.

9 ـ بەناوی مرۆڤەوە وەکو: کانی وەتمان، کان، ئاشقان.

10ـ بەناوی هەندێ شتی بێ فەرەوە وەکو: کانی شەیتان، کانی بۆکەن.

11ـ بەناوی هەندێ وشەوە کە ئێستا لە زمانی کوردیدا مانای نازانرێ وەکو: کانی بۆکر، کانی توژەل، کانی کوروان.

12ـ بەناوی بەردی بەنرخەوە وەکو: کانی مرواری، کانی شیلان.

پێنجەم: ـ لە ناوچە شاخاوییەکاندا لە هەندێ شوێن کانی هەڵ ئەقوڵێ و بگرە لەسەر هەندێکیان گۆم هەیە وەکو گۆمی بێکودیان و گۆمی کرمە سوران لە قەندیل و گۆمی مێرگەمێر لەسەر هەڵگورد. کەچی هەندێ لە چیاکان کەم ئاون و ژمارەیەکی زۆرکەم کانی یان لێیە.

ئەو کانی یانەی لە کوێستانەکان هەڵ ئەقوڵێن بەزۆری ئاوەکانیان ئەوەند ساردە مرۆڤ هاوینانیش ناتوانێ خۆیان تێدا بشوا، یا تەنانەت بۆ ماوەیەکی درێژ پەنجەیان تێدا رابگرێ.

ئەو کانی یانەی لەبەرزاییەوە هەڵ ئەقوڵێن و بەخوڕ دێنە خوارێ بەرەو شوێنێکی نەوی‌تر، لەزۆر شوێندا تافگە (شلال)ی گەورە یان بچووکیان دروست کردووە، کە لە هەندێ شوێن پێیان ئەلێن تافگە، لە هەندێ شوێنی تر سول و لە هەندێ جێگا کە بەرد بکەوێتە بەر رەوتی ئاوەکە قەڵبەز.

شەشەم: ـ زۆری ژمارەی کانی یەکانی کوردستان و کەمی و زۆری ئاوەکەی و جۆری دابەش بوونی کانی یەکان لەناوچە جۆراو جۆرەکاندا، دەوری بنچینەیی هەبووە لە جۆری دابەش بوونی تیرەو هۆزو خێڵەکانی کوردو بەگشتی لە جۆری پێکهاتنی کۆمەڵایەتی کورداندا، هەروەها لە دیارکردنی جۆری بەرهەمی ئابوری (کشت و کاڵی جۆراو جۆر، ئاژەڵداری).

لێکۆڵینەوەی کانی یەکانی کوردستان و تەئسیری لەسەر رەوتی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی، فەرهەنگی، خەڵکەکەی و تەئسیری لەسەر جۆری شارستانێتی یەکەی، کلیلی کردنەوەی زۆر گرێ کوێرەن لە مەیدانی باسی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ی خەڵکی کوردستاندا.

كامەران بێباك
هەولێر

# دوو بەیتی فۆلكلۆری

## بەیتی
## سابیری ئەحمەد شێروانی

«سابیری ئەحمەد شێروانی» كابرایەكی زۆر خۆپەرستو هەڵپەرست بوو . گوتی‌یە كرمانجان وەرن با لە دژی ئاغەی هەڵبستین !

گوتیان باشە چ بكەین ؟ چ نەكەین ؟ گوتی : ئاغەی گوندی هەرچی ووت بەگوێی ناكەین . گوتیان باشە كە ئێش گەرم بوو «سابیر» بەدزی چووە لای ئاغەی‌و خۆی كردە لای ئاغەی لەدژی كرمانجان .. كە كرمانج ئەوەیان زانی‌یەوە گوتیان شەرتبێ سابیروك دەبێ ئەو دركەت لەبنی پێی دەربینین ، شەرتبێ دەبێ هەتكەكت پێبكەین ـ هەوجارەكەت لێ هوورد بكەین .. هەوجارو كەرەستەی جووتیان لێ هووردو پورد كرد ، كە سابیر ئەوەی دەبینی قورگی پڕگریان دەبێ

سبەینەكی گەر بەیانی
سابیری ئەحمەد شێروانی
هێستری دەرهێنا لە خانی
خۆی هەر دەدا سەر كورتانی
دەچوو لە بۆ سەر ناوانی
تێی هەر دەكرد لە حەیرانی
بەو خەبەرەی نە دەزانی
بەو خەبەرەی نە دەزانی
هەوجار عەدل داندراوە
مشارەكیان لەبەر ناوە
سوندێ دەخوێ پەرەكراوە
هەوجار قرۆمە لەگەر گاسن
بێ مرادیان كرد لەڕاست گاسن
هەوجارو زەنگورەو گاسنە
دەستەندوو دەرێی سەكنە
هەوجارەكەی دوو پارچەیە
مژانەكەشی هەر وەیە
تۆقەو خەپە چەند بێ كەسن
وەختە بمرم لێم مەپرسن
ڕووی خۆی داوە لەبۆ ماری
بەهێستری دەدا غاری
ڕووی‌خۆی دایتە بەر نساری
لە قورگی دا كورە گری
هەرچی وەی كرد خوا بیگری
سبەینەك لەگەر سەحەری
بە مشارەك كەتنە بەری
هەتا ئەحمەد كەیبە سەری
گاسنیان كردە سەنتەری
هەوجار گیزی وا بێ پەرە
هەوجار داندرا لەوێندرە
دەیان كردە سەركە كەرە

* * *

تێبینی :ـ
ئەم بەیتە لەشەوی «1977/8/15» دا لە «حاجی ئەحمەد» وەرگیراوە كەخۆی خەڵكی گوندی «قەرانچۆغانە»و تەمەنی نزیكەی «48» ساڵ دەبێت و ئێستە لە هەولێر دادەنیشێ .

## بەیتی یاساور

«یاساور» كورە جاحێرەكی زۆر ئازاو بە جەرگ بوولەگەڵ «عیس‌ئاغە»ی خاڵی بەینیان برەك ناخۆش بوو بەهۆی باوكە ڕەحمەتیەكەیەوە ..

ڕۆژەك «عیس‌ئاغە»ی خاڵی ناردی‌یە دووای بۆ شایی‌و زەماوەند ، ویستی بچێ دایكی گوتی كورم مەچوو ئەو خارە غەددارەت غەرەزی خراپە دەتكوژی گوتی دایە ئەوە خاڵە كوو ئەمن دەكوژی ؟ بەخۆو بەدیاری‌یەوە بەرەو گوندی «عیس‌ئاغەی» بەڕێكەوت .. «عیس‌ئاغە» كورەكان و پیاوەكانی خۆی تێكەیاندی‌یە كەلە دیوەخانێ بیكوژن ... بە خۆشی بەخوو

به شەشخانەوە لەسەر بانی بەرامبەر بە دیوەخانێ دانیشتووە ... شیران لە کالانێ هەڵ دەکێشن بیکوژن لەوان ئازاتر دەبێ «نۆ» کەسی لە کوڕان و پیاوەکانی «عیس ئاغە»ی خاڵی دەکوژی کە «عیس ئاغە»، ئەوەی دەبینی چاوی تاریک دەبێت و هاواردەکا : وەرە دەرێ کوڕێ بەرازی کە دێتە دەرێ و سەری بڵند دەکا خاڵی گوللەکی لەڕانی دەداو بەری دەداتەوە سەر زەوی .

یاساور خاری هەناردی
بێتە سەر شایێ
داکی گوتی : کورم مەچوو
گوتی :ـ دەچم دایە
داکی گوتی :ـ

* * *

یاساور ئەتوو مندادی
مەچووە سەر داوەتێ خاری
نەتهاتییە عەینێ مەتاری
گوتی دایە «عیس» خارێ منە
ناکا قەستێ کوشتنێ منە

* * *

یاساورم زۆر زندیە
دوو بەرانی دا گرتیە
لە هێسترەکی بارکردیە
زەلامەکی سوار کردیە
بچی لۆ سەردانی خاریە

* * *

شایی گەڕا لە بن گیزێ
دەستە دەستی بوک مامزێ
یاساور

شایی گەڕا لەبن توێ
دەگری دەستی سەر چۆپیێ
یاساور

یاساورم زۆر زندیە
تیرو مەتار لە ملیە
دەگری دەستێ سەرچۆپیە

* * *

قسەیان لێک نەبوو گیر
لێک هەرستان بێ تەخسیر
یاساورم لاوێ پشمیرە
کالانی کێشا لە شیرە
رایێ کێ وان مارێ میرە
تەواوی کرد نۆ پشمیرە

* * *

یاساور کوڕێ بەرازی
رووی خۆی دەدا لۆهەورازی
مام «عیس» ئاغە لەسەر بانی
تێزی دەدا لە شەشخانی
مام عیس ئاغە لێی کردگازی
نەچی هۆ کوڕێ بەرازی
داخوا لێکدی بکەین ڕازی

* * *

تێزی دەکرد لە شەشخانی
گوللەکی دەدا لەڕانی

* * *

**تێبینی :ـ**

**ئەم بەیتە لە شەوی «1978/1/1»دا لە «حاجی قادر جوبرائیل» وەرگیراوەو نوسراوەتەوە کەخۆی خەڵکی «قەرانچۆغان»ەو ئێستا لە هەولێر دادەنیشێ و تەمەنی نزیکەی «82» ساڵ دەبێت .**

لە توراسی کلاسیکی کوردی
« شێوەی لوڕی »

# شاکەو خان مەنسوور

مدحی مەندەلاوی

شاکە « هەر وەك لەپێشتر لە ووتارێك باسم کردووە » خوێ فرۆشێك بوو ، ڕووی کردە ناوچەی « هێوان » تاوەکو کەلوپەلی « عەتاریات » پیشانی دێهاتیە نزیکەکان بدات ، هەر دەم بەدێهاتە کوردیەکاندا دەسوڕایەوە بۆ فرۆشتنی کەل‌و پەلەکەی ، کە هەر هێندەبوو لەپشتی گاکەی بار دەکرد شەوان لە ماڵی‌یەکێك لە دێهاتیەکان بارگەی دەخست . لەدایکێك بەملاوە هەر خودای هەبوو . بەڵام خان مەنسوور هەر وەك لە ناوەکەیدا بە دیار دەکەوێت ـ لە پایەدارەکانی هۆزی خۆی بوو ، وەسەرۆکی تیرەکەی بوو . پاڵەوانێکی لێهاتوو و زۆرانبازێکی نەبەز بوو . سەرەڕای ئەوەش شاعیرێکی دڵسۆزو دڵگیر بوو ، شەیدای ویژەو ویژەوانان بوو . وەهەندێك جار شاکە بە ـ خانە ـ ناو دەبرد لەبەر تینی خۆشەویستان . لەڕاستیدا مێژووی لەدایك بوون‌و کۆچی دواییان نازانین ، بەڵام دڵنیاین کە لەناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم ژیاون .

ئێوارەیەك دوای گەڕانێکی زۆر بەناو گوندەکاندا ، شاکەی کەنەفت و ماندوو ئەو شەوە ڕێی کەوتە ماڵی «خانە» ، چونکە هەر وەك باوە مێوانەکان ڕوو دەکەنە ماڵی «خان» واتە سەرەك خێڵ . شەوێکی ساردو ئاسمان کرێوەو لێڵ بوو . کڵووی بەفر بە ڕووی کێوەکان دەهاتە خوارەوەو بەرە بەرە زەوی تارای سپی دەپۆشی . پاش تاوێك خانە لەدەرگای دیوەخان هاتە دەرەوەو سروشتی بەم جۆرە دەهۆنیەوە .

**شوکرانەم پید بوو کەس سڕ نەزانا**
لەبنەبانی دیوەخانەکەوە دەنگی ئەم ڕەنجبەرە کەچەڵە هاتە وەلام‌و گوتی ..

**سفید بەرگ لە ڕوو سەر زەمین شانا**
واتە سروشت تارای سپی‌ی پۆشی ئەم ووشانە لەسەر لێوی خانە کەوتنە سەماو دەلەرینەوە ، ئەمیش لە هەموویان پتر لە واتای ئەم ووشە شیرین‌و ئاواز دارانە دەیبزواند . لەگەڵ ئەوەشدا بێدەنگ گەڕایەوە دیوەخان بەفرەکە وەستا نم نمەی باران ، چۆرە چۆڕەی خستە جۆگەلەکان . خانەش ڕووی کردە دەرەوەو گوتی ..

**شوکرانەم پید بوو میناى بانی سەر**
شاکەش لەژوورەوە بەرپەچی دایەوە .
هشکە گلاڵان لافاو گرتە وەر
ئەمەش سۆزی خانەی بزواندو دەروونی مەستکرد بەجۆرێکی‌وا ئەو دێرێکی دەگوت شاکەی مێوان بە ووشەی هەستدارو پڕ سۆزو واتا دار نیوە دێڕەکەی تری تەواو دەکرد . ئالەم کاتەشدا ئافرەتێکی دلڕفێن هاتە دەرەوەو سەیری ئەملاو ئەولای دەکردو ، بەسام‌و تەوسێکەوە هەڵدەلەرزی چەند پەنگرێکی بەدەستەوە بوو خانە وای بەبیرداهات کە ئەم پشکۆ ئاگرانەی بۆ خۆگەرم کردنەوە بەدەستەوەیە هەر بۆیە گوتی ...

**خودا دا له دەست سەردیی سەهران**
**نازداران دەستکەن وەئاگر بەران**

بەلام شاکە شتێکی تری بەدیکرد ، کاتێک ئەم جوانیەو سەرکەشیەی ئافرەتەکەی دیت ، وای بەبیرداهات کەچاوەڕێی دلدارەکەی دەکات و بێ تالوکە دێت و دەچێت . بۆیە گوتی ..

**مەگەر نازاران خەیالێک کەردەن**
**هامشووی چکە پێ ئاگر بەردەن**

خانەو شاکە ، هەر لەم شەوە یەکتریان ناسیو بوون بەبرا ، وەهێندە وەفادارو دلسۆزی یەکتربوون بەپەندو هەر کاتێک خەلك دوو هاوڕێ دلسۆزیان بینیان دەیانگوت « دەلێی شاکەو خان مەنسوورن » ! یان « چمان شاکەو خان مەنسوورن » .
وابزانم ئەم دوو شاعیرە دیاردەیەکی سەیر دەنوێنن لە نێو هەموو شاعیرانو بەتایبەتی شاعیرە کوردەکان هەر وەك دەزانین شاعیرێك چامەیەك دەنوسێت چی پێویستە لە واتاو کێشو سەرواو ناوەڕۆك . بەلام لەئاستی ئەم دوو شاعیرە هەردووکیان چامەکەیان بەیەکەوە تەواو دەکردو دێرەکانیش هاویەکو گونجاو بوون هەروەك تەنها شاعیرێك هۆنیبێتیەوە . هەرکاتێك یەکێکیان نیوە دێرێکی دەگوت ئەوی تریان نیوەی دووەمی تەواو دەکرد . وەوادیارە زۆربەی جاران خانە نیمە دێری یەکەم دەلێتو شاکە تەواوی دەکات . ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەهیچ کامێکیان دێرێکی تەواویان نەگوتووە .
وەکو باسمان کرد هەردوکیان بوونەبرا ، خانە زەوماوەندی بۆ هاورێکەی سازداو ژنی بۆ خواست . بەلام کارەساتێکی دلتەزێن لەژیانی شاکەی شاعیرمان رووی‌دا . ئەوەبوو هەردووکیان ویستیان دلسۆزی و پەیمان پەروەری ژنەکانیان تاقی بکەنەوە ، بەتایبەتی چونکە شاکە لەئابرومەندی ژنەکەی کەوتبووە گومان ، بۆیە خۆیان واپیشاندا کە هەردووکیان هەر وەك جاران دەچنە راوو تا چەند رۆژێك ناگەرێنەوە وە کاتێك نیوە شەو هەریەکەیان رووی کردە ژوانگەی ژنەکەی . لێرەدا کاتێك شاکە گەیشتە لانەی ژنەکەی بەنهێنی پاژنەی پێی راکێشا ، ژنەکە هەستکردو گوتی « یار حەسەن سقانی ماسیت خواردگە ، ئائیستە لێرابیت » بەواتا « یارەکەم حەسەن دەلێی ئێسکە ماسیت خواردووە ، ئێستا لام ناچیتە دەرەوە ؟ » شاکەش وازی لێهێناو بە پەشۆکاوی گەڕایەوە لای هاورێکەی . بەلام کاتێك خانە پاژنەی ژنەکەی راکێشا ، ژنەکەی ستوونەیەکی رەشمالەکەی هەلکیشاو دای بەسەری خانەو گوتی « شنەفتیدە خانە مردگە ئی کارە کەیت ؟ » بەواتا « وادەزانیت خانە مردووە ئەم کارە دەکەیت ؟ » . خانەش بەسەری شکاوەوە بۆی دەرچوو . وەکاتێك گەیشتەوەیەك ، شاکە غەمناكوو ناهەموار بوو . خانەش پرسی . هاچیتە ؟ شاکە گوتی ..

**دلەگەم بیە وەپەردەی قەساو**
**(لەیل) وەیار (هەسەن) من کردگە هەساو**

واتەژنەکەم وای زانی من حەسەنی یاری ئەوم . وەشاکەش بەهاورێکەی گوت ئەی تۆچیت کرد ؟ خانە گوتی :
ئەم خوێنەی بەسەرمەوەیە باشترین گەواهیە بۆ پاکیو دلسۆزی ژنەکەم . ئەنجا شاکە ژنەکەی تەلاق داو بەناو شۆخو شەنگانی ناوچەی - هێوان - دەگەرا بۆ دۆزینەوەی ژنێکی نوێ ، لە سەر رێگای کانیو رووباردا دەوەستاو چاوی بەم شۆرە کچە قەشەنگانە دەکەوت کە تکەتکە ئاو لە گۆزەی شانیان یاخود کوندەی کەلەکەیان دەتکاو شلکەی رانیان ئەرشەدار دەکرد تۆ هیچت بۆ نەئەمایەوە تەنیا سەرەنجدان نەبێت لە کاتێکدا ئاگایان لە تۆ نیە ، بەلام ئەگەر تۆشیان ببینیبوایە ئەوا بەغەمزەی چاوی بازیان لەگەل دەکردیو خۆشترین گۆرانیان پیا هەلدەدایت . هەر هونەرمەندێك ئاواتو ئارەزووی تایبەتی هەیە ، بەتایبەتی ئافرەتێك لەناخی دلیدا ئاواز هەلقولێ وەلەتیشکی چاویدا تەلیسمی ئەفسوناوی بدرەوشێ ..
سەرەنجام شاکە بەتیری دل پێکرا ، بەتیری کچێکی حوانکیلەی خرپن کە کەمەرەی بەچیتێکی سوور دەبەستو وەك پەپوو سلێمان وابوو ، شاکە تینو ئارامی لێبرا ، هەستی کرد توانای وەستانی نەماوە هەرکە خانە هاتە لایو لەسەر پشتی ئەسپەکەی (کولگاو) چاوی بە شاکە کەوت لەم بارو جۆرە ناهەموارەدا ووتی ..

**شاکە لە سەردا ، شاکە لە سەردا**
**سای بالای کی دیت ئاگر لە وەردا**

شاکە ووتی ..

**خانە خارینم ، خارینی خارم**
**لەوەیشتی ئەزیز ترمەی ئازارم**
**گەل گەل نازاران هانە ژێری تاف**
**ماشتای زەرین سیم دان لە دەوری ناف**

بەلام ڕووداوێکی تر ژیانی ئەم دووشاعیرەی شلەژاندو چارە نووسێکی رەش و پەژارەدار باڵی بەسەردا کێشان . شەوێکیان ئاسکێکیان سوور دەکردەوە کەڕاویان کردبوو خانەش هەندێک داری خستە ئاگرەکەو گوتی .

**پیر سووز بسووز تا سوو سفید بوو**
**تا سالی هەنی دەوان وەکی بوو**

بەلام شاکە گوتی ..

**پیر سووز بسووز تا سوو سفید بوو**
**تاساتی هەنی دەوران وەکی بوو**

[ واتە بزانین پاش سەعاتێك گەردوون چی بەسەر دێت ] . وەلەودەمەی ئەوان گفت و گۆیان بوو ، لەناکاو ئابلوقەیان دان و خانەیان بەدیل گرت و بێسەرو شوێن دوور خرایەوە . خانە حەوت ساڵ لەدیل مایەوە ، لەم ماوەیەدا کوڕە گەورەکەی - شاهان - جوانەمەرگ بوو . بەلام شاکەی بێکەس ڕووی کردە قامیشەلانی « کەنەکەو » کەدەکەوێتە ناوچەی « سەراو چیەنی بازاو » ئەمیش زەریاچەیەکە بەدرێژایی ساڵ لێلاوی تیا کۆ دەبێتەوە ، هەروەها پاشەڕۆی دێیەکەی تێ‌دەڕژێ . شاکە لەم دەورو بەرەدا حەوت ساڵ بە کوڵەمەرگی بردەسەر ، بەدەست شلەژاوی تەندروستیەکەی دەینالاند کەوەك ووشکە قامیشێك زەردو زراو هەڵگەڕابوو لەلایەکی تریش گاڵتە پێکردنی خەڵکی یەکجار پەست و بێزاری کردبووو هەروا بەشێت و گێلەیان دابووە قەڵەم . تاوە ناتاوێك هاواریان دەکرد ( شاکە .! شاکە .! واخان مەنسوور هاتەوە ) ! ئەمیش بەلاکە لاك ڕای دەکرد تائەو شوێن ، بەلام بەرەنجەڕۆیی و چاو بەگریان دەگەڕایەوە شوێنی خۆی . لە پڕێکا لە دوای حەوت ساڵ خانە لەسەر پشتی ئەسپەکەی کوڵگاو هاتەوە . هەرکە ئەسپەکەی لەدوورەوە حیلاندی و مژدەی گەڕانەوەی بەشاکە بەخشی شاکە هەر کە ئەمەی بیست چریکاندی ..

**قەومەیل براگان نەماگە هوشم**
**شیەی کوڵگاو بی ئامان وەگوشم**

وەلەگەڵ ئەوەشدا لە شوێنی خۆی نەجوولاو وای دەزانی بەهەڵە چووەو ئەمە ئەندێشەیەو زرینگانەوەیە نەوەك حیلەی ئەسپی خۆشەویستەکەی . کاتێك خانە پرسیاری هاوڕێکەی دەکرد ، شوانێك پیی ووت « شاکە والەکەنەکەو کەوتووە » خانەش گوتی برۆ هاوار یکەو بلێ :

**سووسەن گوڵ چڕی ئەو سەر نساران**
واتە : گوڵی سوسەن بانگی لوتکەی چیاکانی کرد .

وەکاتێك شاکە ئەمەی بیست ، هەڵساو هاواری کرد ...

**هێ وەمزگانی هاتەوە یاران**

شاکەزانی ئەم ووشانە هی خانەیەو لەقامیشلانی کەنەکەو دەرچوو . بەم جۆرەش نەخۆشیەکەی بەرەبەرە سارێژ دەبوو تەندروستی گەڕایەوە . بەلام خانە چاوی بە شاهانی کوڕی نەکەوت ، بۆیە لە شاکەی پرسی :

**« شاکە شاهان کوو »**

شاکەش ڕاستەوخۆ هەواڵی پێنەدا ، بەڵکو دەربارەی ژیان دوا ، گوتی کوا شازادەکان و حاتەمی تەی و سوڵتانەکان و شابارام و شاعیری کوردی لوڕی جانی شیرازی و داودی پێغەمبەرو سلێمانی خاوەن ئەنگوستیلەو ڕوستەمی زاڵ و فەرهادو .. و .. و ئەنجام و تۆو شاهان و هەمووومان دەچینە ناخی گڵ و .. گوتی ..

**تا بیری ئەوکە پاتشاهان کوو**
**تەختی بەگ لەران دایەم نەمەن کوو**
**قافەی قاف دونیا جەمهوری جەمین**
**کشت بیە خورداش خاکی سەرزەمین**
**هاتم هاتمێل سوڵتان جومجومە**
**هەمان لەی خاکی نابینا گومە**
**بەیرامی گور گیر وەکەمەن بازی**
**کووە دەست قەڵەمی جانی شیرازی**
**دادم بو ئرای نەبێڵلا داود**
**وەحوکمی باطن زوریە دروست کرد**
**کووەن سولەیمان صاحیب نگین کوو**
**ئینس و ج٘ن کشتی لە فەرمانی بوو**
**کووە ڕەخش گورزی ڕوسەم فیلەتەن**
**کووە زەرپ بازووی فەرهادی کووکەن**
**شاجەمشید وەوجام گیتی نەماوە**
**ئەویش جور ڕیوار وەر کرد وەو ڕاوە**

کووەن جەهانبەخش کووە جەهانگیر
کووە ڕوسەم خۆی کووە زاڵی پیر
وەشەرتێك نەمەن وەپێغەمبەران
(شاهان) چین مینید ئەی بێخەبەران

بەم شێوە پەیتاپەیتا شاکەی چالاك هۆشمەندانە هەواڵی مردنی شاهانی پێدا .. بەم شێوەیە جارێکیتر ئەم دووشاعیرە خونچەی ژیانیان پشکوتەوە بەهاری تەمەنیان پەلەی ئارامی دایەوە شەوێك خانە خەونێك دەبینێت و دەڵێت ..

شلکە شاریك دیم شلکە شاریك دیم
وەکەلام قەسەم ئەزیم شاریك دیم
م شەربەت لە دەستی دوکان داریك دیم
بازاڕ لە سوورەت سەر مەناریك دیم
تاییفەی ئەزیم لە پای خزوور دیم
دوو سپا لە دەور تاقی ئەبروو دیم
دەروازەی سڕ پووش پڕ گەوهەرێك دیم
حوجرەی شیشەوەن پڕ جەوهەرێك دیم

شاکەش خەونەکەی بەم جۆرە لێك دەداتەوە :

پەریدا بیژم مانای ئەو شارە
بازاڕ خو لەشە ، سەر خو مەنارە
تاییفە گیسە ، لەپای خرور دیم
دوو سپا برۆیە لەتاق ئەبروودیم
دەروازەی سڕ پووش لێوەو زووانە
حوجرەی شیش‌وەن دەمەو دگانە

ڕۆژان ڕادەبرن و هەردوکیان بە کامەرانی ژیان دەبەنە سەر . تاکو خانە دوای تەمەنێکی درێژ کۆچی دوایی دەکات و شاکەش بە چەندین چامەو هۆنراوەی ئاگرین دەیلاوێنێتەوەو بەفرمێسکە سپیەکانی لاپەڕەکان ڕەش دەکاتەوە . هەر وەك لەچامەیەکدا دەڵێت :

خوران وماژین ، خوران و ماژین
بان سە کوورەو واین مەوتی ئاغەم دین
زەمین نەیاشتیت ، زەمین نەیا شتیت ؟
خەوەر لەمەرگی ئاغەم نەیاشتیت ؟
ئمساڵ جور هەر ساڵ بەزری گوڵ کاشتیت ؟
زەمین دەڕ بەس بیت سەوز نەکەیت گیا
ت جور دڵەی من سفتە بوید سیا
بازاڕی فەلەك دەورانی دونیا
زوری خان مەنسوور لەعەرز هەڵکنیا
مانیشت خلاتی پووشا لە مەچیر
ئەڕای خان مەنسوور نیەچێ وە نەچیر
مانیشت خلاتی پووشا لە دوار
ئەڕای خان مەنسوور نیەچێ‌وە شکار
کەپوو ئامانت وەرجلە مەلەیل گشت
تا نەچیت وەبان زریەکەی مانیشت
کەپوو نەنیشیت ئەو گژی داران
خاس خاس نەخۆنیت نەغمەی بەهاران
بەهار نیەزانیت خان مەنسوور مردە
چەپەی گوڵانت وەی تەور جەم کردە !

العراق - العدد 503 في 20 تشرين الاول / 1977 .

ئەم وتارە هەر بە زمانی عەرەبی نووسیبووم ، من و هاوڕێی زانکۆییم کاك عەبدوڵلا سەیدی ڕەواندزی کردین بەکوردی .

دیم - دیتم
کەلام - قورئان (کلام الله)
بیژم - بڵێم
گیس - گەزو
نەیاشتیت - خەبەرت نەبوو
خوران و ماژین - دوو دێهن لە ناوچەی هێوان کە خانە لەوێ مرد .
بان - وەرن .
دین - دیتن .
زەمین - زەوی .
خەوەر - خەبەر
مانیشت - چیایێکی زۆر بەرزە لە ناوچەی هێوانە . خانەو شاکە لەوەیان ڕاو دەکرد .
وەرجلە - پێش
وەی تەور - وا - بەم جۆرە .
ت - تۆ
جور - وەك
سیا - ڕەش
زور - هێز

# حایێ وەلحایێ

خالد صالح حسن

دهوك

حایێ «وەلحایێ» :

ئەڤە ئێکە ژیارێن کوردی ، یێن کو بـرەنگەکێ تایبەتی بو کچا دهێتەکرن ، یێن کو ژیێ وان ژشەش سالاو پتر ئوکێم جارا نەبیت ئەگەر کورِ ڤێ یـاریێ ناکـەن ، ڤێ یاریێ ژی بـاراپتر لـسەیرانـاو دەهواتـا دکەن ، دبێـژنە ڤێ یـاریێ حایێ یـان «وەلحایێ» چونکی لسەرێ یاریێ وێ پـەیڤێ بکارتینن ، دڤێ یاریێدا درستە هندی یاریکەر تێدا دپشکداربن ، یاریکەر دێ مەیدانەکێ بخو باقژ کەن دا دەست پاڤێژنە یـاریا خـو بـڤی رەنگی :

هەمی دێ دەستێن خو تێك دانن کو وەکی خەلەکەکێ لێ بێن ، پاش هەمی دێ پێن خو بو لایێ چەپێ بەن‌و لەشێ خـو ژیدگەل ویڤەبەن ، لـ دیڤـرا هەمی‌دێ پێن خو بو لایێ راستێ بەن‌و دیسا لەشێ خو ژی‌ویڤە بەن ، پاش‌دێ پێن خو یێن چەپێ لـ سەر یێ‌راستێ‌را هاڤێژن پاش‌دێ جوتکانی خـو هاڤێـژنە ویڤەتر کو هەر یاریکەرەك بچیتـە جهێ یاریکـەرێ بـ تەنشت خوڤە ژلایێ راستێ .

وەسا ... یاریکەر دێ لـ دور خەلەکێ زڤرن . کو بزاڤا هـەمی یاریکـەرا پێکڤەبیت ، یـاژهەژی گـوتن ئەوە لـ دەمێ یاریکەر دزڤرِن ئاوازا بخو دبێژن ، ئوهەر دەڤەرەکێ ئاوازێن خوێن هەین ، ئەڤەژی چەندەك ژوان ئاوازانە :

١ ـ یاریکەرەك دێ بێژیت‌و یێن‌دی دێ‌لێ ڤەگێرِن :

**وەلحایێ ، وەلحایێ**

یان لـ هندە دەڤەرا دبێژن :

**حایێ حایێ حایێ** ...
**کولیلکا دوو تایێ** ...
**بەژنا شێر ئاغایێ** ...
**شێر ئاغا بلبلە** ...
**چوو بو پشت میسلە** ...
**میسل دەربو دەربو** ...
**کەسکێ سووری وەربو** ...
**کەسکێ سووری کێ‌بو ؟** ...
**یێ خویشکا زینێ بو** ...
**زینێ تو بـخودێ کەی** ...
**سلاڤا لـ مەمێ بکەی** ...
**مەمێ چوو بو سیکێ** ...
**کرِین جلێد بویکێ** ...
**بویکا مە کوردانە** ...
**سەر بەرەکێ پانە** ...
**بەرێ ڤون کەلێشی** ...
**شێرەك لێ ڤەکوشتی** ...
**شێرو هاکە هاکە** ...
**دەست‌و پیا شەماکە** ...
**شەماکا زێرینە** ...
**هەسپێ عالەمینە** ...
**عالەمین بەقالە** ...

یان :

**«عالەمێن هەڤالە» ...**
**بێ بـ شیرو مەتالە ... .**
یان ژی یاریکەرەك دێ ڤی ئاوازی بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن :
**حایێ حایێ ...**
**کولیلکا دوو تایێ ...**
**بەژنا شێرە للایێ ...**
**شێرەللا بلبلە ...**
**یا لـ شارێ میسلە ...**
**میسل کەسك و سووری ...**
**کەسك و سوورێ تاری ...**
**هاڤێتە رویباری ...**
**رویبارێ مەنینە ...**
**رویبارێ شوشێیە ...**
**شوشێ تو بـ خودێ کە ...**
**سلاڤا لـ مومێ بکە ...**
**ئوسمانو ئوسمانو ...**
**مێرکێ رەپلیپانو ...**
ئەڤ ئاوازە گەلەك بـ سەر ئاوازێ ئێکێ ڤەدچیت دسەر هندێ راگەلەك کێماسی ژی یێن کەتینێ .
یاریکەرەك دێ بێژیت و یێن دی دێ ڤەگێرن :
**هەللا هەللا زەنگل بەنگ ...**
**زەنگل بەنگا تیاری ...**
**بەلگێ تیار وەنەکر ...**
**کەڤازێ ڤەبیل نەکر ...**
**ڤەبە ڤەبە یێد دخوینت ...**
**سەر چەپەرا یێد دروینت ...**
**چوومە شکەفتەکا تاری ...**
**بەرخەکێ تێڤە دنالیت ...**
**هەرێ بەرخو تەچێیە ؟ ...**
**سەرێ منێ کری یە ...**
یان :
**«سەرێ منێ بری یە» ...**
**بو محەمەد شاهێن بری یە ...**
**محەمەد شاهێن عنزەلێ ...**

**دەست هاڤێتە خەنجەرێ ...**
**میرمشك و وەرە دەرێ ...**
**نەتێمە دەر نەهندە ...**
**ژنا تە حنێر بەندە ...**
یان :
**«ژناتە قوبحەت کەرە» ...**
**شێژنەکا لـ دفنا من دای ...**
**خوین رشت و دئەنیا زەردا ... .**
چیروکێن کەلەپورێ کوردی کارەکێ دئاوازێ ژووریدا کری ، وەکی «زەنگل بەنگ» چیروکا «زەنگ و بەنگا» یان «نەتێمە دەر نەهندە ، ژنا تەحنێر بەندە ...» چیروکا بەقێ .
4 ـ یاریکەرەك دێ ڤی ئاوازی بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن
بێژن : ڤی ڤی ، بـ ڤی رەنگی :
**ڤیڤانێ ڤیڤانێ حەلێ ... ڤی ڤی**
**یابـ توق و مەرجانێ حەلێ ... ڤی ڤی**
**مێرکێ حەلێ کوشتی حەلێ ... ڤی ڤی**
**ئەحیابەگ روینشتی حەلێ ... ڤی ڤی**
**ئەحیا بەگ و تێزە حەلێ ... ڤی ڤی**
**ڤەیتان کرنە رێزە حەلێ ... ڤی ڤی**
**ڤەیتانا مامێ منە حەلێ ... ڤی ڤی**
**بەرگرت و لـ بەژنا منە حەلێ ... ڤی ڤی**
**سێڤا سەر بوخچێیە حەلێ ... ڤی ڤی**
**دابچین سێڤا ژێ بکەین حەلێ ... ڤی ڤی**
**بێنا گولا تێ بکەین حەلێ ... ڤی ڤی**
**گولێد مە بابیچن حەلێ ... ڤی ڤی**
5 ـ یاریکەرەك دێ ڤی ئاوازی بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن
بێژن : هێ ڤودکێ .
**ڤودکێ دڤوسینم ... هێ ڤودکێ**
**لـ خێلێ وەرتینم ... هێ ڤودکێ**
**خێلێ وەلخێلێ ... هێ ڤودکێ**
**بەرانێ کێلێ ... هێ ڤودکێ**
**دارا عەسکەری ... هێ ڤودکێ**
**ستێرێ لـ عەسمانا ... هێ ڤودکێ**
**گەرکێ لـ سەربانا ... هێ ڤودکێ .**

6 ـ ئەڤا لـ ژێری ژی ئێك بزانیت دێ بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن :

**بالاڤێ بالاڤێ ...**
**تیرکا بـ خەله دۆرێ ...**
**کچك چوونێ بـ ساطورێ ...**
**یاشینه یاشینه ...**
**باکۆزێ یاشینه ...**
**دوو کەڤ لێ فڕینه ...**
**کەوێد مام عەلی نه ...**
**هەرە بگرەو بینه ...**
**نەختێ تە چنینه ...**
**هزارۆ رومینه ...**
**سێڤا سەر بوخچێ یه ...**
**دابچین سێڤاژێ بکەین ...**
**بێنا گولا تێ بکەین ...**

7 ـ یاریکەرەك دێ ڤی ئاوازی بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن

**سارە لـ بن گوهیشکێ ...**
**بۆ قدقدا مریشکێ ...**
**هۆ مەللاۆ مەللاۆ ...**
**شاشکا سەرێ تەۆ ...**
**من بەرەك لێ داۆ ...**
**من کرە حێسیلەۆ ...**
**حێسیلا خورمێۆ ... .**

8 ـ ئەڤە ژی ئاوازەکە یاریکەرەك (أ) دێ بێژیت و یێن دی (ی) دێ بەرسڤا وی دەن بـ ڤی رەنگی :

**أ ـ هێ ترنجێ**
**ی ـ شیڤا بابێ تە برنجێ**
**أ ـ هێ ترنجێ**
**ی ـ شیڤا بابێ تە برنجێ**
**أ ـ عیرکێ شەما**
**ی ـ عیرکێ شەما**
**أ ـ بـ عەردی ڤەما**
**ی ـ چ تێ نەما .**

9 ـ ئەڤەژی ئاوازەکێ دیە . یاریکەرەك دبێژیت و یێن دی ڤەدگێرن :

**نینم نینم نینایێ ...**
**تەدکەلێ بابێ نایێ ...**
**کەرا دگوڤەندێ نایێ ...**
**گوڤەند هات و کەملی ...**
**خۆزکێت رۆژا عەولی ...**
**مەحبەتا کەتیە دلی ... .**

ئەڤێ چەندێ ب ستران ژی دبێژن .

10 ـ ئەڤەژی چەند ئاوازەکێن کورتن ، ئێك دبێژیت و یێن دی ڤەدگێرن :

**ئەم بچویکێد هیرو میر ...**
**دێ یاریا کەین زیچ و زیچ ...**
**شەرمێ ناکەین هیچ و هیچ ...**
**بێژن سەیدا زۆر باشە ...**
**هرچا عیر پوف نەواستە ...**
**سەر پیەکی راوستە ... .**

11 ـ **کچکێ دچینم ، کچکێ دچینم ...**
**دوو هەڤالا دگەل خۆ دئینم ...**
**هەڤال کی‌نە ؟ کچ مەلانە ...**
**شەش بەندۆ بەندێ ستێرانە ... .**

12 ـ **ترارۆ ترارۆ ...**
**تژی ئاڤا سارۆ ...**
**کورکا لێ ڤەخارۆ ...**
**کچکا ژەهرە مارۆ ... .**

13 ـ **بەحرا شینە بەحرا شینە ...**
**دوو کچکا دگەل خۆ بینە ...**

14 ـ لـ ڤێرە یاریکەر ڤەدگێرن دبێژن : هێ

**هە ریڤی ریڤی ... هێ**
**ریڤی بەهیمە ... هێ**
**نە دەستم چوولە ... هێ**
**کەلکێ سڤۆرە ... هێ**

نەدویرە کۆ لـ هندە دەڤەرێن دی هندە ئـاوازێن دی هەبن .. ئەڤ یاریـیە بـ دوماهی دهێت پشتی گێـژ دبن و دوستێین ، چونکی یاریکەر هەر دزڤرن .



# ڕژێنی ئەدرینال

**ADRENAL GLAND**

دکتۆر عبدالکریم محمد علي

ڕژێنی ئەدرینال ، یەکێکە لە ڕژێنە گرینگەکانی لەش ، کە هۆرمۆنە تایبەتیەکانی Hormones خۆی دوروست دەکات و یەکسەر دەیرێژێتە ناو خوێن ، بۆ ئەوەی فرمانەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن .

لەلەشی ئادەمیزادا ، دوو ڕژێنی ئەدرینال Adrenal glands هەیە ، کە کەوتونەتە سەرووی سەرەوەی جوتە گورچیلەوە Kidneys ، رەنگی ئەم ڕژێنە زەردەو بەرەو قاوەیی خۆی ئەنوێنێت ، سێ لایە واتە سێ رووی هەیە ، کێشی هەر دوو ڕژێنەکە نزیکەی (¼) ئۆنس Ounce دەبێت واتە (7—8) گرام دەردەچێت .

ئەم ڕژێنە ئەگەر بێت و لەت بکرێت ، دەبینین لەدوو بەش پێك هاتوە ، یەکەمیان بەشی دەرەوەیە کەپێی دەوترێت توێکلە Cortex دووەمیان بەشی ناوەوەیە کەپێی دەوترێت ناوك Medulla .

لەبەشی ناوەوەی ئەم ڕژێنە ، دوو هۆرمۆنی hormones تایبەتی دوروست دەبن کەپێیان دەوترێت ئەدرینالین Adrenalineو نۆرئەدرینالینNoradrenaline،ئەم دوو هۆرمۆنە کاری کۆئەندامی سەمبساوی دەمار جێبەجێ دەکەن Sympathatic Nervous System ، (ئەم کۆئەندامە یەکێکە لە بەشەکانی کۆئەندامی دەمار «الجهاز العصبي ، Nervous System) .

هەندێ لەخانەکانی Cells کۆئەندامی سەمبساوی دەمار دابەش کراون لەنیوان هایپۆ سەلەمەس Hypothalamus (کە کەوتۆتە ژێرمێشکەوە Brain) و مۆخی بربرە Spinal corde هەروەها وەکو زنجیرەیەك بەدرێژایی بربرەی پشتدا Vertebrae دێنە خوارەوە ، کەدەمارەکانی بەرەو دل Heart ، بۆرییەکانی خوێن Blood Vessels ، ریخۆلەکان Intestines ، میزلدان Bladder ، ماسولکە نەرمەکان Smooth muscles دەچن و لەکۆتاییدا هۆرمۆنی نۆر ئەدرینالین Nor adrenaline دەرژێنن . ئەم هۆرمۆنە لێدانی دل زیاد دەکات ، تەوژمی خوێن بەرز دەکاتەوە Increase Blood Pressure بۆرییەکانی خوێن کرژدەکاتەوە دەنوقێنێت ، چالاکی ماسولکەکانی میزلدان و ریخۆلەکان کەم دەکاتەوە ، چاو زەق دەکاتەوە ، رادەی شەکر لەخوێندا بەرز دەکاتەوە ، ئەمانە هەموی بۆئەوەی ئەوکەسە ئامادە بکات یان بۆ شەڕ fight یان بۆ راکردن flight «کاتێ کەئادەمیزاد دەمارگیر دەبێت وەك دەلێن بەرچاوی خۆی نابینێت و دوو دۆشاو تێکەل دەکات ، ئەنجا بۆیە ئەو ئادەمیزادە یان دەبێ بیکات بەشەڕ یانیش دەبێ لەو شوێنە بڕوات بۆئەوەی ساردەوەبێت و بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی» .

هۆرمۆنی ئەدرینالین و نۆرئەدرینالین ، لەڕژێنی ئەدرینالەوە ئەچنە ناوخوێن بۆئەوەی زیاتر کاری خۆیان بکەن ، کارکردنی ئەم دوو هۆرمۆنە جیاوازە لەهەندێ ڕێی گرنگەوە ، هەروەها دوروست بوونیان لەدوو چەشنە خانەی جیاوازەوە پەیدا دەبێت ، کارتێکردنی ئەدرینالین بەهێزترە لەویتر ، بۆ نمونە بۆ سەر میزلدان و ریخۆلەکان ، بەلام کارتێکردنی نۆر ئەدرینالین بەهێزە بۆسەر بۆرییەکانی خوێن و بەرزکردنەوەی تەوژمی خوێن .

ئەگەر هاتو کۆئەندامی سەمبساوی دەمار لەچالاکیدا بوو ئەوا کارکردنی ئەم هۆرمۆنە بەجوانی دیاریی دەدات ، بۆیە




پێستی ئادەمیزاد زەرد هەڵدەگەڕێت «چونکە بۆرییەکانی خوێن کرژدەبنەوەو دەنوقێن» لەش چەوریی دەردەدات «لەبەر هاندانی ماسولکە نەرمە تەنکەکانی ژێر مویی پێست» هەروەها لەش عەرەق Sweat دەردەدات «بەهۆی ڕژانی مادەی ئەسیتایل کۆلینەوە Acetylcholine» ئەم مادەیە بەشداری دەکات لەگواستنەوەی فەرمانەکانی دەمار بۆنەو ماسولکانەی کەلەژێر فەرمانو بڕیاری ئادەمیزادا Voluntry muscle کاردەکەن ، بەلام لەهەمان کاتدا کار دەکاتە سەر ماسولکە نەرمەکان Smooth muscle کەکار کردنیان بە پێچەوانەی هۆرمۆنەکانی ئەدرینالە ، ئەم مادەیە لە ڕاستیدا سەر بە (کۆئەندامی هاوسێ سەمبساوی دەمارە) Para sympathatic Nervous System ، کەلەکۆتایی گشت دەمارێك دەرژێت ئەگەر سەر بە دەماری هاوسێ سەمبساوی Para sympathatic nerve بێت لە ماسولکە نەرمەکانی لەش .

توێکڵە ئەدرینال :ـ Adrenal Cortex :ـ گەلێ هۆرمۆن دوروست دەکات کەپێوستن بۆ لەش وەك :ـ

کۆرتیکۆ ستیرۆید Corticosteroids ، دوو هۆرمۆنی زۆر گرنگ ئەلدۆستیرۆن Aldosteroneو هایدرۆ کۆرتیزۆن Hydrocortisone ، یەك لەدوای یەك ، ئەمانە ڕێژەی ئاوو خوێ Salt لەلەشدا ڕادەگرن ، هەروەها پەیوەندیان بەهەرس کردنی کاربوهیدرات Carbohydrate ، پرۆتین Protein ، چەوری Fatوە هەیە ، کارکردنی ئەلدۆ ستیرۆن و هایدرۆ کۆرتیزۆن بەجوانی دیاری دەدات لەکاتێکدا ئەگەر ڕژێنی ئەدرینال سست بوو یاخود زۆر چالاك بوو ، لەنەخۆشی ئەدیسۆن‌دا Addison's disease ، کە بەهۆی سستی کارکردنی ئەدرینالەوە ڕوودەدات ، نەخۆش هاوار لەلاوازیو بێ‌هێزی دەکات «ئەم لاوازیە بەهۆی کەم بوونەوەی ڕادەی شەکر لەخوێن‌داو تازە نەکردنەوەی خانەکانی لەشەوە ڕوو دەدات» ، نزم بوونەوەی تەوژمی خوێن Hypotension «بەهۆی‌کەم بوونەوەی ڕادەی خوێ‌و ئاوو کەم بوونەوەی قەبارەی خوێن لەلەشدا» ، هەروەها توك هەڵوەرین یان مووکەوتنو هەروەها لەش ڕەش هەڵدەگەڕێت (بەهۆی زۆر بوونی مادەی میلانین Melanin لەپێستدا) .

لەکاتی زۆر چالاکی توێکڵە ئەدرینالدا Hyper activity ، کەبە زۆری بەهۆی شیرپەنجەوە tumour ڕوو دەدات وەك نەخۆشی کوشنگ Cushing's disease ، لێرەدا نەخۆش لاقەکانی باریك دەبنەوە «چونکە پرۆتینی ئەم ماسولکانە دەگۆڕێن بۆ شەکر» نەخۆش سك زلو سك قەوی دەبێتو غەب غەبەی ژێر چەناگە پەیدا دەکات (چونکە لێرەدا شەکر دەگۆڕێت بۆ چەوریو بەز) ، لەش توکن دەبێت «موی لەش زیاد دەکات» بە هۆی زۆر دوروست بوونی هۆرمۆنی نێری‌وە Male hormone ، نیشانەی نەخۆشی شەکر ڕوو دەدات (بەهۆی بەرز بوونەوەی ڕادەی شەکرو کەم بوونەوەی ئەنسۆلین Insulin) ، بەرز بوونەوەی تەوژمی خوێن Hypertension ، (زۆر بوونی هۆرمۆنی ئەلدا ستیرون دەبێتە هۆی گلدانەوەی retention خوێ‌و ئاوو زۆر بوونی قەبارەی خوێن Blood volume) .

---

## سەرچاوەکان :ـ


1 — The human body , by Lewis & David, London, 1979.

2 — Biology, by Iohn M, Hard 1975, London.

3 — Merk Manual, 13th ed., 1979.

4 — D iabetes, Dr a, DG. 1st ed. 1981 London.

5 — Merk Vet. manual 4th ed. 1974.

د . نزار محمد امين

# نەخۆشی خەمۆکی

## «الكـآبـة»

ئەم نەخۆشی یە یەکێکە لەنەخۆشی یە دەرونی یەکان کەمرۆڤ تووشی دەبێت وەنزیکەی یەك لەهەر دەکەس لەهەر کۆمەڵگایەکدا توشی دەبن لە ماوەیەك لەژیانیاندا ، بەداخەوە تاکو ئێستا میللەتەکەمان نازانێ کەئەمیش نەخۆشی یەکە وەك هەموو نەخۆشی یەکی تر وەزۆر جار دەڵێن ئەم کەسە خۆی بەدەستی خۆی وای لەخۆی کردوە .

ئەو شتەی ئەم گیروگرفتە مەزنتر دەکا ئەوەیە کەهەندێك لەبرا پزیشکەکانمان هەمان رایان هەیە بەرامبەر بەم نەخۆشی یەو ئەو کەسە شەرمەزار دەکەن کەدەروا بولایان وەپێی دەڵێن : [کورە برۆ تۆ چیتە هاوڕێی تۆ لەدەشت بێڵ ئەکوتێ] بەڕای من هۆی ئەوشتەش ئەوەیە کەتاکو ئێستا زانستی پزیشکی دەروون [سایکاتری] لە وولاتەکەماندا نوێ یە بەرامبەر وولاتەکانی جیهانیترو هێشتا ڕێگای خۆی نەدیوە بۆ مێشکی هەندێك لە برادەرەکانمان . زۆر جار کە مرۆڤ تووشی ئەم نەخۆشی یە بوو دەڕوا لەم پزیشك بۆ ئەو پزیشك وەلەم خەستەخانە بۆ ئەوخەستەخانە بێ ئەوەی یان چارەسەر بکرێت یان رێگایەك پێی نیشان بدرێت بۆ پزیشکی تایبەتی نەخۆشی یەکانی دەروون .

هەندێ جار نەخۆشی خەمۆکی وادیار دەکەوێ لە مرۆڤێکدا بێ ئەوەی هیچ رووداوێك یان مەسەلەیەکی تایبەتی هاتبێتە رێگای نەخۆشەکە هەروەك دەڵێن لە «ئیرادەی خوایە» . کەچی زۆر جار هەیە ئەم نەخۆشی یە پاش رووداوێکی تایبەتی بەدەردەکەوێت وەك مەرگی خۆشەویستێك یان تووش بوونی مرۆڤ بۆ نەخۆشیەکی پیس وەك شێرپەنجە یان هەر جۆرە تەنگو چەڵەمەیەك بێتە رێگای و نەتوانی بەربەرەکانی بکات وای لێ دەکات کە تووشی ئەم نەخۆشی یە ببێ . ئەم نەخۆشی یە (وراسی یە) چونکە وا دیارە زۆر خێزان هەن کە چەند کەسێکیان تووشی ئەم نەخۆشی یە بوونە بەتایبەتی لەناو ئەو کۆمەڵگایانەی ژن هێنانی خزمایەتی لەناویاندا رەوشتە .

### نیشانەکانی خەمۆکی

نەخۆش دڵی توندەو خەوو خواردنی تەواوی نی یە هەروەها هەوەسی جارانی نامێنێ بۆ نمونە ئەو کارانەی بۆ خۆشگوزەرانی دەیکرد وەك گەمەو کارەو گەڕان و نوکتە بازیو دەمە تەقە هەمویان کەم دەبن . نەخۆش گەلێ بێ هێزو توانا دەبێو هیچ ئیشی پێناکرێ چاوە دێری خۆیو ماڵو منداڵی ناکات ، زەینی نامێنێ وەمێشکی قسەی بەرامبەر خۆی وەرناگرێت وەئەگەر مرۆڤێکیتر بیدوێنێ ئەوە یان وەڵام ناداتەوە یان تورە دەبێ .

هەندێك لەو مرۆڤانەی کەتووشی خەمۆکی دەبن بەتایبەتی پیرەکان واهیمەیان بۆ دروست ئەبێت وە گومانی زیادی لەلایەن پەیدادەبێ وەبیری ناجور دێتە مێشکیان وەك هەست کردن بە پەیدا بوونی دەنگی ناجور لەناو مێشکیدا و ئەم دەنگانە دەڵێن (تۆئەمری) ! یان دەڵێن (ئەتکوژین) ! بەبێ ئەوەی خاوەنی ئەم دەنگانە ببینی وە لەئەنجامی ئەم واهیمەیە واهەست دەکا کە هەندێك مرۆڤ بەدوژمنی خۆی دابنێ .

هەروەها ئەوانە .. واتە نەخۆشە پیرەکان هەندێك جار دەڵێن [من مەعیدەم نی یە ناتوانم نان بخۆم چونکە رێگای دەرچونی ئەو خواردنە لە لەشم گیراوە] بۆیە هیچ ناخوات تاکو مردن ئەگەر فریای نەکەون .

ئەوانەی‌توشی نەخۆشی خەمۆکی دەبن خۆیان لەبەر چاو دەکەویت‌و هەندێکیان بیر لەخۆکوشتن دەکەنەوە بۆ ئەوەی لەم وەزعە رزگاربن‌و جۆری تریش هەن کە هەست دەکەن بەتاوانباری‌و ئەڵین دەبێ بکوژرێن .

بۆ نمونە لە وولاتە پێشکەوتوەکانی رۆژ ئاوادا هەندێک ئافرەت کەتوشی ئەم نەخۆشی‌یە دەبن دەڕۆن بەڕۆژی رووناک ولەپێش چاوی خەڵک لەدوکانەکان‌دا دزی دەکەن بۆ ئەوەی بگیرێن وەبکەونە پێش دەستی میری‌و داد تاکو سزا بدرێن . ئەوەش یان لەبەر ئەوەیە تابنێردرێن بۆپزیشك چونکە هەست دەکەن کەکۆمەڵگای خۆیان بڕوایان پێ‌ناکا کە نەخۆشن . ئەوەی شایانی باسە ئەو مرۆڤەی توشی ئەم نەخۆشی‌یە ئەبێت لەراستی‌دا لەخۆیەوە بەلام ماوەیەکی زۆری پێ‌ئەچێ لەسێ مانگ تانزیکەی دوو ساڵ بەلام بەچارەسەر کردنی پزیشکی رەنگە لە دوو حەفتە تاکو مانگێکی زیاتر پێ‌نەچێ ، بەلام بەداخەوە ئەم کەسانەی چارەسەر دەکرێن دوور نی‌یە دیسان ئەم نەخۆشی‌یە بێتەوە بۆیان پاش چەند ساڵێکی‌تر نابێ ئەوەش لەبیر بچێ کەهەندێک لەم نەخۆشانە ماوەیەکی‌تر توشی نەخۆشی‌یەکی جیاواز دەبن کە پێچەوانەی خەمۆکی‌یە ئەوەش نەخۆشی (مانیا)یە واتە گەلێك شادو کەیف خۆش بوون . نەخۆشەکە بڕوا ناکات کەنەخۆشەو نیشانە ئەوەیە کەدڵی زۆر خۆشەو زۆر بڵێ دەبێ هەروەها دەست ئەوەشێنێ‌و پارە بەدەستی‌یەوە ناوەستێ‌و خۆی ئەخاتە سەر ساجی عەلی‌و خۆی بەشتێکی زۆر مەزن دەزانێ وەك پێغەمبەرێك یان مرۆڤێکی مەزن‌و بەدەسەلات . بەشەو خەوی نی‌یە ، کەچی دووەم رۆژ ماندوی دیار نی‌یە . هەندێك لەقسەکانی وەك شیعرە وەهەندێك جار مرۆڤی ئاسایی شەرم دەکا گوێی لێ راگرێت لەبەر ئەوەی قسەی ناشیرین دەکات بەتایبەتی ئەو قسانەی کەپەیوەندی بەکەمی‌و مەسەلەی ئافرەت‌و پیاو هەبێ وە دورنی‌یە رێگا لەئافرەت بگرێت لەسەر شەقامەکاندا .

**چارەسەر کردنی خەمۆکی**

بەراستی چارە سەر کردنی ئەم نەخۆشی‌یە قوناغێکی زۆری بریوە لەمەیدانی پزیشکی دەروونی‌دا . تائێستا زۆر جۆری چارەسەرکردن هەیە ئەویش

**جۆری یەکەم بەدەرمان :-**

زۆر جۆرە دەرمان هەیە بۆ ئەم نەخۆشی‌یە وەهەر دەرمانێك بۆجۆرێك خەمۆکی بەکار ئەهێنرێ‌و چاکترە ئەگەر پزیشکی دەروونی بینوسێ بۆ نەخۆشەکە .

**جۆری دووەم چارەسەرکردنی دەروونی :-**

ئەم رێگایە لەوولاتی ئێمەدا تەنها پزیشکی دەروونی بەکاری دێنێ وە بەتایبەتی بۆ خەمۆکی‌یەکی سوك یان بۆ خەمۆکی شڕ لەگەڵ جۆرەکانی تری چارەسەرکردن .

**جۆری سێ‌یەم چارەسەر کردن بەکەهرەبا :-**

ئەویش زۆر باشە ئەگەر لەکاتی خۆی‌داو بۆ نەخۆشی تایبەتی کە پزیشکی دەروونی بڕیار دەدا بەکار بهێنرێت . وەهیوادارم ووتارێکی تایبەتی لەسەر مەسەلەیە بەدورو درێژی بنووسم .

زۆربەی نەخۆشەکان بەیەك جۆر چارەسەر دەکرێن یان هەموو جۆرەکانی چارەسەر کردنیان بۆ بەکار دەهێنرێت‌و باش ئەبن بەلام نزیکەی 5٪ی ئەم نەخۆشانە هەرچەند نەخۆشی‌یەکەیان سوك دەبێ بەلام بەتەواوی چاك نابن وەبەداخەوە ئەڵێم ئەوانەش دەبێ بۆ ماوەیەکی زۆر لەژیانیان هاتوو چۆی پزیشك بکەن تا بەتەواوی چارەسەر بکرێن .

پاش ئەوەی کەمرۆڤ چاك دەبێتەوە پێویستە بۆماوەی شەش مانگ تاکو ساڵێك هاتو چۆی پزیشکەکەی بکات‌و دەرمان بخوات لەبەر ئەوە تا جارێکی‌تر تووشی نەخۆشی‌یەکە نەبێ یان هەر نەبێ تووش بوونەکەی دواکەوێت .

هەندێك مرۆڤ تووش نابن جارێکی تر بەلام ئەگەر تووشیش بوون زوو هەستی پێ‌دەکەن وەدەڕۆن بۆلای پزیشکەکەیان تاکو نەگە یشتونەتە قۆناغی شڕ بوون .

ئەوەی شایەنی باسە زۆر ئافرەت‌و پیاوی بەناو بانگ هەیە لەجیهاندا کەئەم نەخۆشی‌یەیان هەبووە وەهەیە وەهیچ نەبوتە هۆی دواکەوتنیان لەژیانیاندا .



# پزیشکیی ئاژەڵ لە خزمەتی ئادەمیزاد دا

○

د . کەریم خۆشناو

هەر بوارێکی ژیان بتوانێت خزمەتی ئادەمیزاد بکات پێویستە گرنگی پێبدرێت و پشت گوێ نەخرێت ئەگەر بێت و ئەم بوارە بریتی بێت لەهونەر یان ڕەوشەنبیری یان تەندروستی ... هتد لەم ڕووەوە پزیشکی ئاژەڵی یەکێکە لەم بوارانەی کە خزمەتێکی گرنگی ئادەمیزادی کردووەو بەردەوامەلە یارمەتی دانی ئادەمیزادو بگرە بوەتە پێویستیەکی ڕۆژانەیی و هەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ فەرامۆشی بکات چونکە دوو لایەنی گرنگ هەیە بۆئەم مەبەستە یەکەمیان لایەنی ئابووری یە کە ئەوەش هەموو بەرهەمەکانی ئاژەڵ دەگرێتەوە کەپێویستیەکانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد دابین دەکات ، دووەم لایەنیش بریتی یە لە تەندروستی ڕاستەوخۆی ئادەمیزاد بەهۆی هەوڵ دانی پزیشکانی ئاژەڵ بۆ نەهێشتنی گواستنەوەی جۆرەها نەخۆشی هاوبەشی نێوان ئاژەڵ و ئادەمیزاد (Zoonotic diseases) بۆ ئادەمیزاد لە ڕێگەی دەست نیشان کردنی نەخۆشیەکانی ئاژەڵ و چارەسەرکردنی هەندێکیان و لەناوبردنی ئەو ئاژەڵانەی

کە چارەسەر ناکرێن یاخود کۆگەن (Reservoir) بۆنەخۆشی دژوارو کوشندە یان کوتانی (Vaccination) ئاژەڵ دژی نەخۆشی هەمەجۆر ، ئەم کارانەی پێشوو هەمووی دەکرێن لەلایەن پزیشکانی ئاژەڵ چونکە ئەگەر هاتوو نەکران زیان لە ئادەمیزاد دەدەن لەدوو ڕووەوە یەکەمیان کەم بوونەوەی بەرهەمی ئاژەڵ دووەمیش لەڕووی تەندروستی یەوە ، بەلام تاکو ئیستا هەندێك لەکۆمەلانی خەلك لە ڕەوشە نبیران و نارەوشەنبیران گرنگی بەم لایەنە نادەن بەلام هەرچۆنێك بێت تەندروستی ئاژەڵی جێگەی خۆی کردۆتەوەو هەنگاوی گرنگی بەرەو پێشەوە ناوەو شان بەشانی هەموو زانستەکانی تردەڕوا بەرەو گەشە کردن . ئەوەی گرنگ بێت لای ئێمە لەم باسەدا ئەوەیە کە دەیەها نەخۆشی درمی (Infectious diseases) هەن کەلە ئاژەڵەوە دەگوێزرێنەوە (Transmit) بۆ ئادەمیزاد وەهۆی ئەم نەخۆشیانە بریتین لەچەندەها زیندەوەری ووردبین (Micro organisms) وەکو میکروب (microbes) و پالاوتە (ڤایروس = Virus) و کەڕووی نان



(Fungus) و چەندەها کرمی مشەخۆر (Parasitic worms) و چەندەها هۆیتر ، کەرێگەی گواستنەوەیان بۆ ئادەمیزاد زۆرە بریتییە لەرێگەی کۆئەندامی هەرس (Digestire system) بەهۆی خواردنی گۆشتو خواردنەوەی شیرو بەرهەمەکانی یان خواردنی جۆرەها سەوزەی پیس‌بوو بە پاشەڕۆی ئاژەل یان لەرێگەی پێست بەهۆی دەست لێدانی ڕاستەوخۆی (Direct contact) ئاژەل بەتایبەتی ئەگەر هاتوو دەستی ئەوکەسە بریندار بێت ئەمەش لەئەنجامی مامەلە کردن لەگەل ئاژەل لەشوێنی سەربڕینی ئاژەلان و یان کارکردن لەکێلگە ئاژەلیەکان (Animal farms) یاخود ئەو مالانەی کەسەگو پشیلە بەخێو دەکەن وەکو هیوایەتێك یان بەهۆی گەستنی (Biting) ئادەمیزاد بەتایبەتی لەلایەن سەگەوە ، ئەگەر هاتو ئەم سەگە تووشی نەخۆشی بووبێت ، ئەم ڕێگایانەی باسمان کردن بۆ گواستنەوەی نەخۆشی ، پێویستە خۆمانی لێ دووربگرین چونکە ئەگەر نەخۆشیەکە گوێزرایەوە بەیەکێك لەم ڕێگایانە ئەوا چارەسەری زۆر گرانە بەتایبەتی هەندێکیان ، یەکێك لەم نەخۆشیە کوشندانەی کەبەهۆی گەستنی سەگ (Dog biting) دەگوێزرێتەوە بریتییە لە نەخۆشی (هاری) یان (هاربوون = Rabies) ئەگەر بێتو سەگەکە هار (Rabid dog) بێت وەنیشانەی ئەم نەخۆشیەی لێ بەدیار کەوتبێت . ئەم نەخۆشیە بلاوە لەجیهان (World wide) وەلە عیراقیش تۆمار کراوە بەزۆری بەلام لەم سالانەی دوایی کەم بۆتەوە بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕادەی ڕەوشەنبیری لەئەنجامی هاوکاری کردنی خەلك لەگەل نەخۆشخانە ئاژەلیەکان ، ئەم نەخۆشیە تووشی هەموو جۆرە گیانەوەرێك دەبێت بەتایبەتی (سەگ) ، وە ئاژەلەکانی تر بەپلەیەکی کەمتر ، ئادەمیزاد وەکو ووتمان لەئەنجامی گەستنی سەگ (بەتایبەتی)و ئاژەلەکانی تر تووش دەبێت .

وەهەروەها تووشی جۆرێك لەشەمشەمە کوێرە (Bat) دەبێت بەلام شەمشەمەکوێرە تەنها ئەم ڤایرۆسەی (کەهۆی ئەم نەخۆشی‌یەیە) هەل گرتووە (Crriers) خۆی تووش نابێت بەلکو هۆی بنەڕەتی‌یە بۆ تووش بوونی سەگ چونکە ئەم جۆرە شەمشەمە کوێرە سەگ دەگەزێت و ڤایرۆسی ئەم نەخۆشیە دەگوازێتەوە بۆسەگو تووشی سەگ هاری (Canine — rabies) دەکات وەسەگی هاربووش ئادەمیزادو ئاژەلی تر دەگەزێت و تووشی هاربوونی دەکات . هۆی ئەم نەخۆشیە وەکو باسمان کرد جۆرە ڤایرۆسێکە کەسروشت وا دروستی کردووە بەدەمارەکان (Nerves) دەگوێزرێتەوە بۆ کۆئەندامی دەماری سەرەکی (Central nervous system) و مێشك (Brain) لەوێش دەست بەزۆربوون دەکات .دوای زۆر بوون (Praliferation) لەرێگەی دەمارێکی تایبەتی کەپێی دەوترێت (Olfactory nerve) بۆ لیك‌ڕژێنەرەکان (Salivary glands) لەوێشە وەبۆ لیك ، نیشانەکانی نەخۆشی هاری بەدیار ناکەوێت تاکو ڤایرۆسەکە لەمێشك دەست بەزۆر بوون نەکات وەسەگ دەتوانێ ئەم نەخۆشیە بگوێزێتەوە تەنها دوای دەرکەوتنی نیشانەکان چونکە لەم کاتەدا ڕێژەی ڤایرۆس زۆرە لەلیك (Saliva) وەماوەی چوونە ژوورەوەی ڤایرۆس بۆ ناولەش تا دەرکەوتنی نیشانەکان (3 — 6) هەفتەیە وەگرنگترین نیشانەکان لەسەگ بریتییە لەگەڕان بەبێ هۆ (Aimless wandering) وەگەستن وەهاتنە خوارەوەی لیك بەزۆری و کرانەوەی دەمو هیچ نەخواردن و نەخواردنەوەی ئاوو لێترسانی لەئاو (Hydrophobia) دوایی یەکسەر سست (Lethargy) دەبێتو دەکەوێت وەلەماوەی (48) کات ژمێر دەمرێت . لەماوەی گەڕانی سەگی هار ئەگەر هاتوو تووشی ئادەمیزاد هات ئەوا دەی گەزێت بەبێ گومان وەتووشی ئەم نەخۆشی‌یەی دەکات بەلام لەبەر ئەوەی ئەم ڤایرۆسە لەسەر خۆ بەدەمارەکان دەڕوات بۆ مێشك ئەوا هەرچەندە شوێنی گەستنەکە دووربێت لەسەر ئەوا درەنگتر نیشانەکان بەدیار دەکەون وەدوای دەرکەوتنی نیشانەی ئەم نەخۆشی‌یە لەئادەمیزاد چارەسەر ناکرێتو دەمرێت بەلام پێش دەرکەوتنی نیشانەکان پێویستە زوو بکوترێت بۆئەوەی بەرگری پەیدا بکات . لەبەر ئەوە پێویستە هەرکەسێك سەگ یان پشلیە پەروەردە دەکات لەمالەوە کارتی تایبەتی هەبێت و گیانەوەرەکەی بکوتێت دژی ئەم نەخۆشیە دژوارە ، ئەمە نموونەیەك بوو بۆ زیاتر لە (60) نەخۆشی دژوار کە دەگوێزرێتەوە لەئاژەلەوە بۆ ئادەمیزاد .

## پرچی پەخشانە

هەڵبەستی : جلال جۆبار

ئاوازی : کۆن

ئامادەکردنی : ووریا ئەحمەد

گوتنی : ئیبراهیم سابیر

یارم بێشپانە    پرچی پەخشانە
بەسەر کوڵوانە    شالی سەرشانە
مەزەی چاوانە    قیبلەی لاوانە
کارمامزەکەی دەم    چۆم و ئاوانە

* * *

وێنەی بێگەردی    پڕ خالی ووردی
لەگەل ملوانکەی    گەردنی زەردی
کە سەیری دەکەی    بە بەرگی کوردی
نازانی دلت    کامیان بوو بردی

* * *

گیان سووك و ناسك    چەند خنجیلانە
قولنگی پێشەنگی    قافلەی مەلانە
خەرمانی گولانە    مەلبەندی دلانە
قەشەنگ ڕسکاوی    نەخشی یەزدانە

● ئەم گۆرانی یە سالی 1978 ، بە یارمەتی تیپی هونەری هەولێر ، بۆ تەلەفزیۆنی رەنگاو رەنگی بەغدا تۆمار کراوە ..

## خرینگە

ئاوازو هەلبەستی : کۆن

ئامادەکردنی ● ووریا ئەحمەد
● رزگار خۆشناو

گوتنی : جەعفەر کوردستانی

هەخرینگە بابم خرینگەو    خرینگەی ناو گوڵان
دەم لەناوی دەم خرینگەو    دەست لە مەمکولان

* * *

زۆرم نەماوە خرینگە    بمنێن لە قەفەس
نەچاو تێر دەبێ خرینگە    نە دل دەڵێ بەس
عاشقی ئەو یارەم خرینگە    تا ئاخیر نەفەس

* * *

هەی دادو بێداد خرینگەو    ئالوودەی دەردم
بۆ روحمێ ناکەی خرینگەو    بە ڕەنگی زەردم
مندالی دوێنێم خرینگەو    تۆ پیرت کردم

* * *

دەترسم بمرم خرینگەو    بە جوانە مەرگی
بمنێنە ژێر خاك خرینگەو    نالەی دلتەنگی

* * *

هەی دادو بێداد خرینگەو    کەس دیار نی یە
کەس لە دەردی کەس خرینگەو    ئاگادار نی
ئەمنی کوشتووە خرینگەو    ئاگای لێم نی یە

● ئەم گۆرانی یە سالی 1978 ، بە یارمەتی تیپی هونەری هەولێر بۆ تەلەفزیۆنی رەنگاو رەنگی بەغدا تۆمار کراوە ..

نووسینی عزیز الشوان
له (الموسیقی للجمیع)

# بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ ببن بە دانەری مۆسیقا

جان تۆماس کوبی
وەریگێڕاوەو ئامادەی کردووە

لەبەر کەمی ئەم بابەتە لە کتێبخانەی کوردیداو، نەبوونی ئامۆژگاو قوتابخانەی پسپۆڕی بۆ ئەم مەبەستەو لەبەر ئەم ئاواز دانەرانەی کە ئاوازی مۆسیقاو گۆرانی کوردییان کردووتە دارێکو بە تەوشوو بیور بە ئارەزووی خۆیان دەیتاشن. منیش بڕیارمدا لەم بارەیەوە شتێ ئامادەبکەمو رۆشناییەك بخەمە پێشچاو بۆ ئەوەی هەموو لایەك سوودی لێوەرگرینو ڕێڕەوێکی تازەو زانستانە بگرین بۆ داهێنانی گۆرانیو مۆسیقاییێکی کوردی ڕەسەنو هاوچەرخ.

«جان»

● دانەری مۆسیقا کێیە ؟

گەر لە ناخی ئەو کەسانە بکۆڵینەوە کە هونەرکارن وەکو شاعیرو هونەرمەندی تەشکیلو دانەری مۆسیقا .. بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کارەکەیان بریتییە لە (دەربڕینی) هەستو بیر، وەهەر جیاوازییەکی لە نێوانیاندا هەبێت ئەوە تەنها بابەتەکەیەو بەس کە ئەمیش لای شاعیر ووشەیەو لای تەشکیلی ڕەنگە یا بەردە یا دارەو، لای دانەری مۆسیقاش دەنگە جا (چ لە قوڕگی ئادەمیزادەوە دەربچێت وەیا لە ئامێرە مۆسیقییەکانەوە کە بە کاری دەهێنێت).

... بەهرەوەرەکان دەتوانن فێری هونەرو کاری جوان ببن، یا بگەنە پلەیەکی بەرز لە لێدانی مۆسیقاو گۆرانیو خوێندنەوەی نۆتە. بەڵام دانانی مۆسیقا وەکو دەربڕینێکی هەستو خەیاڵ بە ئاوازەوەو پێشکەش کردنی بە شێوەی کردارێکی هونەری ڕێكوپێك کەوا نرخی هونەری خۆی هەبێ، لەڕاستیدا ئەمەیان بەهرەیەکی تایبەتییەو مرۆڤ ناتوانی فێری ببێ بەهۆی کتێبو مامۆستا بەڵکو پێویستە ئەم بەهرەیە لەگەڵ توانای داهێنانو خەیاڵ فراوانی ئەم مرۆڤەدا هاوشان بن.

... دانەری مۆسیقا دەبێ چەند «مقومات» ێکی تیابێ بۆ پێگەیاندنی لایەنی فیکریو هونەری تا بتوانێ بگاتە ڕێبازێکی تایبەتی لە دانانی مۆسیقاو جیاوازی هەبێ لەگەڵ دانەرانی تردا و ئەم «مقومات» انەش ئەمانەن :

- شارەزاییێکی تەواوی هەبێ لەبارەی تیۆرو زانیاری مۆسیقای وولاتەکەی خۆیو جیهان، وەکو مەقامات، هارمۆنی، بۆلیفۆنیو نووسین بۆ ئامێرە مۆسقییەکان.
- * دەبێ بتوانێ «پیانۆ» لێبدا یا بە لایەنی کەمەوە ئامێرێکی ژێدار، وەیا هەوایی بزانێ بەکار بهێنێ.

* توانای لێدانی سەربەخۆ «Improvisation» «إرتجال»ی هەبێت ، واتە توانای دانانی کت و پڕی هەبێ .
* بتوانێ شتی باش و خراپ (لەهەمو چەشنەکانی هونەرەوە) لەیەکتری جیا بکاتەوە .
* هۆشیارییەکی قووڵی نەتەوەیی هەبێ و ئاگاداری ئەو دەورو بەرە بێت کە تیایدا گەورە بووە .
* شارەزاییکی فراوانی لەبارەی هونەری میللییەوە هەبێ (چ بە گوێ گرتن یا خود بەچاو دیتن) .
* شارەزابێ لە مۆسیقای جیهانی لەهەموو چەرخەکان و لایەنە هونەرییەکانەوە .
* ئاگاداری ژیانی ڕۆشنبیری ناوخۆو دەرەوەی وڵات بێت .

... بە شێوەیەکی تایبەتی دەبێ دانەر خوێنەرێکی چاکی هەموو چاپەمەنییەکی ڕوشنبیریو هونەری بێ کە دەکەوێتە بازاڕەوە .

... **دانانی** کردارە مۆسیقییە گرینگەکان وەکو «سیمفۆنیا» «ئۆپرا» و «بالێە» پێویستی بە پلەیەکی بەرزی ئاستی فیکریو ڕۆشنبیریو هونەریو زانیاری هەیە ، تا بگاتە پلەی بلیمەتی لە داهێنانی کردارەکاندا . دانەریش پاش چەندەها ساڵی دوورو درێژ لەبەردەوام بوون لە ئیشکردن و نووسیندا بۆ ئامێرەکان و دەنگە ئادەمیزادەکان ، هەر لە ئاسانترین پێپیلکەی پەیژەی مۆسیقاوە بۆ ئاڵۆزترینیان لە داڕشتنی قالبە مۆسیقییەکاندا تا دەگاتە ئەم ئامانجە .

... **نیشانەی** دانان لای بەهرەوەران بە شێوەی ئەندیشەی مۆسیقاو خەیاڵ و چەند ڕستەیەکی کورت کە لەسەر پارچە کاغەزێکی نۆتە دەی‌نووسن دیار دەدا . بەڵام بەرامبەریان سەرسام دەمێنن و نازانن چی‌بکەن بۆ ئەوەی ببێتە کردارێکی مۆسیقای تەواوو نرخی هونەری خۆی هەبێ . لێرەدا دەوری (دیراسەتی دانان) دەردەکەوێ ئەویش ڕێ نیشان دەرێکە بۆ هەنگاوەکانی بەهرەوەران کە دەی‌هاوێن ، بۆ گەیشتنە پاکترین ڕێباز لە پێناوی پەرەپێدانی ئاوازەکانیان و چارەسەرکردنیان بۆ داڕشتن و بنیات‌نانی کردارێکی مۆسیقای ڕاست و جوان .

...**بەهرە** شتێکە خوا بە مرۆڤی دەبەخشێ ، بەڵام بەهرە وەیا لێکۆڵینەوە بە تەنیا بەس‌نییە بۆ دانەری مۆسیقا ، چونکە هەروەکو دەزانین هەموو ئەوانەی دەرچووی ئاموژگا مۆسیقییەکانن دانەر نین . دانەر ناگاتە ئەم پلە دەست‌نیشان کراوە تا بەردەوام نەبێ لە چێژتنی زام و کارکردن لەگەڵ بابەت و دەوروپشتی خۆی تاکو بگاتە ڕادەی دەربڕین و بە ئاسانی لایەنە جوانەکانی بە باشی تێ‌بگا بۆ داڕشتنی کارێکی مۆسیقایی پتەوو ڕازاوەو پڕ هەست و سۆز .

فەیلەسوفی ئەڵەمانی «هیگل» (1770 — 1831) دەڵێ :

«مۆسیقا ئەندازەیەکی ئاوازییە دانەر بەسەر ڕووبەرێک لەکاتدا دەی نەخشێنێ» ، بەڵێ دەربڕین بە مۆسیقا کردارێکی گرنگە چونکە حیسابات و ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیەو توانای داڕشتن و پێکهێنان بەشێکە لە چاپوکی دانەرو زیرەکییەکەی وەدەر دەخات کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆری کردارە بەرزەکانی دانەرە ناسراوەکان و شی‌کردنەوەی کارەکانیان زۆر بە ووردیو بەردەوام بوونی لەدانان و لێدانی مۆسیقا ، (کە بەبێ ئەم دوو کارە) داهێنان و بەهرە ناشێن کارێکی بەنرخ بهێننە کایەوە .

... **دانانی** مۆسیقای ڕاست بە (بابەتەوە) دەست پێ دەکا کە لەگەڵ دانەر دەژیێ و دیراسەتێکی قووڵی هەموو لایەنەکانی دەکا تا لە ناخیدا هەست و خەیاڵ دەست بە جووڵە دەکەن بە شێوەی چەند ڕستەیەکی مۆسیقای ناسک سەر هەڵدەدەن ئەمیش دەربڕینە لە ناخ و دەروونی دانەرەکەوە ، هەنگاوی دووەم چۆنیەتی داڕشتنی ئەم هەست و دەربڕینە لە قاڵبێکی گونجاوی فیکرو ناوەڕۆکەکەیەوە .

... **هەندێک** لە دانەرانی مۆسیقا کە بە دوای (ئەندیشەی مۆسیقاوە) دەگەڕێن بە پەنجە یاری بە ئامێرە مۆسیقییەکان دەکەن بۆ ئەوەی بە ڕێگای (ڕێکەوت) چەند نەغمەیەکیان دەست بکەوێ ، واتە پەنا دەبەنە بەر پەنجەکانیان نەوەك بەر هۆش و سۆز ، ئەمە ڕێگاییکی چەوتە (با دانەر توانایێکی بەرزیشی هەبێ لە لێدانی مۆسیقادا) . ئەندیشەی مۆسیقا تێکەڵەیەکی نێوان فیکرو سۆزە ، یەکەمجار لە مێشکی دانەردا پنج دەگرێ پێش ئەوەی دەری‌ببڕێ بە ئامێری مۆسیقا یاخود بە نووسین ، لە خەیاڵیدا گەلۆرە دەکاو لەدواییدا دەینووسێتەوەو ئینجا بە ئامێر زێتر بریقەی دەداتێ (بە بڕین و زیاد کردنی ڕستە مۆسیقییەکان) ، لەدواییدا دەگاتە ئامانجی وەژیان هێنانی کردارێکی هونەری تازە .

... توانای دارشتنی ئاواز بەهەستو هۆش (نەك بە پەنجە) یەکێکە لە پێویستیی‌یەکان کە دەبێ دانەر پەیرەوی بکا ، ئەویش بە بەردەوام بوونی لە مەشق‌کردن‌و کارکردنەوە وەری ـەگرێ . لە مێژووی مۆسیقادا نموونەی زۆر هەن لەبارەی ئەو دانەرانەی کە زۆر چەلەنگ نەبوون لە لێدانی مۆسیقا وەکو (هیکتۆر بەرلیۆز)ی فەرەنسی‌و (بالاسانیان)ی سۆڤیەتی کەوا پەنجەکانی دەستی راستی لە شەرڕدا برابوون .

... **برای** دانەر ، لەداناندا هەردەم شارستانیەتی گەلەکەت بخە پێش‌چاو ، نەك خۆپەرستن‌و خەمی ئەوەت‌بێ بەزووترین کات بناسرێی‌و دەوڵەمەند بیت . تۆ کە دانانی مۆسیقا دەکەی بە پیشە ، دەبێ بە درێژایی ژیانت لەگەڵیا خەریك بیت‌و وازی لێ‌نەهێنی‌و هەردەم لە نووسین‌و دیراسەت‌و کۆشش‌بی چونکە تۆی هەڵگری ئەم چرا پیرۆزەو خاوەن نامەیێکی نەمری ، جا هیچ کاتێك درێغی بۆ نەکەی .

ئەمەش باش بزانە ئەم ئەرکەی تۆ ئەرکێکی گرینگەو پڕە لە مەترسی چونکە داوا لەتۆ دەکرێ بۆ پەرەپێدان‌و تازە داهێنان لە مۆسیقاماندا بۆ ئەوەی لەدوا رۆژدا لەهەموو شوێنێك دەنگ بداتەوەو بناسرێ بە مەرجێ مۆرکی جوانی سروشت‌و باری کۆمەڵەکەمانی تێدا وون نەبێ . جا لێرەدا پێویستە شارەزای رەگەکانی مۆسیقای کۆن‌بێت‌و ، لەچەرخی تازەشەوە شتێ بزانێ ، چونکە تۆ بۆ وولاتەکەت مۆسیقای دوارۆژ دادەنێی‌و ئەوەی دەینووسی دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ ئەوەی لە دوا رۆژدا پەنای بۆ ببەن‌و سوودی لێ‌وەرگرن .

... **هەموو** نەتەوەیێك شانازی بە کەلەپووری میللی خۆی دەکاو بەهۆی ئەوەوە خۆی زیاتر دەناسێ چونکە هونەری میللی (ووشە ، جووڵە ! یاخود ئاواز) ئاوێنەیەکە تیشکی ژیان پەخش دەکاو مێژووی گەل‌و باری کۆمەڵەکەت بۆ روون دەکاتەوە . دانەری مۆسیقا دەبێ ئاگاداری لە هونەری میللی گەلەکەی هەبێ‌و هەردەم زێدە بایەخی پێ‌بداو بە شوێنیا لەگوندو دێهاتەکان بگەڕێ‌و شی‌یان بکاتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ میللەت‌و گەلەکەیدا پتەوتر بکات ئەو گەلەی مایەی شانازی‌و بەختەوەری ئەوە .

... ئاوازە میللی‌یەکان وەك گەوهەرو یاقوت وان کە دانەر دەتوانێ کردارە مۆسیقی‌یەکانی پێ برازێنێتەو مۆرکی رەسەنایەتی گەلەکەی تێدا دیار بخا ، هونەرمەندی راستەقینەو لێهاتوو گەر هەڵبژاردنی ئاوازەکانی راست‌بن‌و بتوانێ چارەسەریان بکاو بیان خاتە شێوەو روخسارێکی تازەوە ، یەکسەر جێگاو شوێنی خۆیان لەناو دڵی جەماوەری خۆمان‌و بێگانەش‌دا دەچەسپێنن .

ئەم رێ‌رەوە بوو کۆمەڵەی لایەنە نەتەوایەتی‌یەکان لە دانانی مۆسیقا لەچەرخی رۆمانتیك‌دا لە سەرانسەری هەموو ئەوروپادا گرتیانەبەر ، کە تیایدا شان بە شانی مۆسیقای (إنساني) بریسکەی نەریتی مۆسیقای خۆماڵی تێدا دەبینراو لە هەموو جیهاندا بڵاو دەبووە .

... لە لایێکی ترەوە کرداری مۆسیقا کەوا لە (ئیلهامی) میللی‌یەوە وەردەگیرێ ، دەبێتە پردێك گوێ‌گری ساکار بەسەریا تێپەڕ دەبێ (لە هونەری میللی‌یەوە بۆ کارە هەرە بەرزەکانی دانانی وەکو «سیمفۆنیا» ) بەبێ ئەوەی رێ وون بکا یاخود لەم ڕێبازە زانیاری‌یە وەڕس‌بێ .

... **چەند** راستی‌یەکی تر هەت پێویستە دانەر پەیرەوی‌یان بکات بۆ ئەوەی کردارەکانی سەرکەوتووبن :

- ئەوەی مۆسیقا دەنووسێ دەبێ دووربێ لە دووبارەکردنەوەی رستەو زۆر بڵێی کە (ووردەکاری‌و فیکرو مانای تازەی تێدا نەبێ) .
- دووبارە نووسینەکان لە کاری تازە سەر هەڵ نەداتەوە بۆ ئەوەی بەرهەمەکە بێ‌تام و چێژ دەرنەچێت‌و لاواز نەبێت .
- با ئەندیشە مۆسیقی‌یەکان تازەبن‌و دووربن لە لاسایی کردنەوەو لە بەرهەمی تر نزیك نەبنەوە .
- با دانانەکان پڕبن لە جوانی‌و لایەنی هونەری .
- با خەیاڵە مۆسیقی‌یەکان لەگەڵ (بابەتەکە)دا بگونجێن .
- ناوو ئەدرەسی سەیرو بریقەدار نەدرێتە پاڵ کارو نووسینە هونەری‌یەکان کە لە گەڵیانا ناگونجێ تاوەکو لە نرخی بەرهەمەکە کەم نەکاتەوە .
- دەبێ هەردەم نووسین‌و بەرهەمەکان لە ڕاژەی میللەت‌و گەلدا بێت ، نەوەك تایبەت بێت بە چینە تایبەتی‌یەکانی کۆمەڵ وەیا بۆ «هۆڵەکانی کۆنسێر» ئامادە کرابێت ، دەبا کردارەکان هەردەم سادەو ساکاربن‌و ئاوازەکان بەجۆش‌و خرۆش‌بن ، بۆ ئەوەی زووتر جێگایان لەناو دڵی جەماوەردا بکەنەوەو پتەوتر پنج لەنێو کۆمەڵدا دابکوتن‌و زیاتر بەناخ‌و دەروونی مرۆڤدا بچنە خوارێ .

## دنیای هونەر ٨

★ نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد ★

# لە دوو پیشانگای هونەرمەند «هیمەت» دا

* لە پیشانگای یەکەمیەوە بۆ پێشانگای دووەم، کاك هیمەت، بە ئەزموونێکی هونەریی رەسەندا تێپە ڕیوە، سەرمەشقی کارەکانی لەمەڕ مرۆڤ و ململانێی لەگەڵ کێشە سەختەکانی دەرەوەو ناوەوەیەتی، ئەو چەشنە مرۆڤانەی لەتابلۆکانیدا بە دیاریان دەخات، سەبارەت بە ئێمە، نامۆنین، لەگەڵماندا دەژین، بەشێکن لەژیانی ئێمە، وێڕای ئەمانەش گوزارشت لە خاك و هەوای جێ نشینی و گوندەکانی کوردستانیش دەکات .

* کاك هیمەت لە ساڵی 1961دا لە خێزا نێکی هەژارو کەش و هەوایەکی جووتیاریدا لە دایك بووە، لەدێی «عەلی سەرای» سەر بە شاری کەرکووك پەروەردە بووە، قووتابخانەی (پیرەمێرد)ی سەرەتایی لە کەرکووك تەواو کردووە، بەلام سەختیی ژیان بواری ئەوەی نەداوە کە قووتابخانەی ناوەندی لە (ئیمام قاسم) تەواو بکات، خۆی وتەنی (بە رۆژ ئیشم دەکردو بە شەویش دەمخوێند»، وەنەبێ ئەم تەرزە ژیانە بەرەو ڕێگایەکی نادیاری خزاندبێ، بەڵکو، زیرەکانە توانی سوود لە رەنگ و بۆیەو قوڕو ژیانی لادێیی لە شوانکاریی و نەخش و نیگاری سەر بەرە وەربگرێ، ئاوا پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ ژینگە مندالیـیـەکـەیـدا هەبوو : خاك، خەونی سەوزی مندالانەی، بازدانێکی نەوعی، واتە هێلکاریەکانی هیمەت ئەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی مندالیی، بۆیە بەساکاری روو بەرووی کێشەکانی ژیان دەبێتەوەو رەنگی رەش و سپیش بالادەستە لە تابلۆکانیدا ...

* (شاکر حسن آل سعید)ی وێنە کێشی عێراقی دەڵێ «هیمەت محمد علی، لە سەرەتای کاروانی هونەریدا، لە خۆیا دیاردەیەکی کەم هە لکەوتووە، ئەو لە هیچ قووتابخانەیەکدا فێری هونەری وێنە کێشان نەبووە، پرۆسەی ئەو کارەی نەکردووە تەنها لە ڕێگای شارەزایی تایبەتیی خۆی و تێبینی و پێشنیاری برا گەورەکەی (مدحت) فێری بووە، لەگەڵ ئەوەشدا وێنەکانی پڕیە لە هەموو داهاتێکی هونەری نوێ، هەروەها دەڵێ «ئەو دەیەوێ لەهونەرەکەیدا چارەسەری واقیع بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێ بە نموونە ئەو واقیعە بنوێنێ».

* کاك هیمەت خۆبەخۆ هاتە ناو دنیای بەرفراوانی هونەری وێنە کێشانەوە، بەلام توانی بەدانسقەیی و لێهاتوویی، خۆی لەو ئۆقیانووسە بەرفراوانەدا بگرێتەوە، دەست رەنگینی و سەلیقەیی ئەم هونەرمەندە، راستیی ئەم قسەیەمان بۆ دەر دەخات . یەکەم پیشانگای لە 1982/10/26 لە هۆڵی هونەری نوێ لە شاری کەرکووکدا کردەوە، بۆ دووەم جاریش لە 1983/6/21 لە هۆڵی رەشید لە بەغدا پیشانگای دووەمی کردەوەو 28 تابلۆی جۆربە جۆری تیا پێشان دا.

* کە چاومان بە دەفتەری تیا نووسراوی بینەرانداگیرا، بینیمان کاك (عەبدوللا سەراج) نووسیویەتی «رەنگ، هێڵ، وشەو ... هتد ئەگەر هاتوو لە ناخی دلەوە هەلقولابن، بێگومان لە ناڤ دلان دەچەسپێن و هەمیشە کاریگەر دەبن، ئەمرۆکە، لە هەموو رۆژێك زیاتر، پێویستیمان بۆ ئەم چەکانە (رەنگ، هێڵ، وشە، دەنگ) بۆ گۆڕینی باری ناهەمواری تاڵ و پڕ ناسۆریمان هەیە، هونەرمەند هیمەت یەکێکە لەوانەی کەژانگرتووی بارێکی وایە کەلە دوارۆژدا زۆر ئومێدی بە خششی لێ بکەین، بەلام هەندێك پێویستیی بەروون بوونەوەو نزیك بوونەوە هەیە لەبینەران، بەڵێ زۆری پێیە بەلام لەتابلۆکانیدا کەمی درکاندووە یانیش بە شاراوە درکا ندوویەتی».

هەروەها (جلیل القیسي)ی چیرۆك نووس دەنووسێ «لەدوای هەموو کاری داهێنانێك، بێشك، هۆشێکی دیالێکتیکی و ئیستاتیکی هەیەو ئەزانێ چۆن ئیستاو داهاتوو بەیەکەوە گرێ بدات، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هونەرمەند لەم پرۆسیسە ئالۆزەدا بەئاسانی مەبەست و خەونەکەی بدا بە دەستەوە. هیمەت بەرامبەر بە تابلۆکان سرت دەکا، بەسەرساسامیەوە رات دەوەستێنێ و کۆ مەڵێك پرسیارت لە لا دروست دەکات، کەچی وات لێ دەکات کە بچیتە ناو دنیاکەی ئەوەوەو هێماکانی



ـدۆزینەوە، ئیتر یان تەسلیم ئەبیتە دەست تابلۆکان‌و هەموو توانای زیهنی‌و رۆحی‌و رۆشنبیریی خۆت بەکاردێنی بۆ ئەوەی شۆڕ بیتە ناو جیهانە ئاڵۆزو ساکارەکەیەوە، کەپڕیە لە هیماو، کەلەپووری جوانی کوردی‌و، وێنەی جوان لە شەودا ... یانیش وازیان لێ دێنیت‌و لەگەڵ خۆتدا دان بەوەدا دەنێی کە تۆ نەئاستی تێگەیشتنی هیماو دنیا تایبەتیەکەی ئەودا نیت».

* کاك هیمەت بۆ خۆی دەڵێ : کاتێك لە تابلۆکان ورد دەبیتەوە، کەمێك چاوەڕوان‌بەو داوابان لێ مەکە بەئاسانی خۆیان بدەن بەدەستەوە، هونەرێکی ئاسان لەجیهاندا نیە چونکە ژیان ئاسان نیە، تابلۆکان داوات لێدەکەن کەبەشداری لەدۆزینەوەی مانای هیماو هێڵە بە یەکاچووەکاندا بکەی‌و بە هێمنی بچیتە ناواخنیەوە، هونەریش تەنها رەنگدانەوەیەکی فۆتۆگرافیانەی واقیع نیە، بەڵکو واقیعە بەگۆڕان‌و پێشکەوتن‌و تەموومژ یەوە، لە بریتی ئەوەی شتێکی ئامادەکراوت پێشکەش بکەم، هەندێ بەشی ئەو شتەم پێشکەش کردووی بۆ ئەوەی بۆخۆت بچیتە ناو دنیای حەقیقەتی هونەری نوێوە .

* پ : کاك هیمەت زۆر بایەخ بە شێوە نوێکانی هونەری ئەم سەردەمە دەدەیت، ئەمە چۆن؟

و : لە رێگای پرۆسیس‌و ئەزموونی خۆم‌و شارەزایی تایبەتیم گەیشتمە دەروازەی هونەری نوێ، لە سەرەتادا کارەکانم تەنها تەعبیری بوون‌و بەلام کەزۆرتر لەگەڵ واقیعدا ژیام‌و خزامە قووڵاییەوەو ناکۆکیەکانم دەرك پێکرد، پێوانەی هونەری نوێ‌و حەقیقەتی هونەرمەندم بۆ دەرکەوت، بۆیە لە جیاتی ئەوەی وێنەی شتێك بەتەواوی بکێشم، هاتووم بەشێکی ئەو شتەم کێشاوەو رووکارەکەیم دەرخستووە بۆ ئەوەی بینەر بۆ خۆی شتێك لێك بداتەوە کە مەسەلەیەکی خۆیی تیا رەنگ بداتەوە،

ئەمانەیشم بەتایبەتی لە تەشریحدا کێشاوە، بۆ نموونە تابلۆی (تەشریحی دەم‌وچاو) و (تەشریحی شاخ).

پ : گرنگترین بابەتی تابلوکانت چین؟

و : مرۆڤ .. خاك .. ژینگەو ئەو شوێنەوارەی تیاسەری هەڵداوەو نش‌ونمای کردووەو تیایا خەملیوە، مەبەستی سەرەکیم : مرۆڤە، پەیوەندیی بەکێشەکانی دەوروبەری، هەروەها لادێ بە هەموو شتێکی جوانیەوە : خەڵك‌و کانی‌و رەزو دارستان‌و شاخ، من‌خۆم بەوکەش‌و هەوایەوە بەستراوم‌و ئەمانە دەستیان گرتم‌و وێنەیان پێ کێشام، ئەمانە ئیلهام‌و هەستی هەنەرییان پێ بەخشیم، لەو چوارچێوەیەشدا چەق بەستنەبووم، بەکو چوومە دەرەوەی ئەمانەش.

پ : بە گەلێ شێوەو بە گەلێ کەرەسە تابلۆکانت نەخش دەکەی، هەڵبژاردنەکانت چۆنن؟

و : لە کارەکانم‌دا تەنها لە هەندێ شتی دیاری کراودا پەنگم نەخواردوەتەوە، هەر شتێك لەم سرووشتەدا بکری‌و سوودی هەبێ بۆ وێنەکێشان بەکاری ئەهێنم ، جگە لە زەیت‌و گرافیك‌و گرافیت‌و مەرەکەبی چینی ، چیمەنتۆو غەرەو جغ جغەو شتی تریش بەکار ئەهێنم ، بۆئەوەی سەربەستی ئەوەم بداتێ کە بە ئارەزووی خۆم‌و چۆنم دەوێ ئاوها بتوانم رەنگ‌و بارستایی‌و کێشی تابلۆکانم دروست بکەم ، هەروەها ئەو شتەی لە مێشکمایە دەری بیرم .

پ: هونەرمەند چۆن رێبازێکی هونەری دەگرێتە بەر ؟

و: ئەوەیان گرنگ نیە کە هونەرمەند لە بواری چ رێبازێکی هونەریدا گوزارشت لە خەم‌و ئازارەکانی ژیان دەکات تا ئەو ئەندازەیەی خزمەت کردنەکەی بە ئارەزووی خۆی رێبازێکی هونەری بۆ خۆی هەڵبژێرێ ، بەڵکو لە ئاکامی ئازارو خەمە قورسەکانی ژیان دەست بە وێنە کێشان دەکات‌و سەرەنجام واقعەکە خۆبەخۆ مەودای رێبازێکی بۆ دیاری دەکات ، ئەگەر لە خۆمیش بپرسی ئەوا دەڵێم رێبازی هونەریی من: تەعبیریی نوێیە .

● بە هەرحاڵ ، کاك هیمەت بە هەنگاوی لە سەر خۆو بڕوا بەخۆ بوونەوە پەل دەهاوێ‌و تابلۆکانی ئەم پیشانگایەی دوایشی شایستەی بینین‌و لێ ورد بونەوەو شی کردنەوەن ، بەلام کاك عەبدوللا سەراج وتەنی کەمێك پێویستیان بە روون کردنەوەی زیاتر هەیە .

# ئەڤروکە

● بهجت محمد هروری ●

1981 — 2 — 26

ئەڤروکە .. ! ؟
بەلێ ئەڤروکە ؟!
رەشە بایەك ..
خەمو تایەك

هاتو ب سەر ژینا مەدا
چەند بەلگێن « دارا ژینا مە »
لێ کرە پاییز .. وەراندن

مەمێن سوزدارێن ڤێ ژینێ
ئەڤرو ژڤێ ژینێ نڤاندن
لەو برانو ..!
تەڤ ساهی خو ڤەشارتو چو

عەور هاتو ..
کرە گری .. کرە گری
هێدی .. هێدی
چیکێت روندکا رژاندن
ئاگرێ کەلاو تازی‌یا

هەلبو .. هەلبو
هەر بو گوری .. نەڤەمری
خوشی ژ دورێن مە رەڤاندن

هو برانو ..!
ژ مێژەیە ...
مە ژین هویە .. ئەڤ رەنگەیە
دلێ مە بێ بویە کەڤر
تێ ناچن تیر
خوین یا بویە ، ئاڤو باران
پێ شین دبن زویر
بەلێ ، ژ دل ئەڤیندار بون
ناچیت ژ بیر
رێ دبری دحەواندن ئاهێن و ئازار
کوڤان و ڤیڤان و ستری
بەلێ .. بەلێ
ئەڤینی‌یا بویە « گورگەها »[1]
.. دلێ وا
ئەڤینی‌یا دلێ مەیە
ئەڤرو مەژی
هەر ئەو لەزە .. ئەو بزاڤە
هەر ئەو بی‌یە ..
هەر ئەو چاڤە
دا بار بکەت زستانا سار
سلاڤ بکەت سەرمە بەهار
سەر مە بەهار

(1) گیایەکە چ شینکاتی‌یا لبەر شین ببیت ئێدی تاڤەتێ ناکەت و بەری نادەت ، نەخاسمە لبەر بنێ باجان‌سورك و لناڤ تونێێ شین دبیت ، ئانکو .. دوژمنا شینکـاتی‌یێ‌یە و شینکاتی پێ دمریت .

---

ئیسماعیل تاها شاهین
دهوك

# سێ پێناس

1 ژین

کەفت و رەفتە ، پاشێ کەنی
دێ بینی رند دەستا برەنی
نابێ ژین بسەخت و فێلا
گەرە خوە تێنەکی شێلا
چەپ و راستێ دنێ ژخوەنە
چەرخێ ژینێ دەستێن تەنە

1977

2 ئاقلمەند :

تم ژ دل دەست ددە کاری
بێ بەلەنگاز هەرێ لهاری
خزمەت لنك نابنە یاری
بێداد نەشێن بێخنە تورێ

هندی مەژی د سەری مایە
خوەدی باوەر خوەدی رایە
برانی لنك سهـ و سایە
هەتا بێ دچن سەرێ گورێ

1982 / 4 / 18

3 بەرێ :

دکنە ئاخفتن و دبێژن :
بەرێ پیرە مێرەك بمرا ،
دا بارەکی رونکا رێژن
ژن دا سەرێ خوە ڤەچرن ،
کەزی دا ئەسمانا فرن
چ مرادا د دل دکوشتن !!
بمەهـ و سالا خوە نەد شوشتن !!
بو خاترا کالە مێری
جار بگری ، گەهـ بقێری
شینەکا بێ هەمتا دکرن !!؟

1982 / 12 / 24

هەڤال مایی
دهوك 1983/5/7

# لاوك و بەستەی شەوگار

شەونی یە با لقی داره بالآ بەرزەکان
نەخاتە سەماو
باڵندەکان نەجریوێنن
بە تەنیایی ئەستێرەکان نەژمێرم
هێژاکەم : شەو پرچی رەشتەو
تاڵەکانی خەمی ساڵانمان دەنوێنن !!

* * * *

هەموو شەوێ ....
تروسکایی چاوەکانت دەبینم
لەگەڵ بوونی پەرچەمتام تا بەیانی
شای ژیان و خۆشەویستیم
وا لەگەڵ کازیوەدا تەم دەیگرێ !
خەوەکان ... کەی دێنەدی ؟!
شەونی یە چەند تابلۆیەك
لەپێش چاوما سەما نەکات
رەنگی ژیان لەسەر لێوی مانگەشەو دیاری نەکات
ئاسمانی رازی پڕ لە ئارەزوو
لەگەڵ شەپۆلی فرمێسکی « وان » دا
سپیدە چاویان دەشوا
نیگار دەبێتە رەنگی تێك هەڵچوو
لاوك لەگەڵ بەستەی ژیان
بەرەو ئاسۆی نەدیو دەڕۆن !!

---

« دیاری‌یە
بو ئەڤیندارێت مهابادێ »

# هەدی یارا من

حەلا ندم سوتم
وێ بەژنا شەنگ و شەپال
ژ تاما ، ژیانێ فەدوتم
ئەوان کەزی و بسکێت دەلال
ئێش و ئازارا
خارم کەلوتم .
بو چول و چیا
ئەز پالدام هاژوتم .
ئەو روندکێت تێنە خارێ ژچاڤێت تە
وەك ئاڤا کانیێت زەلال .
هو شرینا من
ئەز چ بێژم ئو بو کێ بێژم
چەند روندکەکا ئەز برێژم
سەر سنگێ تەیێ سپی کەڤر
دلێ خو بگرم بکەلێشم
کول و کوڤانا ژێ بینمە دەر
ڤەت نائێنە دەر
نێ چونکی یارێ
هندی بێژن دبەلنگازین
هەر ئێك گەهشتە مرادا خو
سەیرانینە دچن سەیرانا
پێکڤە درینن
لبن سیبەرا دارێت مازی
لناڤ مێرگەکا پڕ ئاڤ تەزی
بەس ئەم بتنێ یارێ
بێت ماینە هوسا
رێکا لە بویە ئەڤرازی
رێکا لە بویە ئەڤرازی

رێدیر کورنەمەی

---



**چیرۆکی : « مۆپاسان »**
**« ئاراس عەزیز عەبدوڵلا »**
**لە ئینگلیزی‌یەوە وەریگێڕاوە**

لە حـەڤدەی تـەمووزی سـاڵی هەزارو هـەشت سەدو هـەشتاو سێ ، لەکـاژێری دووونیـوی شـەودا ؛ پـاسـەوانی گۆڕستانی « بێزیرس » کـەلەخانـوویەکی بچکـۆلە لەکۆتـایی گۆڕستانـەکەدا ئـەژیا .. وەڕینی سـەگە بـەندکـراوەکەی لە چێشتخانەکەدا بەئاگای هێنایەوە . دەست بەجێ هاتە خوارەوە . بۆی دەرکەوت کەسەگەکەی لەژێر ـ دەرگاکەوە بۆنی شتێکی کردووە ، بۆیە وابەبێ ئارامی‌و بەهێز ئەوەڕێ .. هەروەك چەند خشپـە خـشپـێـك بـەلای خـانـووەکـەدا ڕەت بـووبێ . « ڤنسێنت » ی پاسەوان تفەنگەکەی هەڵگرت‌و بەئاگایی‌یەوە ڕۆیشت . سەگەکەی ڕووی کردە ڕێگەی درەختاوی گشتی‌ی بونیت .. تۆزێك لەبەردەم پەیکەری خاتوو تومۆیسیۆدا وەستا . ڤنسێنت بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا .. لەپڕ ڕووناکی‌یەکی لێڵی لەڕێگـەی درەختاوی ـ « مـالین ڤێرس » دا بینی . لەنێـوان کێڵەکان‌دا حەپەسا .. هێزی تێدا نەما .. کارێکی هەتـا بڵێ‌ی سامناکی دژ بەکڵێسەی بەر چاو کەوت .

پیاوێکی گەنج کفنی ئافرەتێکی گەنجی ، کەڕۆژێك لەوەو پێش نێژرابوو ، دەرهێناوە . لاشەکەی لەگۆڕەکەوە دەرئەهێنا . چـرایەکی کـەم ڕووناکی بچکـۆلە لەسەر تـەپـۆڵکـەیـەك‌دا دانرابوو .. ئـەم دیمەنـە ناقـۆلایەی ڕوونـاك کرد بـووەوە . ڤنسێنت پـەلاماری داو دای بـەزەوی‌دا .. هـەردوو دەستی بەستەوە بەرەو مەخفەری پۆلیس کێشی کرد .

کابرا پارێزەرێکی گەنجی شارەکـە بوو .. دەوڵەمـەندو بەباشی ناسرابوو : ناوی .. « کۆربەتەلی » بوو .
درا بەدادگا . موددەعی گشتی ، سێرجنت بیـرترانـد ، کارە سامناکـەکەی خـوێندەوە .. دانیشتـوانی ئاگـادار کردەوە .. قەرەباڵغی‌یەکە بەڕق‌و ئیهانەکردن هەژابوو . لەگەڵ دانیشتنی دادوەردا هـاوار بەرز بـووەوە : « بیمـرێنن ! بیمـرێنن ! » . سەرۆك بەگران بێ‌دەنگی‌ی ئەهێنایەوە . پاشان بەدەنگێکی وا کەنیشانەی گرنگی‌و خەتەری بێ وتی : « تاوان بارکراو ، چیت هەیە بیڵێ‌ی بۆ بەرگری کـردن لەخۆت ؟! » کـۆربەتـەلی ، کە ڕەفزی قسەکەر لەجێ‌ی خۆی کردبوو ، هەستا . گـەنجێکی ڕووکار باش ، کەتەوپان ، ڕەنگ تێر ، دەم‌و ڕوو کراوە ، توندو پتەو ، چاو نەترساو .
قەرە باڵغی‌یەکە دەستی کردەوە بە فسە فس .
خۆی تێك نەدا . بەدەنگێکی کەمێك نووساو .. سەرەتا بەنزمی ، وردە وردە دەنگی هەڵبڕی‌و وتی :
« ئێوە ، بەشەرەفەکان ، گەورەکانی لیژنەی لەدادگادان ، چەند شتێکی کەم هەیە کەبیڵێم . ئەو ئافرەتەی کەمن گۆڕەکەیم هەڵکەند .. هاوسەرمە ، خۆشم‌ویستووە .
خـۆشم‌و یستووە ، نـەك خۆشـەویستی‌یەکی لەشی‌و شـەهوانی‌یانە ، نەك خۆشەویستی‌یەکی سادەو عاتیفی‌یانەی گیان‌و دل . بەڵکو خۆشەویستی‌یەکی موتڵەقی خاوێن ..
خـۆشەویستی‌یـەکی تەواو ، خـۆشەویستی‌یـەکی شێتانـەی ئازاراوی .
گوێم لێبگرن چیتان پێ‌ئەڵێم :
کاتێك بۆ یەکەم جار پێی گەیشتم .. هەستم بـەئیحساسێکی سەیرکرد کەتێم ڕوانی . ئەو ئیحساسە نەواق‌وڕمان بوو نەسەر سوڕمان .. ئەو خۆشەویستی‌یە نەبوو کەئەڵێن لەیەکەم بینین‌دا ئەبێ .. بەڵکو ئیحساسێکی واخۆش بوو هـەروەکو لەئـاوێکی شلەتێنی خۆشتن‌دا نوقم بـووبم وەهابـوو . جووڵانـەوەکانی

عەقڵو دڵی بردمو بەندی کردم .. دەنگی ئەفسووناوی کردم .. خۆشیو تامێکی بێبڕانەوەی وای دامێ کەسەرنج لەهەموو شتێکی بدەم .
من وادەرکەوتم کەلەمێژە ئەو ئافرەتە ئەناسم . وەکو لەوەوپێش بینیبیتم وابوو . ئەو ئافرەتە وا دەرکەوت کە بەشێك لەگیانی منی لەناخدا بێ . وەکو وەڵامی پرسیارێکی گەورەی گیانم وابوو .. ئەوپرسیارە نادیارو ئاڵۆزو بەردەوا مەی کەکێشمان ئەکات ڕووەو « ئاواتو هیوا » بەدرێژایی هەموو ژیانمان . کاتێك کەمێکیتر لەلام ئاشنا بوو .. تەنها ئەو بیرکردنەوانەی کاتی بینینی ، دیسانەوە سەرتاپای پڕکردم لەهەڵچوونو گرگرتنێکی قووڵو بەتامو توند .

دەستم بەر دەست کەوتنی لە لای من خۆشییەکی وابوو کەهەرگیز لەوەو پێش بۆی نەچوو بوومو خەیاڵم لێی نەکردبووەوە . زەردە خەنەکانی وای لەچاوەکانم کرد خۆشی بدرەو شێنەوە .. وای لێکردم هەست بەڕاکردنو ، سەماکردنو ، ڕۆیشتن بەسەر زەویدا بکەم .
پاشان بوو بە هاوسەرم .
ئەو زۆر لەمانە بۆمن زیاتربوو .. ئەو ژیانم خۆی بوو . ئاواتی ترم لەم زەوییەدا هیچ نەخواست ، حەزو ئارەزووی ترم لەمە زیاترنەبوو .

بەڵێ ئێوارەیەکیان پیاسەیەکی درێژمان ئەکرد لەلای رووبارەکەوە .. بارانمان لێ داباری .. ئەو هەستی بەسەرما کرد ، ڕۆژی دوایی تووشی هەوکردنی سییەکانی بوو . پاش هەشت ڕۆژیش مرد .

لەو ساتانەی کەتیایدا مرد .. ئەبلەق بوونو ترس ڕێگەی هەموو تێگەیشتنو بیرکردنەوەیەکی لێ بەست بووم .
کاتێکیش مرد ، بەهۆی هیوا براویمەوە ، تووشی بێ ئاگاییەکی وەها بووبووم ، نەمتوانی بیربکەمەوە . گریام .
بەدرێژایی هەموو ساتەکانی کفن کردنی خۆشەویستە گەورەکەم ، داخی بێ کۆتاییش ، خەمو حەسرەتی پیاوێك بوو نزیك لە دەستەلات نەمان بەسەر خۆیدا ... هەست بەئازار کردنێکیش وەك ئازارێکی سرووشتییانەی لەش .
پاشان بەرێکرا . کاتێك لەژێرگڵدا بوو مێشکم لەپڕ پاك بووەوە .
بەزنجیرەیەك نالەباریی مێشکدا تێپەڕیم .. ئەوەندە ترسناك بوون تەنانەت ئەو خۆشەویستییەی کەدای بەمن ئازیزتر بوون لەو نرخەدا .

ڕاڕاییو دڵەڕاوکەیەك گرتمی . « هەرگیز جارێکی دیکە نابینیمەوە . » پاش ، بەدرێژایی ڕۆژێك ، بیرکردنەوە لەمە شێتت ئەکات . بیرلەمە بکەرەوە ! یەکێك ئەوەتا لێرەدایە . یەکێك کە خۆشت بوێ تارادەی پەرستن .. هەر تەنها کەسێکە ، چونکە لەجیهانی پانو بەریندا یەکێك نیە لەو ئافرەتە بچێ . ئەو کەسە خودی . خۆی بدات بەتۆ .. ئەو لەگەڵ تودا ئەو یەکگرتنە نهێنیو نادیارە دروست بکات کەپێی ئەڵێن خۆشەویستی .
نیگای لەلای تۆ لەگەردوون فراوانتربێ .. ئەفسووناوی جوانتربێ لەجیهان . ئەو نیگادرەوشاوانەی کە پڕبن لەزەردە خەنەی بەزەییو خۆشەویستی . ئەوکەسە تۆی خۆش بوێ کاتێك قسەت بۆبکات ، دەنگی لەنێو « خۆشی » دا نوقمت بکات . لەپڕێکیش دیار نامێنێ ! بیر لەمە بکەرەوە !
نەك تەنها لەبەر چاوی تۆدا ون ئەبێ ، بەڵکو لەبەر چاوی هەریەکێ . ئەو کەسە ئەمرێ .. تۆ تێئەگەیت ئەم ووشەیە چی ئەگەیەنێ ؟
هەرگیز ، هەرگیز ، هەرگیز لە هیچ شوێنێکیتردا ئەو کەسە دروست نەبێتەوە ئەو چاوانەت جارێکیدی نەیا نبینێتەوە . ئەو دەنگەی کە هەرگیز لەنێو دەنگی خەڵکدا ، تەنها وشەیەك ناوتری وەك بەوشێوەیەی ئەو ئەیوت .
« هەرگیز ڕوویەك وەك ڕووەکەی ئەو لەدایك نابێتەوە . هەرگیز ، هەرگیز ! »
داڕێژگەی پەیکەران ئەپارێزرێ . ئەو ستامپەی ، کەشتەکان بەهەمان وێنەو ڕەنگ دروست ئەکاتەوە ، ئەپارێزرێ .
بەلام ئەو لەشە .. ئەو ڕووە هەرگیز لەسەر ئەم زەوییەدا نابینرێنەوە . وەهەتا ئێستاش هەزاران کەس لەدایك ئەبن ، ملێونان ، هەزاران ملێون ، تەنانەت لەمەش زیاتر ، لەنێو ئەم هەموو ئافرەتانەدا ، هەرگیز یەکێکی تێدانیە لەو بچێ .
ئایا ئەمە شیاوە ببێ ؟ وا لەیەکێك بکات ، بەبیرکردنەوە لێی ، شێت ببێت !«تەنها بیست ساڵ ژیا ، زیاترنا ، ونبوو تا هەتایی ، تاهەتایی ، تاهەتایی ! بیری کردەوە ، زەردەگرتی ، منی خۆش بیست . ئێستاش شتێکیتر نیە . ئەو مێشانەی لەپاییزدا ئەمرن هەروەکو ئێمە گرنگن لەدرست بووندا لەمە زیاترنا !
بیرم کردەوە کە ئەو لەشەی . ئەو لەشە تەڕو گەمەی ،

کەئەوەندە نەرم ، ئەوەندە سپی ، ئـەوەندە جـوان بوو .. لە قوولایی سندووقێکدا ، لەژێر گڵدا خراپ ئەبێ وەگیانەکەی ، مێشکەکەی ، خۆشەویستییەکەی بۆ کوێ چوون ؟

« هەرگیز جارێکیدی نایبینمەوە ! هەرگیز جارێکیدی !

بیرکردنەوە لە شیبوونەوەی ئەو لەشەی ئەوەندە هاتبووە وێزەی مێشکم ، هەتا ئێستاش هەر لەیادمە .

« بە خاکەنازێکەوە ، بەچرایەکو چەکووشێکـەوە دەرپەڕیم . بەدیواری گۆڕستانە دا سەرکەوتم . ئەو شوێنەم دۆزییەوە کە گۆڕەکەی ئەوی لێبوو ، بـەتەواوی پـڕنەکـرابووەوە . تـابوو تەکەیم دەرخست . یەکێك لەتەختەکـانیم هەڵبـڕی ، بۆنێکی سامناك بۆنێکی پیسی بۆگەن بوون بەرەو ڕووم هات . « ئای ! جێگاکەی بە گوڵە سۆسەن عەتراوی بووە ! »

هـەرچۆنێـك بوو تـابووتـەکەم کـردەوە ، پاڵم بـەچـرا داگیرساوەکەوەنا ، بینیم . ڕووی شینبوو .. پەنماو .. سامناك !

شلەیەکی ڕەش لەدەمیەوە هاتبووە دەرەوە ،

« ئەوە ! ئەوە خۆیەتی بـەترسـەوە گرتم . بـەلام قۆڵم ڕووت کرد ، قژیم گرتو ، دەمو چاوە ترسێنەرەکـەیم لەخۆم نـزیك کردەوە ! ئالەو کاتەدا منیش گیرام . »

« بە درێژایی شەو ، وەکو یەکێك عەتری ئافرەتێك پاش لەئامێز گـرتنێکی سێکسیانـە بهێڵێتەوە ، ئـاوامنیش لەگـەڵ خـۆمدا هەڵمگرت .. بۆنی پیسی بۆگەن بوونەکەی ، بۆنی ئازیزەکەم ! »

« تۆش چیت پێخۆشە ئەوەم لەگەڵدا بکە . »

بێ دەنگییەکی سەیر هۆڵەکەی گرتبـووەوە خەڵکـەکە وادیاربوون چاوەڕێی شتی تر بکەن . لیژنـەی دادگاکـە بۆ ووتو یژ کردن کشـانەوە . پـاش چەنـد خولەکێـك ، کاتێـك گەڕانەوە ، تاوان بارکراو هیچ نیشانەیـەکی ترسی پێـوە دیار نەبوو ؛ تەنانەت هیچ بیرکردنەوە یەکیش .

بـەشێوەیـەکی ئاسـایی دادوەر پێی ڕاگـەیـانـد کـە هاوپلەکانی دەریان خستووە تاوان بار نیە .

هیچ جوولەیەکی نەکرد . بەلام خەڵکەکە دایان لە چەپلە .

* لەم کتێبەوە وەرگیراوە :

88 Short Stories

By : Guy De Maupassant

(The Tomb) p — 284 — 288

چیرۆکی منداڵان

نووسینی : کنید بلای تۆن .. Cnid Blyton

وەرگێڕانی : جەبار جەمال غەریب

«ڕۆنی» کوڕێکی بچووکی زۆر خراپ بوو ، لەگەل دایکی دڵڕەقو بێشەرم بوو ، ئەگەر بیوێرابایە لەگەڵ باوکیشی هەر بێشەرم دەبوو ، لەگەڵ چێشکەرەکە دڵ ڕەق بوو ، هەمیشە زمانی لەکچە بچکۆڵەکەی هاوسێیان دەردەهێنا ، دایکی دەی گوت «ڕۆنی بۆچ هێندە خوو ڕەوشتت خراپە ، تۆزۆرم تووڕە دەکەی ، کاتێك شتی هێندە ناشیرین دەکەی ناتوانم بڕوا بکەم کەتۆ کوڕی منی» ڕۆنی دەرگاکەی پێکدا دەدا کەتووڕە دەبوو ، کاتێك بەلای مێزەکەدا دەڕۆیشت شەقی لەکورسیەکـان هەڵ دەدا ، لووتی لەو شتانە هەڵ دەبوار کەحەزی لەخـواردنیان نەدەکرد بۆو شتانەی حەزی لێیان بایە .

جارێك دایكی گوتی ڕۆژێك كوڕێكی بچووكی كە پەیدا دەكەم ، پێم وانیە كەتۆ كوڕێكی زۆر باشی بۆ وەی هەم بێ ، ئەگەر تۆهەر لەسەر خوو ڕەوشتی خۆت ئاوا بەردەوام بی ، پێم وایە پێویستە بە دوای كوڕێكی بچووكی كەدابگەڕێم»

ڕۆنی گوتی «زۆر باشە» من گوێی نادەمێ ڕۆنی بەتەواوی دلنیا بووكە دایكی مەبەستی نیە ، ئەوە تەنها شتێكە ئەقسەی گەورەكان دەنا ئەو هەرگیز مەبەستی پەیداكردنی كوڕێكی كەنیە .

ئاوا تۆ دەتوانی بیهێنیتە بەرچاوی خۆت كەڕۆنی چ زۆر سەری سوڕما كاتێك لەقوتابخانە گەڕایەوە كوڕێكی بچووكی دیكەی بینی لەگەڵ دایكی‌دا .

ئەو كوڕە بچووكە تۆزێك لەڕۆنی گەورەتر بوو ، یەكی سپیكەلەبوو لە جیاتی ئەوەی ڕەش بێ ، ڕووە پێكەنیناویەكەی خڕوێدكاوی بوو .

ڕۆنی گووتی «تۆ .... كێ ی ؟»

كوڕەكە گوتی «من (دان) م»

ڕۆنی بەتوورەیی گوتی تۆ دەڕوێە دەرێیان شەڕت لەگەڵ كەم دان گۆتی «من لەتۆ گەورە ترم ، بۆكسینش دەزانم ئاوا بەسەرتا سەردەكەوم» دایكی ڕۆنی بانگی كرد «دان وەرە تاوێك یارمەتیم‌بدە» دان گوتی «هاتم» یەكسەر بۆلای ڕای‌كرد دایكی ڕۆنی پەڕە زیوەكانی ڕێك دەكرد بووەی خراپ نەبن ، پارچەكانی ڕێك‌و لووس دەكرد هەتا پان دەبوون ئینجا دەی خستنە سندوقەكەوە . دان گووتی «حەز دەكەم یارمەتیت دەم»

دایكی ڕۆنی بۆی پێكەنی‌و گوتی «سوپاس بۆ تۆ» ڕۆنی خێرا ڕای كرد «من دەی كەم»

دایكی گوتی «نا ، ڕۆنی ، من زۆر جارم داوا لێ كردووی كەئەو ئیشە بچووكەم بۆ بكەی بەلام تۆ شیراندوتەو هەرگیز نەت‌كردووە ، ئێستا من‌و دان پێكەوە دەی كەین»

ڕۆنی دووبارە گوتی «من دەیكەم» دان گووتی تۆئەوە بكە كە دایكت پێت دەڵێ ، من‌و دایكت دەتوانین ئەوئیشە زۆر بەجوانی پێكەوە بكەین . تۆ برۆ یاری بكە»

«ئەو كوڕە نارەحەتە كێ‌یە» ڕووی لەدایكی كردوو داوای لێكرد «بیكە دەرێ .....» دایكی گوتی «هەرگیزنا ... دان دایكی هەرنیە ، ئەو هەرگیز ئەو شتانەی نیە كەتۆ هەتە ، خۆشی یارمەتی دانی دایكی ، ماچ كردنی‌و شەوباشی شەوانە ، بێ‌ووتنی ناخۆشی‌یەكانی ، ئاگاداری بێت كاتێك ماندووەو ، هاوبەشی بكات لەهەموو شتێكدا ، تۆئەوشتانەت ناوێ ڕۆنی تۆ ووتت كەگوێی نادەیتێ كەمن كوڕێكی بچووكی كە پەیداكەم» ڕۆنی كەهەستی بەنارەحەتی‌و توورەیی‌و ئازار دەكرد گوتی ئەی من چ بكەم ؟»

دایكی گووتی «چاكە ... چۆنت پێ خۆشە وابكە دەتوانی تاوێك بچی بۆ ماڵی دان ، گەر حەز بكەی ، یان‌دەتوانی بچی بۆ قوتابخانە تایبەتی‌یەكان دەتوانی‌لیرە بمێنیەوە كە لەگەڵ دان هەرانەكەی ، ئێستا ئەو ئاگای لەمن دەبێ‌و یارمەتیم دەدات»

ڕۆنی بەگران باوەڕی بەگوێچكەكانی خۆی دەكرد ، لەدایكی ڕاماو دەمو چاوی لەدان تێك نان‌و ئەو جا لە ژوورەكە دەرپەڕی دەرگاكەی پێكدادا بەجۆرێك هەموو خانووەكە لەرێیەوە ڕۆنی چوو باوكی بینی‌و شیراندی «من نامەوێ ئەو «دان» ە لەماڵی من بێ ، نامەوێ دایكم ئاگاداری بكات» باوكی گوتی «ڕۆنی خۆشەویستم .. بەدلنیایەوە تۆ دەتوانی ببینی كەدان كوڕێكی باشەو ئاگاداری دایكت دەكات ، وای دامەنێ كە دایكت هەمیشە ئاگاداری ئەو دەكات ، ئەوە هەڵەی تۆیە ، من لومەی دایكت ناكەم كە كوڕێكی بچووكی كەی هەڵبژاردووە ، دایكت زۆر خۆشەویست‌و دڵ نەرم‌و دلخۆش كەرە زۆری لەگەڵ هەولدای ـ بەلام كوڕێكی وەك دان دەزانێ كەدایكت چ خەزنەیەكەو بەهەموو دڵیەوە خۆشی دەوێت من پێویستە بڵێم كەمن خۆشم زیاتر حەزم لە (دان)ە

ڕۆنی وای هەست كرد كەخەون دەبینێ ، چ سامناكە لەناكاو بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ‌و ناكاو كوڕێكی كەببینێ كەشوێنی ئەوی گرتوتەوەو هەموو خۆشیان دەوێت !!!

لەبابی پرسی « تۆ حەزت لەمن نیە ... بابە ... ؟

دەنگی دەستی بەلەرزین كرد تۆ منت خۆش ناوێ ؟ »

باوكی گوتی «من تۆم خۆش دەوێ چونكە تۆكوڕی منی ، بەلام من ناتوانم بڵێم من زۆرم حەز لەتۆیە ، ڕۆنی من بۆچ وام ؟

تۆ بێ شەرم و خۆ پەرست و دڵ رەقی . من هەمیشە تۆم خۆش دەوێ بەڵام من حەزم لەتۆیە یان نا ئەوەیان لەسەر خۆت وەستاوە لەسەر خوو رەوشتت» رۆنی رای کردە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی ، زۆر توورەو نارەحەت و شلەژاو بوو ، بەرادەیەك لەسەر كورسییە دانیشتوو دەستی بەهەنسك دان كرد ، هەنسكی دەداو دەگریا ، بەڵام دایكی بۆ لای نەهات .

رۆنی گوێی لە دەنگ بوو لەباخچەكە ، دایكی و دانی لەوێ دیت دایكی شوێنی هەڵگرتنی دارەكان پیشانی دان دەدا .

دایكی گوتی «ئەگەر تۆ هەموو رۆژێ لەدوانتردا بۆمی بێنی ئەوە یارمەتیەكی گەورەیە»

دان گوتی «حەز دەكەم بیان هێنم» دان دەستی لەسەر قۆڵی دایكی رۆنی دانابوو ، رۆنی دووبارە هەنسكیدا ، چەند جار دایكی داوای لێ كرد كەهەموو رۆژێ دارەكانی بۆ بەرێتە ژووری بۆئاگر ، ئەو سەغڵەت نەدەبوو بەبیر كەوتنەوەی ؟؟ ئێستا ئەو كورە نارەحەتە بیری دەخاتەوەو جارێكی كە هەرگیز لەبیری نەچێ !

رۆنی دانی دیت دارەكانی هەڵگرتوە ، دان بە تەنێ بوو رۆنی هەرای كردە خواری بۆی بۆ ناو باخچەكەو بەسەریدا شیراند

«ئەو دارانە بەجێهێڵە ئەوەئیشی منە» دان گوتی «ئێستانا ... من بە لێنم بە دایكت داوە هە ندێكیان بەرمە ژوورێ ، من وام ووتووە، ئایا تۆ دایكێكی ئەوەندە خۆشەویست نییە بۆ بەرێ؟ هیوادارم دایكێكی وام هەبایە، زۆر دڵ نەرم و خۆشەویستە، لە دنیادا هەموو شتێكی بۆدەم» رۆنی بەتوورەیی گوتی «برۆ دەرێ یان لەگەڵت بەشەر دێم» دان پێكەنی رۆنی بەقورسی لەشانی سرەواند، جالە ناكاو دانێكی زۆر جیاوازی دیت ، هەروەها هەستێكیتر ! دان بەمست لێیدا یەكەم جار لەلای راستی و ئەوجار لەلای چەپی، رۆنی خۆی لەسەر پشت دیت ، چەنەكەی زۆر دەیەشاو گوێی راستیشی دەی زریكاند دان گوتی «ئاگادارم كردی شەرم لەگەڵ نەكەی» دارەكانی هەڵگرتەوەو بەرەو خانوەكە رۆیشت . رۆنی هەستایەوە بەگریان رای كرد بۆ لای دایكی ، بۆ گازندە لەدان ، بەڵام دایكی ئەو لای دانی گرت و گوتی «مندال مەبە ، وەك مندال مەنوزێنە ، سەرم دیشێ» رۆنی زیاتر گریا ، دان بەتوورەی دیسان تەماشای كردو پرسی

«ئایا بیستت دایكت چی گووتووە ؟ نامەوێ كەس نارەحەتی كات كاتێك ئەو سەر دیشێ ، ئەگەر دەتەوێ دەنگە دەنگ دروست كەی ... برۆ دەرێ» بۆ توورە گەورە بوو نەكەی رۆنی ، دان دەستی گرت و پاڵی پێوە نا بۆ دەرێ گوێی لێبوو دایكی دەیگوت «سوپاس دانی خۆشەویست» .. بەراستی من بەرگەی ئەو نووزە نووزە ناگرم» رۆنی چووە ژوورەكەی خۆی و هەتا ئێوارێ لەوێ مایەوە بۆ چا خواردنەوە نەچووە خوارێ ، خەیاڵی وابوو كەدایكی دێتەلای ، بەڵام دایكی نەهات . ئاوابێ چای بەسەر برد دەی بیست هەموو لەخواری و دانشتن و پێدەكەنن و قسە دەكەن وێنەی دانی هێنایە بەرچاو كەمرەباو كێك دەدا بەدایكی ، هەمیشە ئاگای لێیەتی ، ئەوان پێویستیان بەرۆنی نییە ، ئەو تەنها كورێكی نارەحەتی ، خۆ پەرستی ، دڵ رەقە كەس نایەوێ .

چووە خوارێ بۆنانی ئێوارێ ، باوكی گوتی . هەلەو .... رۆنی »

ئەوەكانی دیكە پێكە نین . ئەوان هیچیان نەگوت دەربارەی وون بوونی لەچاو خواردنەوە . دان بەخۆشیەوە قسەی بۆ دایكی و باوكی دەكردو هەمو جۆرە نوكتەیەكیان دەكرد ، رۆنی بەراستی دڵخۆش كەر بوو، كورێكی باش بوو، رۆنی زیاتر لەهەموو كاتەكان حەزی لەدان كرد لەگەڵ دایكی رۆنی زۆر باش بوو هەمیشە لەدەوری بوو باوكی رۆنی زینیدا دان و گوتی « من پێویستە بڵێم كە زۆر خۆشە كورێكی رەوشت ببینی ،

دان بۆ نووستن چووە ژووری تایبەتی ، رۆنی بە ناهومێدییەوە خۆی داكەند ، نەی دەتوانی بیر بكاتەوە چ بكات بەتەواوی كورێكی چاكە ، ئەویش بەقەدەر ئەو دایكی خۆش دەوێت ، هێندە باشە كە هەر دایكێك خۆشی بوێ .

رۆنی گوتی - « منیش ئەوەندە خراپم كەهەموو دایكێك رقی لێم بێ .... وای تێدەگەم» چووە ناو جێگایەكەبوو چاوەرێی دایكی دەكرد بێتو شەو باشی لێ بكات بەڵام نەهات ، دایكی چوو دانی داپۆشی و گوێی لێ بوو گووتی «ئوو ... دان چەندم خۆش دەوێی ... هەمیشە لە دڵم دای»

لەچەند رۆژی ئایندەدا ، دان ئیشەكانی زۆر بەجوانی كرد بۆ دایكی و باوكی رۆنی كورێكی لەبەر دڵان بوو ، هەمیشە ئامادە بوو بۆ كردنی هەر ئیشێك بۆ هەر كەسێ ، هەتا

جیشکتەرەکە بەگۆرانی ستایشی دەکرد . هەروەها واشی لەکچە جوکە کەی هاوسێیان کردبوو خۆشی بوێت . ڕۆنی جارێکیتر هەوڵی نەداشەر لەگەڵ دان بکات .

زانی شەر بێ سوودە ، توورە نەدەبوو هەرای ئەدەکرد چونکە ئەگەر توورە بووبا کەس سەرنجی نەدەدایەو بۆلای دەهات خۆئەگەر هەراشی کردبا ئەوە دان بەپال لەژووری دەکردە دەری ، لەبەر ئەو شتانە ڕۆنی بۆ یەکەم جار بووە کورێکی بەئەدەبو هێمن ، هەندێ جار یاریشی لەگەڵ دان دەکرد دان زۆر دەربارەی دایکی ڕۆنی قسەی دەکردو بەڕۆنی گوت «ئەرێ دایکی تۆ ئێکجار باش نییە ! ؟ بێ گومان زۆر باشە تۆ هەمیشە ئەوت هەیەو لەگەڵتە ، بەلام منهەرگیز دایکم نییە ، دایکم مرد کاتێك من تەمەنم ڕۆژێك بوو ، من پێت دەڵێم ئای کە خۆشە کەسێکی وەك دایکت هەبێ هێندە شیرینو دل نەرمو هەمیشە خۆشەویست»

ڕۆنی تەماشای دایکی کرد زۆر شیرین دیاربوو دانشتبوو ڕۆمانی دەکرد سەری شۆر کرد بووە، وچاوە قاوەییەکانی بەدوای دەرزییەکە دەکەوت ، ڕۆنی بەتووند هەستی کرد کەپێویستە چەند شتێکی بۆ بکات ، لە دڵی خۆیدا گوتی «بەلام من وابزانم هەر ئێشێکی هەبێ زیاتر بە«دانی» ی دەکات» چووە خواری بۆلای دایکیو دەستی لەقوڵی ئالاند دایکی بەسەر سامیەوە سەیری کرد ، ڕۆنی گوتی

«ئایا حەز دەکەی هێندێ ئێشت بۆبکەم ؟ ئایا هیچ بۆت بهێنم»

دایکی گووتی «با ... بۆم بهێنە» ڕۆنی دۆشەکەلەیەکی بۆهێنا دایکی بۆی پێکەنیو گووتی «سوپاس ... خۆشەویستم» ڕۆنی حەزی دەکرد لەباوەشی کات ، بەلام لەوەدەترسا داخۆ دایکی حەز دەکات لەکاتێکدا وای لابە .

لەڕۆژی ئایندەدا ڕۆنی هەموو شتێکی بۆ دایکی هێنا ، هەموو ئیشێکی بۆ کرد ، دان بەقووشقی بوونەوە تەماشای دەکرد لەئێوارەدا دان گوتی «من دەلێم بروام وایەکەتۆ بەرەوشتی باشت دەتوانی ئاگاداری دایکە باشەکەت بکەی ئەگەر تۆ بەراستی بتەوێ»

ڕۆنی بەتوورەیی گوتی «بێگومان دەیکەم» تەماشا «دان» ی کردو سووربووە «من حەزم لەو ڕێگایە نیە کەتۆکردوتە بووەی دایکم لێ دوورخەیەوە ، من دەزانم کردەوەم لەگەڵ دایکمدا زۆر بێ عاقلانە بوو ، ئەوە دەزانم ، ئێستا هەلسووکەوتی تووم دیت لەگەڵیدا ، دەش توانم ـ بزانم کەئەو چەندی تۆ خۆش دەوێتو پێشم سەیرینە . تۆهەمیشە لێرە ژیان دەبەیە سەر ؟»

دان گوتی «چاکە ... من زیاتر حەز دەکەم زووتر بگەڕێمەوە مالێ من لەمالێ خوشکم هەیە ، پێویستە تۆزێکم ئاگا لەوێش بێت ، بەلام من نامەوێ دایکت بەجێ بهێلم هەتا تۆدڵی خۆش نەکەی ، من بەڕاستی ئەوم خۆش دەوێت ، هەتا ئەگەر بشرۆمەوە سەری دەدەمو دەیبینم ، خۆزگە دایکی من بایە ، نازانم تۆبۆچی خۆشت ناوێ ، دەزانم ئەوخۆشە ویستە» ڕۆنی بەتوورەی گوتی «من دایکم خۆش دەوێت ، تۆ بگەڕێوە مالی ، دان لەهەفتەی داهاتوودا وەرەوە ، جا بەتەواوی دەبینی کە ئاخۆ من ئاگام لە دایکی خۆم بووە ، کەوەك تۆ خۆشم ویستووە ... و ... زیاتریش ... لەبەر ئەوەی منکوڕی ئەوم ... تۆش کوڕی ئەونیت»

دان گوتی «زۆر چاکە ، من دەڕۆم ، بەلام گوێت لێبێ ، ڕۆنی ئەگەر دڵ تەنگی بکەی ، جارێکیی کە دەگەڕێمەوە ، ڕۆژی ئایندە دان ڕۆیشت ، دان جاروبار دەهاتە ئەوە بۆ دیدەنی ڕۆنیو دایکی ، ئێستا دایکی هەمیشە دل خۆش بوو .

بەدانی دەگوت کەڕۆنی چەند باشە ، سەیریشە کەبلێین ڕۆنیو دان دوو هاوڕێی زۆرلێك نزیکن .

شەوێك کاتێك دایکی ماچی شەو باشی لەڕۆنی دەکرد ڕۆنی گوتی

«هەرگیز کوڕێکی بچووکی کە پەیدامەکە .... پەیدای دەکەی ؟» دایکیشی هەمیشە یەك وەلامی دەدایەوە «هەرگیز ، ڕۆنی ... تۆ تاکە کوڕی بچووکی من دەمەوێ» ئەوەش بۆ هەر دووکیان زۆر باش بوو ... وانیە ؟

The oTher litte boy .

froom The book

cnid BlYton,s

Bed bime stories.

published in 1970 by puruell

london . W.

● کەمال رەئووف محەمەد ●



# نەمامێکی جوانەمەرگی باخچەی هونەر : عوسمان سابونچی

لە ساڵی 1971 دا ، لە چلەی مەرگییدا ، برادەرێکی منداڵیی ، لە سووچێکی رۆژنامەیەکدا[1] ـ تا ئێستاکە دایکی هەڵیگرتووە ـ بە عارەبیی لەسەری نووسیوەو دەڵێت : [ برادەری خۆشەویستم عثمان محمد صابونچي ، چل رۆژ بەسەر مەرگتدا تێپەڕ بووە ، هێشتا خوێنی دڵمان دەتکێ .. یادگارەکانت رۆژگار نایسڕێتەوە ... ] هەر ئەو برادەرەی کە دیارە لە گۆشەیەکەوە تەماشای رۆژگاری ژیانی کردووە دەڵێت [ ... لە ڕاپەڕینەکانی کانوونی 1948 دا لە بەربەرەکانیی پەیمانی ـ پورتسموژدا ـ بەشدار بوویتو .. هتد ] . ئەو لاواندنەوەیەش چەند بە سۆز بێو ڕێزی هەڵویستی نیشمانیی گرتبێت کە ڕای نووسەرەکە خۆیەتی ، هەقی بەشێکی گرنگی ژیانی ئەوی فەرامۆش کردووە ، کە ئەو بەشە ، بەشێکی ئازیزی ژیانی عوسمانەولەوە زیاتر پەیوەندیی بە خەڵكو هونەرەوە هەیە !! کەوابوو دەبێ بۆ ئەو بەشە ، لەم پرسیارەوە دەست پێبکەین : عوسمان سابونچیی ( = عوسمان محەممەد عەبدوڕڕەحمان سابوونچیی : 1931 گەرەکی سابوونکەران ـ 16 / 6 / 1971 گەرەکی ئیسکان ، سلێمانیی ) چی لە دەست هاتووە ؛ لاپەڕەکانی ژیانیشی چی دەگێڕنەوە ؟ .

● [ دایکی : ئاسکۆڵ شێخ فەرەجی حاجی شێخ مارف ـ 77 ـ ساڵان ] بەهۆشیاریی‌یەوە ، هەندێ جاریش بەخەمو گەروویەکی پڕ لە گریانەوە باسی دەکاتو دەڵێت[2] : [ هەر لە منداڵیی‌یەوە حەزی لە گۆرانیی گوتن دەکرد لە بیست و پێنج ساڵییدا حەزی لە گۆرانیی ، لە شیعر ، لە عوود لێدان دەکرد . لەگەڵ ـ ولیام ـ داییما عوودیان لێداوە . هەر تالیب بەوانە بوو . دەمگوت : تۆ ئەم شیعرو شانامەیە لە خوێندنەکەت دووا دەخەن ، ئەویش دەیگوت : دووا ناکەووم

پ : لە منداڵیی‌یەوە ، لە کەیەوە ؟

و : لە سونفی شەشی ئیپتیدائی‌یەوە . ( بەخەمێکی تاڵو دیاریشەوە زیاتر گوتی ) وەختی خۆیشی کە یەکەم جار لە ئیزاعەوە گۆرانیی دەگوت کە رادیۆش هەمووکەسێ نەیبوو ، دەچووم بۆ هەموو ماڵێ ، دەچووم بۆ ماڵی میزرا عەبدوڵلا و ماڵی حاجی کەریم .. ئێستاش کە گۆرانیی ـ یار یار ـ دەبیستمەوە ، گڕم تێبەر دەبێ ! ( بەقوڕگێکی پڕ لە گریانەوە ویستی قسەی تەواو بکا ) بەخوا کە ئەو دوو منداڵە[3] نازدارانەی دەخستە سەر ڕانیو قەتارو ئەڵلاوەیسیی و گۆرانیی خۆشیی بۆ دەگوتن ... ( فرمیسك بەری قسەی پێگرت ! ) .

● [ براکەی : مەحموود محەممەد عەبدوڕڕەحمان = مەحموود سابوونچیی : 45 ساڵان ـ مامۆستای قوتابخانەی



• عوسمان سابوونچی •

سەرەتایی مەحوی ) وورد باسی براکەی دەکات و دەڵێت(4) :

: کاکم لە ساڵی 1937 دا چووەتە قوتابخانەی فەیسەلییەی سەرەتایی کوڕان ـ کە ئێستا بازارە ـ لەوێشدا هەر بە دەنگ خۆش ناوی دەرکرد بوو ، سروودی نیشتمانیی گێڕاوەتەوە .
ـ دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی ، ساڵی 1943 گەیشتووەتە پۆلی دووەمی ناوەندیی ـ سانەویی سلێمانیی ـ لەم ماوەیەدا ئەوە بوو ، خۆپیشاندان لە زەمانی مەلەکیی یەتدا کرا ، کاکیشم یەکێك بوو لە بەشدارەکانی و بەهۆیەوە گیراو پاش ماوەیەك بەرەڵا کرا .. گوتمان بۆ ئەوەی تووشی گیروگرفتی تر نەبێ ، ناردمانە دەرەوە بۆ ماڵە خزمێکمان ، بۆ ماوەیەك لەوێدا مایەوە ، هاتەوە بۆ سلێمانیی ، بەلام هەمدیسان گرتیانەوە .. لە ساڵانی 1947 ـ 1949 دا گیراو لەلایەن مەحکەمەی عورفیی کەرکووکەوە بڕیاری دوو ساڵ حوکمدانی دەرچوو ، دوو ساڵی لە بەندیخانەی ـ کووت ـ دا بردە سەر . دوای بەرەڵابوونی هاتەوە بۆ سلێمانیی و لە قوتابخانەی ڕۆژ یان لە قوتابخانەی شەو وەرنەگیرا . دوکانمان ، چایخانەمان بۆ دانا ، هەر جێگیر نەبوو . لە ساڵی 1950 دا چووینە کەرکووك ، لەوێدا کرێکاریی دەکرد بۆ ژیانی ئێمە ـ باوکم مرد بوو ـ ! لە ساڵی 1953 هاتینەوە بۆ سلێمانیی ، ڕەمزی مەلا مارف(5) کردی بە کاتبێ لە دایەرەی کارەبا ، ئەمجا لە « بەلەدیییەدا(6) » هەتا ساڵی 1968 کە ئەوکاتە بوو بە مولاحیز . لە بەینی ساڵانی 1968 — 1969 دا تووشی نەخۆشیی بوو ، دەیگوت ناوسکم دەئێشێ .. کەوتینە عەمەلییات کردنی .. تۆزێ باش بوو ، دیسان لێی هەڵدایەوە ، عەمەلییاتی ترمان کرد ، پاشان لەبەر ئاوو هەوا خۆی نەقڵی « بیارە » کرد بەلام چەند مانگێ لەوێدا مایەوە و هەر دەردەکە لە کۆڵی نەبووەوە کە تیراوێ ـ سەرەتانی ـ گەدە بوو . بەم جۆرە کۆچی کرد !

: دەزانیت چۆن چووەتە سەر ڕادیۆ ؟

: لە کاتی خۆیدا باوکم لە ـ ئەبوو غریب ـ دا وەزیفەدار بوو ، ئەمیش شانزە حەڤڤە ساڵانێ بووە ، چووە بۆ سەر لێدانی . خۆیشی دەنگی خۆش بوو ، حەزی لە گۆرانیی دەکرد . لەو هات و چوونەدا ، چووەتە سەر ـ ئێستگە ـ و چەند گۆرانی یەکی تۆمار کرد ، ئینجا نازانم بە تۆمارکردن بوو یان بە چی ؟

پ : ئەو کاتە باوی تۆمارکردن نەبووە کە بەپێی باسی تەمەنی ئەو ، ساڵانی 1946 — 1947(7) دەگرێتەوە . هەرچۆنێ بێ ، گریمان ئەوە یەکەم جار بووبێ ، ئەی دووەم جاری هەیە ؟

و : وا بزانم لە ساڵانی 1953 — 1954 دا بوو . وەکو بێتەوە خەیاڵم چەند گۆرانیی یەکی تۆمار کرد(8) . ئەمجا نازانم لەسەر قەوان بوو یان شریت ؟ ئەوی ئێستاش گوێمان لێ دەبێ ، هەمووی نییە ؟ » .

پ : پێش وورد بوونەوە لە گۆرانییەکانی ، ئەوو مۆسیقاو ئاوازدانان چۆن بوون ؟

و : ئەو گۆرانییانەی کە لە ئێستگەدا هەن ، تەنها ـ تانگۆی یار یار ـ نەبێ ، ئەوانی تر ، هەمووی ئاوازی خۆی بوون . خۆی هەمیشە حەزی بە مۆسیقا دەکرد ، هەتا کاتێ خۆی لەگەڵ تیپی مۆسیقای ـ مەولەوی ـ یەکێ بوو لە ئەندامەکانی . بۆ مۆسیقا فێربوونیش خۆی بە گوێ ڕایەڵیی ـ سەماعی ـ خەریك بوو ، بەس لە دواییدا کاك ـ ولیام یوحەننا ـ خۆی لەگەڵ خەریك کردو فێری ـ عوود ـ لێدانی کرد . لە ئاهەنگەکانی ئەو تیپەشدا بە گۆرانیی بێژ ناسرا .

● **گۆرانییەکان** ئەگەر ئەو باسانە چەند بەشێکی چیرۆکی ژیانی بن ، ئەوا بە گۆرانییەکان و هونەری ، چیرۆکەکە گەش دەبێتەوە ، بەلام چۆن چەند گۆرانییەکی تۆمارکراوی دۆزرایەوە ؟ ئەگەر ئەویش باسێ بێ(9) ، ئەوا سەرئەنجام لە بەهاری ساڵی 1972 دا بە نامە وەلامی ڕاسپاردەیەکم بۆ هاتەوە کە دەڵێ : [ .... ئەم قەوانانە کە لە جۆری « مارکۆنی(10) » 17 ئینجن و تۆمارکراوی « دار الاذاعة العراقية » ن ، گۆرانیی عثمان صابونجی یان لەسەرە . ڕۆژی تۆمارکردنیان لەسەر نییەو کەم ناوی شاعیر یان ئاوازدانەر لەسەر ئەم جۆرە قەوانانەدا دەبینرێن کە ئەمانەن : * قەوانی ژمارە : 64 ـ دیبوی یەکەم : بەستەی ( خۆزگە وا بووایە ) . شیعر : سەرسام «؟» . دیبوی دووەم

: بەستەی ( لە بیرت نەچم ) . شیعر : ... «؟» .

* قەوانی ژمارە : 90 ـ لەسەر یەك دیو بەتەنها : بەستەی ( خۆزگە وا بووایە ) . * قەوانی ژمارە : 99 ـ لەسەر یەك دیو بەتەنها : تانگۆ ( شیرین لە بیرت نەچم ) . * قەوانی ژمارە : 65 ـ لەسەر هەردوو دیوی ، گۆرانیی (کچی جووان) شیعر : هەوری «؟» . * قەوانی ژمارە : 98 ـ لەسەر یەك دیو بەتەنها : بەستەی (کچی جووان) .

بەرێکخستن و لێکدانەوەی قەوانەکان و بابەتەکانی ڕوون دەبێتەوە کە ئەم چەند گۆرانییە ، لەسەر ئەم قەوانانەدان و هی ئەم شاعیرانەن :

1) ـ گۆرانیی ( خۆزگە وا بووایە ) . شیعر : سەرسام[11] ؟ = مەدهۆش . قەوانی ژ : 64 + 90

دەمێکە چاوەڕێم بۆ دڵفرێنێ
پەلاماری دڵم باو لێم بسێنێ
بەڵام دڵسۆزی دڵ بێ نەیشکێنێ
کە گۆشەی چاوی پڕ نازی هەڵێنێ
بەجارێ دەردو ئازارم نەمێنێ ... هتد

2) ـ گۆرانیی (کچی جووان) . شیعر : هەوری[12] ؟ = ئە . بێ . هەوری . قەوانی ژ : 65 + 98

کچە جووانەکەی گۆنا شەکرە سێو
لە سێبەر سڵ و سەرکەش و بزێو
ئاسکی هەڵوەستاو بەر بناری کێو
ماتەی دڵداریت بزەی هەردوو لێو
دڵ بەخوتووکەی شێواو پەشێو ... هتد

3) ـ تانگۆ ( شیرین لە بیرت نەچم ) . شیعر : .... «؟»[13] قەوانی ژمارە : 64 + 99

لە گوڵزارا لەسەرچاوەی بەهارا
لە چیمەندا لە بن سایەی چنارا
لە گوڵشەندا لەگەڵ ناڵەی نزارا
فەرامۆشم نەکەی من گیرۆوەی تۆم
لەسەر جێگا لەگەڵ سۆزەی بەیانا
لە وەختی کردنەوەی زاری گوڵانا
لەگەڵ ئاوازی دڵگیری بەیانا
فەرامۆشم نەکەی من گیرۆوەی تۆم ... هتد

پ : ئایا هەر ئەم گۆرانییانەی لەسەر قەوانی رادیۆییدا هەبووە ؟ یان هەر هێندەی گوتووە ؟ ( دەفتەرەکانی رادیۆ هەر ناوی ئەویان لا نییەو قەوانیش دیار نییە ، بەڵام مەحموودی برای وەلامی لا هەیەو دەڵێ : )

و : نا ، کاکم گۆرانیی تری لە ئیستگەدا هەبووە کە خۆم گوێم لێبووە ، لەوانە :

4) ـ تانگۆ : (یار یار) . شیعر : گۆران[14] . ئاواز : رەفیق چالاك[15] .

یار .. یار
شیرین لەنجەو لار
چاووم روا ..
صەبرم سوا
هێزم لێبرا ..
هەر نەهاتی ، دەرنەکەوتی ..
بۆچی تو خوا ؟
یار .. یار .. شیرین لەنجەو لار ... هتد

5) ـ گۆرانیی : (ست فاتیمە) . شیعر : هەردی[16] . ئاوازی خۆی .. کە لە رادیۆوە ماوەیە گوێم لێبووە . بۆ ئەم گۆرانییەش ، کاکم بۆی گێرامەوە ، گوتی کە عەلی مەردان بەرهەڵستیی کردووەو گوتوویەتی من ئاوازێکم بۆ ئەمە داناوە ، تۆ نابێ ئەم گۆرانییە بڵێیت .. لەوە دەچێ سڕابێتەوە ؟!

6) ـ مەقامێکی ئۆرفەو بەستەیەك کە دەڵێ :

ئای دەمەکەت بێنە لە دەمم
دەبا ساکێن بێ دڵەی پڕ غەمم
کە لەوەپێش مەلا کەریم ووتوویەتی .

7) ـ گۆرانییەکی تر کە ئاوازی خۆی بوو . نازانم هی کام شاعیرە کە دەڵێ[17] :

ئەی دڵ زەمانە غەمی لێت ئەوێ
ڕۆحی شیرینت دەر ئەچێ شەوێ

ە چەند جارێکیش لە ماڵەوەدا بەدەم عوودەوە دەیگوت ، ی گومان لە رادیۆشەوە ، بەلام دیارە ئەویش نەماوە .

٤ - گۆرانییەکی ترکە ئەویش ئاوازی تایبەتی خۆی بوو ، کە شیعری میزا مارفەو شتێکم لە ئاوازەکەش لەبەرە کە شیعرەکەی دەڵێ[18] :

گوناهی من ئەبێ چی بێ لە کاتێکا کە خوڵقاووم
بەکوژراوی برۆی پەیوەستو چاوی مەستی داناووم
لە کاتێکا کە تەوقت کردە گەردنو خستتە ئەستۆم
قوبانی ئیشی خۆم زانیی کە سووتانە هەتا ماووم ] .

● هونەری

ئەگەر ئەو کۆششانەی باسیان کرا ، هەموو کۆششێکی دیاری ئەو بن لە رادیۆدا کە دەشێ زیاتریش بووبێ و چووبێتە پاڵ گۆرانییە وونبووەکانییەوە کە لە هەوادا وونبوون ، سەرلەنوێ دەپرسینەوە ئاخۆ رادەی کۆششی مۆسیقا فێربوون و ئاوازدانان و ئاهەنگگێرانی چۆن بووە ؟ بەهەجەت رەشیدی ئەندامی کۆنی تیپی مەولەویی ، بەسۆزەوە یادی کردەوەو ئەویش پێی گوتم کە ئەندامی تیپی مەولەویی بووەو لە ئاهەنگەکانی ئەودا بەشداربووە ! . کەوابوو دیارە عوسمان کە هاتووەتە کۆری هونەرەوە ویستوویەتی شوێنێکی پێشکەوتوو بۆ خۆی بدۆزێتەوە ، ئەمجا ئایا ئەمە راستە ؟ ( وێنەیەکی خۆی بەدەم عوود لێدانەوە وەرگرتووە و لە 8/3/1957 دا بەئیمزای خۆی لەسەری نووسیوە : مامۆستای بەنرخم کاکە ولیم پێشکەشە ) . ئا ئەم یادگارەش دەمانباتە لای ئەو مامۆستایەی کە چەند جارێ ناوی هاتووە ، ئەوی کۆڵەکەیەکی تیپی مۆسیقای مەولەویی بووەو کۆڵەکەی دامەزراندنی تیپی مۆسیقای سلێمانیی - ئەمرۆژ - بووە . ولیام یۆحەنناى مۆسیقا زان بەهەستێکی پاك و بێهەواوە هاتە پێشەوەو لای ئێمە شاهێدیی لەسەر دەداو دەڵێ[19] : [ لە سالانی 1954 دا لاوێکی زیرەكو ووریا نزیك کۆری هونەرمان دەبوو . رۆژ بەرۆژ خۆشی هونەری بەدڵدا دەچوو . دووای ماوەیەك دەرکەووت کە توانای هونەری لێبەدیی دەکرێ . نازناوی عثمان صابونچییە . زۆر پێ خۆشحاڵبوو کەبێ بەیەکێ لە قوتابییەکانم . بەشانازییەوە قبوولمکرد بە قوتابی و هاورێ . ئالەتی عوودم بۆ هەلبژارد تا بتووانێ گۆرانیی بێژو مۆسیقاژەن بێو خزمەت بکا . خوێندنی عوودی بەپلەی زۆر باش تەواوکرد . « سەماعیو بەشرەفو لۆنگا[20] » ی بەجووانیی دەردە هێنا و جووانترین ریشەی عوودی بەکاردەهێنا . نۆتەیەکی جووانی دەخوێندەوە لە سۆلفێجدا پێشکەوتوو بوو . هونەرمەند « عثمان » مۆسیقای لێداوەو گۆرانیی بەسۆزی گوتووە .
زۆرترین گۆرانییەکانی لە دانانی خۆی بووە . هونەرمەند « عثمان » لەو ماوەیەدا گۆرانیی خۆشی داناوە و لەپێش تۆمارکردندا ئاگاداری دەکردم بۆ لێدووان دەربارەی ئاوازەکان . گۆرانیی لە ئیستگەی کوردییدا تۆمارکردووە . هونەرمەند « عثمان » یەکێ بووە لە گۆرانییبێژەکانی تیپی مۆسیقای مەولەوییدا . لە ئاهەنگەکانی تیپی مۆسیقای مەولەویی لە هەولێرو کۆیەدا[21] بەشداربووە زۆر حەزی لە مەقامی « بەیات و حیجاز » دەکرد ، پەسەندم دەکرد چونکە هەردوو مەقامەکە بۆ گۆرانیی کوردیی گونجاوە . هونەرمەند « عثمان » وێنەی خۆی پێشکەش کردم ، زۆر سوپاسم کرد گوتم ئەمە یادگارە و هەرگیز لەبیر ناچێتەوە ، وێنەی لە 8/3/1957 دا . ] . دووای ئەم شاهێدییە ، لەسەرخۆ ، بەهوشیارییەوە کە تەماشای ژیانو هونەری عوسمان سابوونچیی بکرێ ، تاقە راستییەك دێتە پێشەوە و دەڵێ : هونەری عوسمان لەو ژیانە تاڵ و سەختەدا ، لەو تەمەنە کەمەدا کە چل ساڵی خایاند وزیاد لە دوو ساڵی بۆ بەربەرەکانیی دەردی بێئامانی تیراوێ - سەرەتان - بوو ، هونەری عوسمان ، بەشی خۆی ، بۆ رۆژگاری خۆی کردەوەیەکی بەنرخ بوو ، جووان و مێژوویش بوو . مێژوویی ، چونکە هەر ئەم جۆرە نەمامانە ، ئەم جۆرە لاوانە ، نیمچە خوێندەوارانە ، لە هیچەوە ، بەلام لە بێشەی هوشیاری و زیرەکی و دڵگەورەییو هیلاکیی خۆیانەوە ، لە سالانی پەنجاکان بەدوواوە ، باوەشیان بە هونەردا کرد ، بەتایبەت - لێرەدا - هونەری گۆرانییو ئاوازدانان و مۆسیقا فێربوون -

بەگەورەیی ـ و ئارەزووی خۆیشیان بەئارەقی ناوچەوانی خۆیان گەشاندەوە و پێش خست . ئا ئەمەش ـ لەلای من ـ قوناغە ، چونکە پەرینەوەیە لە واقیعی نەبوونیی زەمینەیەکی مۆسیقیی زانستانە و دەزگای فێربوونی مۆسیقا . جگە لەمە ، پەرینەوەیە بووە لە قوناغی ( گێرانەوەی گۆرانیی تەواو فۆلکلۆریی کە لەوەپێش و لە سەرەتای پەیدابوونی باوی تۆمار کردندا ـ لەسەر قەوان ـ و لە سەرەتای پەیدابوونی رادیۆدا زۆر باو بوو ) . هەروەها پەرینەوەش لە قوناغی ( گۆرانیی رادیۆیی یەکسەریی ، تۆمار نەکراو ) . ئەم جۆرە نەوجووانانە ، هاتن بەشیعری ناسك و رەوان ، شیرین لەسەر زمان ، بەسۆز و مەیلە و ئاهەنگی تازە ، بەلکو تازە ، تەنانەت بەئاواز و دارشتنێکی مۆسیقیی مەیلەو تازەوە ، گۆرانیی تازە دابهێنن ، چۆن لە هونەری شیعردا ، شێخ نووری شێخ سالح و عەبدوللا گۆران ، ئەرکی گەورەی داهاتنی هونەری شیعری نوێیان گرتە ئەستۆ ... لای من ، کردەوەی عوسمان سابوونچیی ، با کەمیش بووبێ ، لەناو کردەوەی دەستەی رەفیق چالاك و باکووری و مەریوانیی و مەحموود محەممەد و ئەحمەد مەحموود ( = ئەحمەد دەنگ گەورە ) و کەریم کابان و تایەر تۆفیق دایە کە ئەم دەستەیە بمانەوێ و نەمانەوێ مۆریان ناوە بەهونەری گۆرانیی قوناغێکی گۆرانیی کوردییدا ، مۆرێکی جوان ، پر لە سۆز و ئاواز و نوێخوازیی و پێشکەوتوو ، وەکو لە رایەلەی باسەکانیشدا دەرکەووت ، عوسمان ئینسانێکی سەرسەخت بووە نەك داماو ، هەر چاوی لە پێشەوە بووە ، هەتا هاتووەتە کۆری تیپی مۆسیقای مەولەوییەوە و ویستوویەتی هەر گۆرانییبێژێکی تەلقینکراو نەبێ ، بەلکو خاوەنی زانین و قسەی خۆیشی بێ ، بۆیەکە فێری ساز لێدان بووە کە ئەمەش کەم نییە ، بەتایبەتی کە ویستوویەتی لەسەر بنچینەیەکی دەرس و دەوری زانستیی بێ . راستە ـ ئەگەر گوێ لە دەنگی بگریت ـ دەنگی خۆش بووە ، بەلام قەبارەیەکی خۆیشی هەبووە بلاوبووە و نەیویستووە غەرڕا بێ هەر بۆیەکە هێندە ژیر بووە ویستوویەتی بەفێر بوونی عوود ، لە لایەك شارەزایی خۆی ، لەولاوە دەنگی تەواوی خۆی چاك بناسێ ، دیارە ئەنجامیش ئەوەیە کە جۆرە مەقام و ئاوازێکی زۆرتر لە جۆرێکی تر پەسەند کردووە و هەلبژاردووە ، دیاریشە ، ئەگەر ریبازی راست نەبووایە ، هەرگیز لەلای تیپی مەولەویی جێگای نەدەبووەوە . هەرچۆنێ بێ ، نەوجووانانی ئێمە وەکە لەوان پێشکەوتووترن ، زۆربەیان هەروەکو عوسمان و هاوتای ، بەو رێگایەدا هاتوونەتە پێشەوە لەگەل فەرامۆش نەکردنی باری رۆژگار و هەل ! ـ . دووا جار ئێمە بۆ ئەم جۆرە نەمامە جووانەمەرگانە ، بەرێزەوە دەفتەر دەکەینەوە ، دەفتەری پێشەنگیی !! .

پەراوێزەکان :

1) — بنووارە : رۆژنامەی ( التاخی : الاربعاء 28 / 7 / 1971 ) لاپەرە : 6 . « رثاء بمناسبة اربعين يوماً على وفاة المرحوم عثمان محمد الصابونجي » .

2) — گفتارێکی تۆمارکراوی تایبەتە لە 22 / 5 / 1980 دا لێم وەرگرتووە . لێرەدا بەشێکمان نیشان دا بۆ دووبارە نەبوونەوەی باس .

3) — دوو منداڵەکەی : 1 — سازان : کچە . 2 — سۆران : کورە .

4) — گفتارێکی تۆمارکراوی تایبەتە لە 27 / 7 / 1979 دا لێی وەرگیراوەو و بلاوکراوەی بەرنامەی رادیۆیی « رۆژێ لە رۆژان ( ـ 29 / 8 / 1979 ) ی ئێمەیەو تێکەلێشە بەچەند قسەو باسێکی چەند دانیشتنێکی تر .

5) — شاعیری کۆچ کردوو : ( 1902 ز ـ 18 / 7 / 1976 سلێمانیی ) .

6) — ویستم تەماشای فایلی فەرمانبەریی بکەم لە ( بەلەدییەی سلێمانییدا ) بەلام ئەو دەزگایە ئاگاداری کردم کە فایلەکەی لە دایەرەی ـ تەقاعودی عامەیە ـ .

7) — گفتاری کەریم کابان بەرامبەر ئەم مێژووە ـ لێرەدا تەماشای بکە ـ شایانی سەرنجە . ئەوەی ئەم دەیلێت رێی تێدەچی کە بەوەشدا دەردەکەوێ تەمەنی ـ عوسمان ـ چوواردە پانزە سالان بووە .

8) — لێکدانەوەم لەمەر مەودای تۆمارکردنی ئەو قەوانانە بۆ سالانی 1951 — 1952 دەچێ . لە لایەك لەبەر ئەوە ، ئەو جۆرە قەوانە ـ مارکۆنی ـ ی لە سالی 1951 بەدوواوە لە ـ دار الاذاعة العراقية ـ دا داهاتووە . ( بنووارە پەراوێزی ژ : 10 ) .لە لایەکی ترەوە ، سەرسلام ، ی شاعیرکە ، مەدهۆشە ، دەگێرێتەوە کە لە سالانی 1950 — 1951 ئەو نازناوەی بەسەردا دابراوە . ( بنووارە پەراوێزی ژ : 11 ) ، کە یەکێ لە گۆرانییەکان شیعری ئەمە .

9) — ئەلیف : بۆ یادگار ئەم باسە دەگێرمەوەو دەلێم : لە پاییزی سالی 1966 دا چەند قەوانێکی رادیۆیی ئەووم لە شریتخانەی رادیۆی کوردیی بەغدادا دۆزییەوە و دامناکە پاش ناسینی لاپەرەکانی ژیانی ، وابێ لە بەرنامەکەمدا ، دەنگی هونەر ، باسی بکەم . لەو هەلەدا ، رادیۆی بەغدا کە رادیۆی کوردیی ـ بەشێکی ـ سەر بەئەو بوو ، بریاریدا هەرچی ( وایەر رێکورد ـ

سیم ـ و قەوان و شریتە کۆن ) هەیە کۆی بکاتەوە و بیخاتە مەخزەنەوە ـ گووایە بێکەڵکن ـ . بەرپرسیاری شریتخانەی رادیۆی بەغداش ـ فوئاد ـ ئاووم تێگەیاند کە ئەم کارە بۆ ـ رادیۆی کوردیی ـ بێناز زیانی هەیە . بەلام بێسوود بوو . لە ساڵی 1970 بەدوواوە ، بەهاندانی شارەزایانی کەلەپوور و ئارشیف ، بەتایبەتی د . شەهرەزاد قاسم حەسەن ، لە دەزگای رادیۆو تەلەفزیۆندا بەشێ ـ دامەزرا بەناوی ، مەرکەزی کەلەپووری مۆسیقا ، وەو ئاگادار بووم کە هەرچی ئەو شتانە هەیە لەو ـ بەشەدا ـ گرد کراونەتەرە . هەتا هاوینی ساڵی 1971 کۆششم کرد کە لەو بەشەدا کار بکەم ، بەلام لەبەر هەندێ هۆو بوونم بەیەکەم پەیامنێری رادیۆی کوردیی بەغدا لە سلێمانییدا ، ئەو نیازەم نەهاتە دیی . لە مانگەکانی تەمووز و ئابی 1971 دا لە سلێمانییو هەولێردا کە خەریکی کۆکردنەوەی گفتاری ئەدەبیی و هونەریی و مێژوویی هتد ... بووم ، ناوی ، عوسمان سابوونچی ، و کۆچی یەکجارەکیی هاتە پێشەوە . لە گفتارێکی یەکەم جارەی هونەرمەند کەریم کابانْدا ـ ئەو کاتە موفەووەز ـ بوو ، ئەو ، بیرەوەریی خۆی بەرامبەر هاورێکانی گێڕایەوە : [ بیرەوەریم بەداخەوە ، لەگەڵ گۆرانییبێژێکی کۆچ کردوو ، خوالێخۆشبوو ، عوسمان سابوونچیی ، هەیە کەوا ماوەی دوو مانگ لەمەو پێش کۆچی دووایی‌کردووە . لەگەڵ ئەو ، وەختێ لە ئێستکەدا بوو ، لە ساڵی 1945 — 1946 دا ئەو کاك عوسمان سابوونچیی‌یە ، لە ڕۆژانی هەینییدا ـ وا بزانم مانگی دوو هەنی ـ بوو ، لەگەڵ من ، دوو ئاهەنگیان دابوویە ، پێکەوە بەدوو قۆڵیی گۆرانییمان دەگوت ! ] . ئیتر لەو ساتەوە بەخۆم دەگوت : تۆ بڵێیت ئەو یادگارانەی کە دیبومن مابن ؟ من لە سلێمانییدا و ئەم خولیایەش لە نزیکەوە نەبێ ئارام ناگرێت ! .. هەتا وا ڕێکەوت لە زستانی ، یان لە سەرەتای بەهاری 1972 دا لە کاروانێکمدا بۆ دەزگای رادیۆ و تەلەفزیۆن ، دۆستم ـ غائیب ـ ی تەنبوورە ژەنی کورد کە لە وێدا کاری دەکرد ، ئاگاداری مەبەستەکەم کرد کە بۆم بگەڕێ ، ئەویش پاش ماوەیەك وەلامی دامەوە و نامەکەشم هەر لا ماوە . گۆرانییەکانیش لە ساڵی 1976 دا لەلایەن خەلیل عەبدوڵڵای کارگێڕی شریتخانەی رادیۆی کوردیی بەغداوە خرانە سەر شریت و لەو مێژووەوە دەست بەبڵاوکردنەوەیان کراوەتەوە ، واتە ئەو — 3 — گۆرانییە .

بێ : گفتارەکەی کەریم کابان لە ساڵی 1971 بەرەو ژوور لە بەرنامەی رادیۆیی ـ شەوچەرەیەکی کوردەواریی ـ ئێمەدا بڵاوکراوەتەوە .

10) — مارکۆنی = فابریکەیەکی ئینگلیزیی دام و دەزگای تەل و بێتەل و ئەندازیاریی دەنگبووە ئەم فابریکەیەش ( لە ساڵی 1951 دا دەزگای بڵاوکردنەوەی رادیۆیی ـ مرسلات ـ ی لە ئەبوو غریبدا بەووزەی 20 کیلۆ وات دامەزراند .. ئەندازیارێکی ئەم فابریکەیەمان هاندا کە دەزگای تۆمارکردنێکی پێشکەوتوومان بۆ بهێنێ . ئەمەشمان بۆ هاتە دیی و دەستمان‌کرد بەتۆمارکردن لەسەر قەوانی فافۆنی فیرتاوکراو ) . بنووارە گۆڤاری ، القیثارة / حوزەیرانی : 1980 . گوتاری : بدایە تسجیل الاغانی فی العراق ، کە بەڕای ئێمە ئەو سەرناوە و ئەو باسە زۆر کەم و کورتیی تیدایە و زانستانە نییە .

11) — سەرسام ، ؟ ، = محەممەد عەلی محەممەد = مەدهۆش ( 1919 ـ ... ؟ ) . ئەم شیعرەش لە دیوانی ( شیرین : 1962 ـ چاپخانەی ژین ) دا بڵاوکراوەتەوە . نازناوی ، سەرسام ، بەهیلاکیی پێمان دۆزایەوەو بەینێکە ـ مەدهۆش ـ خۆی بۆی گێڕامەوە و گوتی : [ لە ساڵانی 1950 — 1951 دا ، وەستا بەشیر موشیر ـ رحمە اللە ـ لەگەڵ مەعرووف جیاووك هاتن بۆ سلێمانیی و گوتیان : ئێوەمانان دەبێ ناوی کوردیی لە خۆتان بنێن . منیان ناو نا ، سەرسام ، کە تەنانەت قیتعەی دوکانەکەشم لابرد و ئەو نازناوەم لەسەر دانا . هەندێکی تریان ناو ، لەوانە : فایەق زیوەری شاعیر یان ناو نا ، سەرکەوتوو ... ] . بۆ وێنەش ، لێرەدا ، چەند بەیتێکمان نیشان دا .

12) — شاعیری کۆچ کردوو : هەوری = ئەلیف . بێ . هەوری = ئەبووبەکر جەلال تاها . شاعیر و ئەدیب و چیرۆکنووسی شانۆ و خاوەنی چەند بەرهەمێکی چاپکراو لە شیعر و چیرۆکی شانۆ و زمانەوانییدا . ( 1915 ز ـ 8,7 / 4 / 1979 بەغدا ) . لە بەرنامەی رادیۆیی : ( شەوچەرەیەکی کوردەواریی ـ 1971 و بەرنامەی : ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ مانگەکانی 6,4 / 1979 ) ی ئێمەدا گفتاری خۆی و باس و یادی کراوەتەوە . بۆ وێنەش لێرەدا چەند بەیتێکی شیعری گۆرانییەکەمان نیشاندا .

13) — شاعیرمان پێ‌نەناسرا . ئەم پارچەیەی شیعزی گۆرانییەکەش هەر بۆ وێنە ، وەکو خۆی ، لە گۆرانییەکەوە وەرمان گرتووە .

14) — شاعیری کۆچ کردوو : گۆران = عەبدوڵڵا سلێمان ( 1904 هەڵەبجە ـ 1962 سلێمانیی ) کە لەلای ئێمە دەورێکی گەورەی بێ‌هاوتای هەبووە بۆ داهاتنی گۆرانیی نویی کوردیی نەك هەر شیعری نوێ بەتەنها .
بۆ وێنەش ئەم پارچەیەی شیعری گۆرانییەکەمان نیشاندا . ( بنووارە : سەرجەمی بەرهەمی گۆران ـ بەرگی یەکەم ـ 1980 چاپخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق . بەغدا ـ 1980 ) .

15) — ئەلیف : هونەرمەندی ناوداری رادیۆی کوردیی و شانۆی کوردیی و ئەدیب و نووسەری چیرۆکی تەمسیلی و ئاواز دانەر وگۆرانییبێژ . .

16) — شاعیر : هەردی = ئەحمەد حەسەن عەزیز ( 1922 هەڵەبجە ـ ... ؟ ) . شیعرەکەیشی ناسراوە لە ( رازی تەنیایی ـ احمد هەردی ، چاپخانەی : شەفیق . بەغدا / 1957 ) دا تەماشا بکە .

17) — بەم دوو تاکەی لەبەر دەستدایە ، نەمانتوانیی شاعیر بناسینەوە .

18) — ئەلیف : میرزا مارف = ( میرزا مارف کوڕی ملا احمدە ، خەلکی سلیمانی ، لە سالی 1313 ی هجریدا هاتوەتە دنیاوە . تحصیلی مدارسی علمیەی هەیە . ادیب و شاعیر و ، هتد .. ، ) بنووارە : کتێبۆکەی : ( گلدەستەی شعرای هاو عصرم ـ بەقەلەمی علی کمال باپیر آغا نوسراوە ـ چاپخانەی ، ژیان ، ی پیرەمێرد : سلیمانی / 1939 ) .

بێ : نەمانتوانیی لە سەرچاوەیەکدا تەواوی ئەم شیعرە ببینینەوە و بینووسینەوە .

تێ : بە لێکدانەوەی ساڵی لە دایکبوونی : 1313 هـ = 1893 ز ! بۆ ساڵی کۆچیشی پرسیومانە کە 1956 ز .

19) — ئەلیف : ئەم گفتارەی هونەرمەند ولیام یوحەننا لەسەر داخووازیی خۆمانە که لە مانگی 6 / 1962 دا بۆی ناردین هەتا هەر بیرەوەریی یەکی هەیە لامان تۆمار ببێ . هەر ئەویش — 3 — وێنەی خۆی و عوسمانی پێشکەش کردین کە لەبەر جووانیی ئەوانە ـ لێرەدا ـ ئەو وێنەیەی کەریم کابان پێشکەشی کردین ، هەروەها وێنەکانی عوسمان کە کەس و کاری پێشکەشیان کردین ، بخەینە لاوە و دووانیان بۆ بڵاوکردنەوە هەڵبژێرین .

بێ : وێنە[1] : عوسمان سابوونچی لە باخچەی گشتیی سلێمانییدا ( لەگەڵ دەستەی تیپی مەولەویی : قادر دیلان / ئوکۆردیۆن . ولیام یوحەننا / کەمان . سەردار رەمزی / کەمان . بەهجەت رەشید / عوود ) گۆرانیی دەڵێ . وەکو پرسیشمان کردووە ئەوە لە ساڵی 1956 دا بووە بەبۆنەی دەرچوونی کۆمەڵێ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی .

تێ : وێنەی[2] وێنەی عوسمان کە پێشکەشی ولیام یوحەنناى کردووە

20) — سەماعی و بەشرەف ( = پێشرەف / ك . / . م ) و لۆنگا = چەند قاڵبێکی مۆسیقان . وەکو پرسیومانە ، ئەو ئاهەنگانە بەبۆنەی لافاوەکەی ساڵی 1957 ی سلێمانییەوە بووە کە لەو شارانەدا ـ پیتاك ـ بۆ لافاوەماوان کۆکرایەوە . بۆ یادگاریش دەیگێڕمەوە کە دۆستانی عوسمان ئێستاش ئەم یادگارە دەگێڕنەوە کە لە یانەی فەرمانبەرانی ـ کۆیە ـ دا ڕووی داوە : « لە هەڵێکدا کە ڕەشۆل عەبدوڵلای گۆرانییبێژ ـ کۆچ کردوو ـ دەنگ هەڵدەبڕێ گۆرانیی بڵێ ، عوسمان سابوونچیش هەرلەو هەلەدا دەنگ هەڵدەبڕێ وا روو دەدا کە هەردووکیان بسلەمێنەوە و گۆرانیی تەواونەکەن . ڕەشۆلیش سووکێ بە عوسمان دەڵێ : دە دەی « کەلسووم » تۆ بیڵێ .

## پاشکۆ

بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی ـ کرداری تۆمارکراوی ـ عوسمان‌و بڕوواکردنیش بە لافەکانی براکەی سەبارەت چەند گۆرانیی‌یەکی وون‌بووی عوسمان ، ئەوا پاش لێکۆڵینەوەیەکی سەخت ، ڕاستیی تۆماربوونی گۆرانیی‌یەکان‌و ژمارەیان ـ بە قەوانەکانیشەوە ـ دەرکەووت کە لێرەدا بۆ نموونە ناوی بڵاوکردنەوەی ـ ڕۆژی لە ڕۆژانیان ـ دەخەیینە ڕوو :

1 — دڵ « دڵێ لە خۆیا دائم تەڕ نەبێ » : شیعر : بێکەس / 16 / 2 / 1956 .

2 — « ئەی دڵ زەمانە « غەمی لێت ئەوێ : شیعر : خیام ـ وەرگێرانی ( شیخ سلام ) 16 / 2 / 1956 . ( لە پەراوێزی ژمارە 17 گوتبوومان کە شاعیرمان پێ‌نەناسراوەتەوە ، بەلام پاش کۆڵینەوە شاعیرو وەرگێڕ دەرکەوتن کە ئەمەش لە ژمارە 182 ی 2 شەموو 23 ی مارتی 1953 بەرگ 5 ی گۆڤاری : ئاگاو رووداوی هەفتەیی ـ چاپخانەی معارف : بەغدا بڵاوکراوەتەوە ، بەم جۆرە :

خیام بە کوردی

لە لایەن شاعر ( شیخ سلام ) موە
کراوە بە کوردی

ئەی دڵ زەمانە غەمی لێت ئەوێ ،
روحی شیرینت دەرئەچی شەوێ ،
خوش بژی ئەمرو لە سەبزەزارا ،
بەر لەوە سەبزەی خاکت سەرکەوێ .

* * *

لە هاتن غیری دەردی سەرچی بو ؟
لە مردن غیری دەربەدەر چی بو ؟
لە هیچ کەس ئەم بیست من بەم دوو گوێیە :
ئەم هاتو چویەی من لە بەرچی بو !

* * *

کە مردم شراب آوی شورین بێ ،
قاقاو شیشەی مەی لە جیاتی شین‌بێ ؛
دەرگای مەیخانە جیگای بینین‌بێ .

ئەم وەرگێڕانەی شێخ سەلامی شاعیریش کە لە دیوانی ( شێخ سەلام ) دا نەنووسراوەتەوە ، لە مێژووی تۆمارکردنی گۆرانیی‌یەکە نزیکمان دەکاتەوە ، یان پێش 1953 یە یان پاش ئەم بڵاوکردنەوەیە . جگە .

لایەنی هەستی عوسمان بۆ ـ هەڵبژاردنی شیعری گۆرانیی ، ناسك‌و پڕ ئاواز ـ ڕوون‌دەکاتەوە کە دیسان ئەم لایەنەش بە هەڵبژاردنی گۆرانیی ـ هەشتەمدا ـ دیارە .

3 — مەقامی حسەینی « بە یادی جاران » شیعر : «؟» / 29 / 2 / 1956

4 — « کچی جووان » .. (باسمان کردووە) / 29 / 2 / 1956

5 — تانگۆ «یاریار» .. (باسمان کردووە) / 2 / 2 / 1958

6 — سکاڵا : « گوناهی من ئەبێ چی بێ ؟ » .. (باسمان کردووە) / 9 / 2 / 1958

7 — « خۆزگە وابوایە » .. (باسمان کردووە) / 16 / 2 / 1958

8 — « شیرین لە بیرت نەچم « شاعیرمان پێ‌نەناسراوەتەوە / 23 / 2 / 1958 .. ئەم شیعرەش لە ( یادگاری لاوان ـ 1933 . بغداد : چاپخانەی «کرخ» ، لاپەرە 45 دا بەم جۆرە بڵاوکراوەتەوە بەبێ ئاشناکردنی شاعیر گورانی : بو «ش»
( لە بیرت نەچم ) .... هتد

لە بەر ئەم ڕۆشنایی‌یەش دەردەکەوێت کە « 6 » گۆرانیی ئەم گۆرانیی بێژە جووانەمەرگە بووەو لە « رادیۆی کوردییدا ـ وون‌بوون « کە گۆرانیی ژمارە « 1 + 3 » لەلای براکەیشی باس نەکراوون . لە لایەکی ترەوە ، ئەو ڕاستی‌یەش فەرامۆش ناکرێت کە گۆرانیی‌یەکانی ـ لەگەڵ تیپی مەولەوی ـ لەلایەن کەسێکەوە ناو نەبراوون‌و نیشان‌نەدراوون ، کە گومانم نی‌یە گۆرانیی تۆمارکراوی هەبووە . موخابن ئێمە چەند پرسیارمان کردووە کەس بە دەنگمانەوە نەهاتووە !؟.

ئامادەکردنی
ئەسعەد عەدۆ

# ڕێوی نابێ بە شێر

**( کات، بەهارێکی کوردستان شوێن، دارستان و مێرگێکی کوردستان ئەکتەرەکان، گیان لەبەرو پەڕەوور)**

**ـ پەردە دەکرێتەوە ـ**

**شێر**: بەنەڕاندن بانگی مام ڕێوی دەکا!
**ڕێوی یەکەم** : بەیانی باش گەورەم .
**شێر** : ها .. مام ڕێوی بۆ والاوازی؟ . وات لێ هات گەورەی فێلبازان خواردنت دەست نەکەوێ؟!
**ڕێوی یەکەم** : گەورەم .. پادشای دارستان، لاوازیم هۆی نەخۆشیم نیە، بەڵکو مەترسی ئەو ڕاوچیانەیە . ئەی نازانی نرخی پێستەمان بەرزبۆتەوە، بۆیە ئەو ڕاوچیانە چ قوژبنێك نامێنێ لەدوامان نەگەڕێن بۆ کوشتنمان تاکو کەورمان بکەن و پێستەکەمان بفرۆشن و بە پارەکەی دەولەمەند بن جا لەبەر ـ ئەمە ناوێرین لە شوێنی خۆمان دەرچین .
**شێر**: ئەگەر وا دەترسیت بۆ نابیت بە ڕێ نیشاندەرم؟ یارمەتیت لە یاد ناکەم، بەمجۆرە لە ترسان و لە برسان ڕزگاریت دەبێ .
**ڕێوی یەکەم** : بەدڵێکی خۆش .. سەرچاوم گەورەم خزمەتکارم، هەر لەئێستاوە لەخزمەتم!
( ڕێوی بەرەو مێرگەی نزیك دارستانەکە دەڕوا بۆ ئەوەی نێچیرێك بدۆزێتەوە، چاوی بە کاڕانێك دەکەوێ .. لەناکاو دەگەڕێتەوە لای شێرە پیرە) .
**ڕێوی یەکەم**: گەورەم کاڕانێك وا لەو مێرگەی نزیك دارستان دەلەوەڕێن .
**شێر** : هەڵدەسێ! بڕوانە چاوەکانم سووربوون؟!
**ڕێوی یەکەم** : بەڵێ قوربان ئاگریان لێ دەبارێ!
**شێر** : ئەی مووی لەشم چۆنە؟
**ڕێوی یەکەم** : دەڵێی سووژنە!
**شێر** : ئەی نینۆکەکانم؟
**ڕێوی یەکەم** : وەك نشتەری پۆلایی یە!
**شێر** : ئینجا تەماشای ئەم هێرشەم بکە .
( شێرەکە هێرشێکی دڕندانە دەکاتە سەر مانگایێك، پشتی دەشکێنێ و ملی دەگرێ تا دەیخنکێنێ، ئینجا پارچە پارچەی دەکاو ڕانێك فڕێ دەداتە بەردەمی مام ڕێوی) .
**شێر** : مام ڕێوی خۆت تێرکە، تا لەگەڵ من بیت برسیەتی نابینی .
( مام ڕێوی بە پەلە گۆشتەکە دەخوا تا هەناسە تەنگ دەبێ لەپاش ماوەیێك مام ڕێوی تەندروستی باش دەبێ وکەمێك قەڵەو بەهێزدەبێ، ڕۆژێکیان لەژێر دارێك پاڵ دەکەوێ، تیشکی خۆر لەنێوان لق و پۆی دارەکان دەهاتە خوار، لەو کاتەی پیرە شێر خەوی لێکەوتبو .. مام ڕێوی «شای بە سەپانی خۆی نەدەزانی» بۆیە بیری لەخۆی دەکردەوەو لەگەڵ خۆی قسەی دەکردو دەیووت :
ـ دەست و قاچەکانم زۆر بەتینن، لاشەکەم وەك لاشەی پیرە شێری لێ هاتووە! ئەی بۆ خۆم ڕاو بۆ خۆم نەکەم و خزمەتکارێکیش ڕابگرم .. چ جیاوازییێك هەیە لەنێوان من و پیرەشێرە، بۆیە مام ڕێوی نووستنی پیرە شێرەی بەهەلزانی و دەڕوا، تا گەیشتە قوژبنێکی دارستانەکە، لەوێ چاوی بە ڕێوێکی نەخۆش و لاواز کەوت و لێی نزیك بووە)!
**ڕێوی یەکەم** : بەلووت بەرزیەوە، ئەوکاتەت باش .. ئەوە چیت لێقەوماوە وا نەخۆش و لارو ڕەنگ زەردیت، بۆم باس بکە تا یارمەتیت بدەم و ڕزگاریت بێ لەم ناپووتیەت!
**ڕێوی دووەم** : برای شیرینم بۆ نازانی لەبەرچی وام لێ هاتوە، ئەی ڕاوچیەکانت لەیاد چووە؟ ئەی نازانی لە ترسی ئەوان توانای دەرچوونمان نیە، ئەی نازانی پێستەمان بەنرخە، چاوەکەم برای پشتم .. تو ئەم خوایە یارمەتیەکم بدە!
**ڕێوی یەکەم** : بەقینەوە، ئەوە بۆ وەك خۆت تەماشام دەکەیت من شێرم، من پادشای ئەم دارستانەم!
**ڕێوی دووەم** : بەسەرسووڕمانەوە .. چۆن ڕە گەزی خۆت لەـ بیرچوو! چۆن زمانت هەڵئەگرێ بڵێی من شێرم!
**ڕێوی یەکەم** : گێلە، تەماشای دەست و قاچم بکە چەند بە هێزن، بە دەست و قاچی شێر دەچێ، لاشەم بە لاشەی ئەو دەچێ!
**ڕێوی دووەم** : بەقاقای پێکەنینەوە هەرچەند زل و بەتین بیت

نەبووەو ناشبێ بڵێی شێرم .

**ڕێوی یەکەم** : ئێستا بەچاوی خۆت دەبینی چۆن شێرێکم!

(کۆترو بێچووەکان بەیەك دەنگ ووتیان : ڕێوی ، ڕێوی ، ڕێوی)

**کۆتر** : بێچووەکان ، کوڕیە نازدارەکانم بڕوانن ئەو ڕێـوییە گێلەچۆن دەڵێ من شێرم ، کەچی هەر ڕێوییە ، بەلام « وا من مردم ئێوە زیندو» ئەو ڕێوییە بـەم لووت بەرزیخـۆی لەنێو دەچێ .

( ڕێوی دووەم بوو بە خزمەتکاری ڕێوی یەکەم وەك چۆن ئەو خزمەتکاری پیرەشێر بوو) .

**مریشك** : ق .. ق.. ق.. ق.. ق...

**ڕێوی دووەم** : گەورەم گـوێت لێیە ، خـوا ناردی .. بـەخوا برسیەتی کاری لێکردووم .

**ڕێوی یەکەم** : ـــــ

**ڕێوی دووەم** : ئەوەبۆ وەلامم نادەیتەوە ، لە گۆشتی مریشك زەریفتر هەیە .

**ڕێوی یەکەم** : بەڕووگرژیەوە ، شەرم ناکەی بەم جۆرەقسەم لەگەڵ دەکەی؟! هیچ بیستووتە شێر ڕاوی مریشك بکات؟ بۆمن شووریەیە! ڕاوی ئـەو بەستـەزمانـانە بکـەم . خواردنی من گۆشتی حوشترو مانگاو مەڕو بزن و ڕەشەووڵاخە !! (لەڕۆیشتن بەردەوام بوون ، هەتا لەڕۆیشتنی فیزی لەسەر خزمەتکارەکەی لێدەدا) .

**ڕێوی یەکەم** : والەسەر ئەم زوورگە دادەنیشم ، تۆیش بچۆ بەدوای شوێنی نێچیرێك بگەڕێ .

**ڕێوی دووەم** : بەگـاڵتەوە ، بـەڵێ گەورەم ، بـەڵێ پادشـای دارستان! ( ڕێوی دووەم دەڕوا بۆ نێچیر دۆزینەوە ، چاوی بە گامێشێك دەکەوێ لە دڵیخۆیدا دەڵێ : « ئەو گـامێشە نـەبێ کـەسیتر نـاتوانێ چـارەی ئەو لووت بـەرزە بکا .. لەنـاکـاو دەگەڕێتەوە)

**ڕێوی دووەم**: گەورەم گامێشێك وا لەو گۆمە ئـاوەی نزیـك دارستانەکەیە .

**ڕێوی یەکەم** : ڕاستدەکەی؟ **ڕێوی دووەم** : بەڵێ ڕاستە .. بەخوا گۆشتەکەی خواردنی یەك هەفتە زیارترە .

**ڕێوی یەکەم** : کوا؟ زووکە تا هەڵنەهاتوە ، تا پارچە پارچەی بکەم!

**ڕێوی دووەم** : لەوێیە ، بابزانم چۆن هێرشی بۆدەبەی .

**ڕێوی یەکەم** : وادیارە تا ئێستا گاڵتەت بە هێزی من دێ!

**ڕێوی دووەم** : بابزانم ، ئەگەر بەسەریدا زاڵ بوویت تا من هەم خزمەتکاریت دەکەم .

**ڕێوی یەکەم** : بڕوانە چاوەکانم سووربوون؟

**ڕێوی دووەم** : نەخێر ، هیچی تیا بەدی ناکەم!

**ڕێوی یەکەم** : گێلە ، بڵێ ئاگریان لێدەبارێ!

**ڕێوی دووەم** : وانیە بەلام با وابێ .

**ڕێوی یەکەم** : تەماشای مووی لەشم بکە ، دەڵێ سـووژنە ، وانیە؟

**ڕێوی دووەم**: نەخێر ، هیچ گۆڕانێکی تیا بەدی ناکەم!

**ڕێوی یەکەم** : بڵێ وایە ، ئەوەڵێ بەم دەستە پـۆلایانـە پشتت دەشکێنم!

**ڕێوی دووەم** : چۆنی دەڵێی وایە گەورەم!

(ڕێوی لووت بەرز هێرشی کردە گامێشەکە .. گامێشەکەش خۆی سـووڕاندەوە ڕێـوی لووت بـەرزی لەژێـر قـاچی خـۆیـنـا ، بەقوربانی مردنی کرد) .

**ڕێوی دووەم** : ئێستا چۆنی هەی گێلە

**ڕێوی یەکەم** : بەمەلوولیەوە ، تۆو ئەوخوایە یارمەتیم بـدە ، پشتم شکاوە ، دەمرم .. ئەی هاوار ...

**ڕێوی دووەم** : ئا ئەمە سزای تۆیە ، سزای هەر کەسێکە کە ڕەگـەزی خۆی لەیـاددەچێ ، وا دەگەڕێمـەوە دارستان ئـەم ڕووداوەی تۆیان بۆدەگێڕمـەوە ، تاکـو ببێتە دەرز ، وا دەڕۆم بێئەوەی یارمەتیت بدەم چونکە بە ئامۆژگاری برای پشتی خۆت نەکرد .

( ڕێوییەکە لەوێ بەجێدەمێنێ تا دەمرێ)

پێشینان ووتویانە : « ئەگەر کەر بچێتە .... نابێ بە هێستر » پەردە دادەخرێ

**دوو تێبینێ**

1) مامۆستا « مەحمەد تۆفیق ووردی » ئـەم چیرۆکـەی بە عەرەبی ( لن یصبح الثعلب أسداً ) لە کتێبەکەی خۆی « النماذج من التراث الشعبی الكردی » بڵاوکرووتەوە .

2) ئەم چیرۆکە شانۆکەریە فۆلکلۆریە ئیجازەی چاپکردنی دراوە لە بەڕیوەبەرایەتی چاودێری چاپەمەنی لە بەغدا لە ژێر ژمارەی ( ١٨١ ) بەرواری ١٧/١١/١٩٨٢ .

# پەپوولە ڕەنگاوڕەنگەکان

نووسینی : جلیل القیسي
وەرگێڕانی بە دەسکارییەوە : زایەر عبدالله

تەمەنی محمود « 70 » ساڵە .
تەمەنی سلوێ « 65 » ساڵە .
« پەردە دەکرێتەوە »

( ژوورێکی ئاسایی ؛ دوو دەرگا لەلای ڕاست .. دەرگایەک لەلای چەپ .. پەنجەرەیەک دەڕوانێتە سەر خانوێکیتر .. لەمدیو پەنجەرەکەوە چەند درەختێک دیارە ... ڕۆژمێرێکی گەورەو وێنەی کچێکی قەشەنگ بەچوار چێوەیێکی زێڕ بەدیوارا هەڵواسراوە ، مێزێک ، کۆمەڵە پەرتوکێکی بەناڕێکی لەسەرە .؛ زەنگی دەرگا لێدەدرێ ... « سلوێ » لە دەرگای چەپەوە وەدەردەکەوێ بە بۆڵەبۆڵەوە )

**سلوێ** : بەڵێ .. بەڵێ .. ئەوەهاتم دەقیقەیەک .. دەزانم ئەم منداڵە هاروبەتەرانە یاری بەزەنگەکە دەکەن .؛ ئوهـ خوایە .. لەگەڵ بەهاریْ ئەمانیش وەک زەنگەسوورە بەکۆڵاناندا پەرت دەبن ... بەڵێ بەڵێ ..

( دەرگا دەکاتەوە .. پۆستەچی دێتە ژوورەوە )

**پۆستەچی** : زەحمەت نەبێ .. ئێرە ماڵی « محمود عاصي » یە

**سلوێ** : بەڵێ .. فەرموو

**پۆستەچی** : ( زەرفێکی کاغەز دەردێنێ ) فەرموو ـ ئەم ـ بروسکەیەتان بۆهاتووە .. تکایە لێرەش ئیمزای بکە .. ئا لێرە .. سوپاس .

**سلوێ** : ( بەسەرسوڕمان سەیری بروسکەکە دەکات ... پۆستەچی دەڕوات ) دەبێ کێ بێ بروسکەی بۆ لێدابین ؟! ها .. ئەیەڕۆ .. سوپاسی کاکی پۆستەچیم نەکرد ( بەدەنگێکی بەرز ) سوپاس .. زۆر سوپاس .. ( سەیرێکی بروسکەکە دەکاتەوە ) بەبێ چاویلکە هیچم بۆناخوێنرێتەوە ( بەرەو دەرگای چەپ مل دەنێ ... پاشان دەگەڕێتەوە ـ چاویلکە لەچاو دەکات ـ دەچێتە لای پەنجەرە .. پەردەکە نەختێک لادەدات .. بە دەنگێکی بەرز دەکەوێتە خوێندنەوەی بروسکەکە ) دایکی ئازیزم .. باوکی ئازیزترم ... لە « 10 » ی حوزەیران .. منو . شوانۆکەو باوکی دەگەینە لاتان ... زۆرتان بیردەکەم زۆر ... سڵاو ڕێزم بۆتان ... میدیا ...

( هەناسەیێکی قوڵ هەڵدەکێشێ ... زەردەخەنە لەڕووی دەبارێ ) پاش ئەم هەموو ساڵە غەریبایەتی ( سەیرێکی بروسکەکە دەکاتەوە ... خولێک دەسوڕێتەوە فرمێسک لە چاوی دێتەخوارەوە ... چاوەکانی دەسڕێتەوە بروسکەکە تێر تێر ماچ دەکات .. لە پەنجەرەکەوە بانگ دەکات ) محمود .. محمود ... ئاهـ ... بەم کەم بینییەش واز لە ڕێکخستنی ئەم باخچەیە

ناهێنێ .. هەرگیز ... نەواز لە خوێندنەوە دێنی نە
لەبۆن کردنی گوڵو پەپولان ... بێزاریش نابێت
( بانگ دەکات ) محمود ... محمود .
**دەنگی محمود** : بەڵێ .. بەڵێ سلوی .. چی یە ؟
**سلوێ** : وەرە ئازیزەکەم ... وەرە
**دەنگ** : بۆ .. پێویستە بێم ؟ تۆ وەرە .. سەیرکە .. ئەی نەمووت
ئەم گوڵە ئەشرەفی یە زەردانە لەبەهارا دەگەشێنەوە ..
بزانە ئەم رەنگە جوانەی .
**سلوێ** : هەواڵێکی گەلێك خۆشم پێیە .. ئەللا .. هەر من
دەزانم چۆن بەم هەواڵە شاگەشکە دەبێت .. وەرە ..
**دەنگ** : ها .. دیارە پەرتوکێکی تازەیان بۆهێناوم .
**سلوێ** : نەء ... نا نا
**دەنگ** : ئێ .. دیارە نامەی هاورێیێکی زۆر خۆشەویستم
بۆهاتوە .
**سلوێ** : نەء .. رەنگە .. نا .. بەڵێ .. رەنگە
**دەنگ** : ( پێدەکەنێ ) ئەم وەڵامە سەیرە چی یە ( بە
سۆزەوە ) سلوێ .. تۆ سەیری ئەم گوڵە نێرگسەکە .
**سلوێ** : چی یەتی ؟
**دەنگ** : لەیادت چوو ؟ چەند دانەیەکم هەڵبژارد .. هەندێکم بۆ
تاقی کردنەوە چاند .. تەماشاکە ئەوە لەگەڵ بەهارا
گەشایەوە .
**سلوێ** : محمود .. ئازیزەکەم دەوەرە دەی -
**دەنگ** : سلوێ ... تۆ وەرە بەر رۆژێ ... وەرە سەیری ئەم
پەپولە جوانانە بکە .
**سلوێ** : راست دەکەی پەپولەش جوانە .
**دەنگ** : زۆر بەستەزمانن ... هێندێکیان زۆر بەسانایی دەگیرێن
.. بەڵام هەموویان نەء .
**سلوێ** : کورە باخچەوانە پیرە وەرە .. وەرە .
**دەنگ** : چاکەچاك .. ئەمە هاتم .
**سلوێ** : ( هەناسەیێك ) ئای میدیا ... دەترسام بمرمو
نەتبینمەوە ... خوایە .. هەرگیز دڵی نەشکاندوین
قسەکانی زۆر خۆشە ... دەمێکە سەردانمان ناکا ..
نامەشی لێبڕیوین .. بەصرە شارێکی دوورە .. بەڵام
پۆستەی لێیە .. زۆر زەحمەتە پیرە دایکێکی وەکومن
تاقە کچێکی خۆی نەبینێ .. من ... میدیا دەبینم ؟!!
ئای کە گوشادم .. میدیا گیان ( بەرەولای رۆژمێرەکە
دەروات - بەسۆزەوە - میدیا رۆژی ... رۆژی .. ها ..
ئا .. دەی حوزەیران .... ئیمرۆ .. ئیمرۆ .
**محمود** : ( دێتە ژوورەوە ) ئیمرۆ چی یە ؟!
**سلوێ** : بڕوابکە دوێنێ شەو لە خەوا دیم .
**محمود** : ( بەساردی ) بگرە ... ئەم گوڵە بگرە .. هێندێك
مێشکتی پێ ساف بکە .
**سلوێ** : (گوڵەکە وەردەگرێ) سوپاس .. دەزانی دوێنێ شەو
میدیام لە خەوا دیت .
**محمود** : شتێکی ئاسایی یە ... چونکە بیری لێدەکەیتەوە ...
(بێ دەنگی) هەروەك چۆن من بیری لێدەکەمەوە .
**سلوێ** : لە خەونمدا ... لە جێگاییێکی گەورەو قەرەباڵغدا بوو
... جێگاکە وەك ئورزدی باگ وابوو .
**محمود** : زۆر ئاسایی یە ... ئێ ی ..
**سلوێ** : لەودیو جامخانەکەوە دیم ... دەستی بۆ هەڵبریم ...
رەفتەیێکی شینی ئاسمانی لەسەر بەستبوو ...
بەدەستەکەی تریشی شوانۆکەی گرتبوو ..
(بێ دەنگی) دەبینم بێ کەیفی
**محمود** : کەیف ... بەم خەونە ( دەست لە شانی سلوی دەدا )
توخوا ... تەنیا بۆئەم خەون گێرانەوەیە بانگت
کردم ... (پێدەکەنێ) ئازیزەکەم .. وەرە بزانە ئەم
بەهارە چەندە خۆش و رەنگینە .. وەرە بەررۆژێ ...
وەرە لە باخچە هەوای پاك هەڵمژە .
**سلوێ** : دیارە بە هەواڵی میدیاو ناوهێنانی پەست دەبیت .
**محمود** : میدیا .. بۆچی من لەم عیفریتە زیاتر کەسم هەیە ؟ ئەم
پرسیارە ناماقوڵە بۆدەکەیت ؟ یەللا .. یەللا وەرە .
**سلوێ** : ( وەك خەون بگێڕێتەوە ) دیم بە شپرزەیی هەنگاوی
دەنا .. هاوارم کرد ... میدیا .. میدیا ..
**محمود** : دەزانم .. دەزانم .. غەریبی کچەکەت دەکەی ..
دەزانم چۆن لە دووری دەسووتێی .. (دەکۆخێ)
ئۆف ... ئاهـ .. یەك دوو رۆژە ئەم کۆخەیە
بێزاری کردوم ... (بێ دەنگی) خەون دیتن
مەسەلەیێکی ئاسایی یە .. یەکجار وارەشبین
مەبە .. وەرە .. وەرە دەی .
**سلوێ** : (بەنازەوە) دەباشە .. ها بیخوێنەوە .

**محمود** : ( بروسکەکە وەردەگرێ ) چاویلکەکەی خۆتم دەیێ ( لێی وەردەگرێ .. دوور بە دووری لەبەرچاو رایدەگرێت .. بروسکەکە دەخوێنێتەوە ) ها .. ئەم بینەو بەردەیەت لەچی ... بۆنالێی ئەم عیفریتەبروسکەی بۆلیداوین .. ئای .. میدیا سوپاست دەکەم سلوێ .. بە راستی دڵت خۆش کردم ... ئەمە کەی ئەم بروسکەیە گەیشت .

**سلوێ** : ماوەیێك لەمەوبەر ... گوێت لە زەنگی دەرگا نەبوو ؟

**محمود** : ئینجا من گوێم لەچی دەبێ .. من لە باخچەو زەنگی دەرگا ئاوا ( بە خۆشی‌یەوە ) حەتمەن ئێستا گەورە بووە ... شوانە کچەکەش هەنوکە گەورە بووە (بێ‌دەنگی) سلوێ ... دەزانی ماوەیێکە بیر لە شتی زۆر سەیر دەکەمەوە .

**سلوێ** : شتی سەیر ؟! وەك چی ؟

**محمود** : وڕێنەم دەکرد ... دەمگوت دەمرم و میدیا نابینمەوە .. دوای من تۆ چیت‌دەما ؟ پاش ئەوەی هەموو ژیانمان بەیەکەوە بەسەربردوە ... ئەم هەموو ساڵانەی بەیێکەوە ژیاین ... وا دەهاتە بەرچاوم .. تۆ بێ هاوڕێ‌و بێ هاوسەر پاش من هەرشینت دەگێرا ... ئێهـ ... وڕێنەیێکی بێ‌مانابوو ...

**سلوێ** : میدیا هەردەم پیریمان بیردەخاتەوە .. وڕێنە .. ئاهـ .. ژیانێکی پڕ لە بۆشایمان هەیە .. پاش بە شوودانی .. خەم‌و تاڵی بۆ جێ‌هێشتین (بێ‌دەنگی) دێتەوە یادت یەکەم خانوو کە چوینە ناوی لەگەڕەکی « ئەڵماس » ... هەینێ میدیا تەمەنی نۆ ساڵان دەبوو .

**محمود** : سلوێ ... یادگاریمان زۆر هەیە لە گەڕەکی ئەڵماس بەتایبەتی لەگەڵ میدیا

**سلوێ** : دەزانی .. میدیا هەردەم لەسەر منداڵەکانی گەڕەك زاڵ‌بوو ... لە « یاری » یشدا یان بەڕێوەبەر یان موفەتیشەخۆی‌بوو .. منداڵەکان هەموو لێی دەترسان .

**محمود** : ( بروسکەکە دیسان دەخوێنێتەوە ) قەت ئەم بلحاتە تەرك ناکات ... هەر بەکورتی دەنووسێ .. ( دەچێتە لای ڕۆژمێرەکە ) ئۆی ـ ئیمرۆ (10) ی حوزەیرانە ( بروسکەکە ماچ‌دەکات ) ئیمرۆ دەگاتە لامان .. (بێ‌دەنگی) سلوی ... دەمەوێ وێنەی بێنمەوە بەرچاوم .. هەرکە چاوی لێك‌دەناو برژانگە درێژەکانی دەخستنە سەریێك ... ئەڵلا .. (بێ‌دەنگی) پێویستە بەجوانترین شێوە پێشوازی بکەین و دڵی خۆش بکەین

**سلوێ** : هەموو شتێکی بۆ درووست‌دەکەم ... چاك دەزانم چ خواردنێکی پێ‌خۆش‌بوو (دەڕوا)

**محمود** : ( لە ژوورەکەدا دێ‌وەچێ ) ئای سلوێ چەندە بەستەزمانی هەر هەندە لەخۆشیان باڵ ناگرێ .. تەنیا میدیا یادگارەکانمان دەبزوێنی .. خەم‌و تاڵیمان لەسەر رادەماڵێ ... هەرکەهات پیری وەلادەنێین‌و لەبیری دەکەین ... ئای میدیا گیان ... ( لەدەرەوەرا ... هەلهەلەو چەپڵەرێزەو گۆرانی میللی دەبیسترێ .. سلوێ دێتەوە ژوورێ .. گوێ بۆ گۆرانیەکە شل‌دەکات .. لەبەرخۆیەوە گۆرانیەکە دەڵێتەوە لەپەنجەرەرا سەیری دەرەوە دەکات .. پاشان پەنجەرەکە دادەخات .. دەنگەکان نزم‌دەبنەوە ) .

**محمود** : ئەم هەلهەلەو هەراوهۆریایە چی‌یە ؟

**سلوێ** : ئەمە مریەمی کچی حاجی کریمی دەگوێزنەوە .

**محمود** : بەراستتە ! مریم ! مریمی‌قشتیلە ... ئەویش گەورەبوو ... ڕوو سپی‌بێ .. بازارو شت‌وەمەك کرینمان‌هەر لەسەر ئەم‌بوو .. ئێ‌هێ .. ژیان ئاوایە (بێ‌دەنگی) سلوێ .. ئەمەچی‌یە لەدەستت ؟

**سلوێ** : ئەلبومە تایبەتی‌یەکەی میدیایە ... (سەیری وێنەکان دەکات) سەیری ئەم وێنەیە بکە ... وێنەی تۆیە .. کاتی‌خۆی چەند قۆزبوویت .. ئەی بۆ وا درەنگ منت خواست ؟

**محمود** : ئاخر بەرلەتۆ .. ئافرەتێکم نەدۆزی‌یەوە بەدڵم بێت (هەلهەلەدەبیسترێت) سلوێ .. ڕۆژی گواستنەوەی خۆت لەیادە ؟

**سلوێ** : ئێ‌هێ‌ی .. وورده وورده .. ئەوە کۆنەکایان بەبادەکەین .. دیارە بەهاتنی میدیا زۆر شتمان بیردێتەوە .

**محمود** : بێگومان .. ئاهـ میدیا نازدارەکەم .. عیفریتەکەم .. پیری هەموو ژیانی بەفیڕۆ بردین ( هەلهەلەو گۆرانی ) ( بوکانە بووکانە بووکێ )[2] دەبیستری ) گەنجیمان لەدەست چوو .. ئەم گۆرانی‌یە چەند خۆشە .. ( دەچێتە لای پەنجەرە ) دەستە خوشکەکانی بووك هەروا پستە پستیانە لەگەڵ یەك .

**سلوێ** : ( چاویلکە لەچاودەکات ، دەچێتە لای محمود) ئەللا .. برۆ چاویلکەی خۆت بێنە برۆ

**محمود** : وەڵلاهی راستدەکەی ( بەپەلە دەچێ چاویلکە دێنی‌و دێتەوە بەر پەنجەرە) رووسووربێت .. بوکێکی ناسكو نازدارە ... ئەلێم ... « مریم » بەخۆشەویستی شوو دەکات وەنی‌یە ؟ وەك تۆ .

**سلوێ** : نازانم .. بەلام بەم دوایی‌یە .. ئاموژگاریم دەکرد .. پێم‌دەگوت نەکەی بەبێ خۆشەویستی شوبکەیت .

**محمود** : خۆشەویستی ... بنیات نانی مرۆڤایەتی‌یە .

**سلوێ** : محمود .. لەیادتە .. دەوروبەری دل گۆرینەوەمان بوو .. پێت‌ووتم .. سلوێ نەکەی خۆت لێم مارە بکەیت گەر تەواو خۆشت ناوێم .

**محمود** : چیتر گلێنەی چاوەکانم ؟ چیترم پێ‌ووتم ؟

**سلوێ** : دەتووت .. تەنیا لە خۆشەویستی‌دا بنیادەم هەست بەبوونی خۆی دەکات (پێدەکەنێ) منیش ئەم قسانەی تۆم لە کاتی کارکردن بۆ دەستەخوشکە کانم دەگێرایەوە ... زۆر رایان لێ‌بوو .. دەیان گوت .. دیارە کەوتویە داوی ئەم شاعیرە زۆرم شایی بەخۆدەهات .. (بێدەنگی .. بەجووتە سەیری زەماوەندەکەن) تەماشا ... ئەم کچە چۆن لەبەردەم بووك هەڵدەپەڕێ ... دەڵێی مارە لوول دەخواتەوە .

**محمود** : خەڵکەکە زیاتر گەرمیان‌کردوە ... ئێی‌هێی ... گووری لاویەتی .. (هەناسەیێك) گەنجی .. هێزێکی گەورەی مرۆڤایەتی‌یە .

**سلوێ** : ئها .. سەیر .. کچێکی‌تر هەڵسا .. ئەوە هەڵدەپەڕێ سوورەدا .

**محمود** : چەند بەگوورە .. کیژۆڵەیێکی ڕێكو‌پێكو خرپنە (هەناسە) گەنجی هەموو شتێکە لەژیاندا .. گەنجی هێزێکی گەورەی مرۆڤایەتی‌یە .

**سلوێ** : هەی‌های شیعرمان بۆدەڵێ ؟

**محمود** : نەخێر گیانەکەم .. ئەمە راستی‌یە ... ئەرێ .. من مریم نابێنم .. ئەمە بۆکوێ چوو ؟

**سلوێ** : کێ‌دەزانی چی‌لێ‌هات ؟ رەنگە ترسی هەبێت . ( محمود لەپەنجەرەکە دوور دەکەوێتەوە .. گۆرانیەك بەمنگەمنگ دەڵێت .. « سلوێ » ش دێتە لای ... )

**محمود** : ( خۆی گور دەکاتەوە بەژوورەکەدا دێ‌ودەچێ ... لەلای مێزەکە دەوەستێت سەیری ئەلبومەدەکات .. پاش تاوێك ) راستی ... راستی دژوارە .

**سلوێ** : بۆوادەڵێیت ؟

**محمود** : پیری .. پیری .

**سلوێ** : چی‌یەتی

**محمود** : کوشندەیە .. (هەناسە) مەرجنی‌یە دەژین (دەیگورێ) لەم وێنەیەدا .. تەنیا شوێنەکەم بەدلە .

**سلوێ** : ئەی‌تۆ ئەللا .. سەیری قامكو پەنجەکانت بکە چەند جوانە .

**محمود** : ( سەیری پەنجەکانی خۆی دەکات ) ئێستاش .. دەڵێی دارنەمامە .. بارێك .. تێ‌ناگەم .. پێش ئێستا ... کە گەنج‌بووم .. ئەم چورچو لۆچە لەکوێ خۆی حەشاردابوو .

**سلوێ** : لەژێر گۆشتت .. لەژێر تەندروستی‌یە سازە کەت .. لاویەتی .

**محمود** : راستدەکەی .. لەژێر ئەم ساڵانە بووکە لە تەمەنمان رۆیی (پێدەکەنێ) بەراستی ساڵانێکی سەیربوون .

**سلوێ** : چۆن .

**محمود** : هەرچەند ساڵێك بەرێ‌دەکەین وەك ئەم پەپولەیە واین کە لە ئاگر نزیکتر دەبێتەوە ...

**سلوێ** : سەیری ئەم وێنەیەت بکە .. بزانە چەند بە ویقاری .

**محمود** : ئا .. لێرە بەڕێوەبەری گەورەترین قوتابخانەی ئەم شاربووم .. بڕوات‌هەبێ هەرکە لە دەرگای قوتابخانە دەچـووم‌ە ژوورەوە ... قوتابیەکان زەندەقیان دەبڕا .. مامۆستاکان کڕنۆشیان بۆدەبردم زۆرجار لەناو پۆلەکاندا دەگەڕام .. قەت هیلاك نەدەبووم ... تێبینم لەسەر مامۆستاکان تۆماردەکرد .. ئێی‌هێی ... راستدەکەی ئەوکات زۆر بە ویقار بووم .. (کۆخە

دەیگرێت هەناسەبڕکێ دەبێت .. بەلادادێت ..
خەریکە بەر بێتەوە سلوێ بەهانای دێت : ..
بێدەنگی ) ئای راستی ... چەند دژواری .

**سلوێ** : چیتر گیانەکەم ؟

**محمود** : منەتم بەهیچیان نەبوو .. چونکە بڕوام بەخۆم زۆربوو .. ئەرکی سەرشانی خۆم بەو پەڕی دڵسۆزی هەڵدەسوڕاند .. (کۆخە) ئاهـ چۆن کۆخەیێکی ووشکە .. وا هەستدەکەم دەستێك دەمخنکێنی .. دڵم دەلەرزێ .. سلوێ من نە لە پیریی نە لە راستی .. لەهیچیان ناترسم .

**سلوێ** : دەزانم .. ئازیزەکەم ـ چاك دەزانم .

**محمود** : هەندێجار کە برادەرەکانم دەبینم .. لێم دەپرسن : خواردنت چۆنە ؟. هەنوکەش برنجی دەخۆی ؟. لەگەڵ گۆشت خواردن لەچیای ؟.. نەخۆشی شەکرەت نی یە ؟ پشتت ژان ناکا ؟ .. دەڵێن ئێمە کە پەتاتە دەخۆین توشی دڵە کزە دەبین .. لە چاوەکانم دەپرسن .. ئایا سێژەمە شەراب دەخۆمەوە ؟

**سلوێ** : ( هەڵهەڵە دەبیستری ) ئازیزەکەم .. سەیری ئەم وێنەیە بکە .. ئەرێ میدیا لەم وێنە لە چ پۆلێکا بوو .

**محمود** : ئاهـ .. سلوێ .. پیریو سەد عەیب ( سەیرێکی ـ وێنەکەدەکات ـ لەژوورەکەدا دێودەچێ ) ئێستا ئەم ساڵە دوورودرێژانە وەك خەیاڵ وایە لەبەر چاوم .. بنیادەم تەنیا بەهەست پیردەبێت ئەگینا پیری نی یە .

**سلوێ** : راستدەکەی .

**محمود** : ( دەگەڕێتەوە لای ئەلبومەکە .. لاپەرەکانی هەڵدەداتەوە ) سەیرکە ... میدیا لەم تەمەنەیدا خوی بەچی گرتبوو دەزانی .

**سلوێ** : (پێدەکەنێ) لەهەوەنتە دەگریا ... جلی لەبەر نەدەکرد .. رکەی دەگرت هێلکەورونی نەدەخوارد دەیگوت وەڵلا داوای هێلکەی کولاوم کردوە .

**محمود** : وایە .. رەنگە ئەم شتانە رووی‌دابێت ... هەستی ئافرەت تیژترە ... بە پیری نی یە .. سلوێ .. بەراستی ئافرەتێکی چالاكو بزێوو سەرکەش بوویت ... ئای کە هیلاك بوویت .

**سلوێ** : ئای کە بەختەوەرییە بنیادەم هەستبکات کە ئەرکی سەرشانی بە دڵسۆزی بەرێوەبردوە ... ویژدان دەحەسێتەوە .

**محمود** : (جگەرەیێك دادەگیرسێنێ) قسەکانت جوانن (لێی نزیك دەبێتەوە ـ نیوچەوانی ماچ دەکات) قسەکانت جوانن ( سەیرێکی ئەلبوم دەکاتەوە ) هەر وێنەو یادگارە مرۆڤ وون‌ناکات (وێنەیێکی پێشان دەدات) سەیری چاوەکانی‌بکە .. چەند جوانە .. روخساری ... لە رووخساری را دیارە بنیادەمێکی بێ دەخلە .. دەزانی جیهان بەبێ منداڵ ئاشێکی ئاو لێبراوە .. دۆزەخی سەر زەمنیە .

**سلوێ** : ( ئەلبومەکە دادەخات ) هەست دەکەم ئیمرۆ زۆر بەختیاری .. ئەوە میدیا پاش ماوەیێکی‌تر دەگاتە لامان .. حەزدەکەم شتێکت پێشان‌بدەم ... (دەڕوا) .

**محمود** : ( دووکەڵی جگەرە بەبادەداو لە ژوورەکە هاتوچۆ دەکا .. سەرێك بۆ رۆژمێرەکەخواردەکاتەوە ... دێودەچێ .. ) گەر وازەینم کوێر نەدەبوو . یادگاری خۆشم بەبیردەهاتەوە (پێدەکەنێ) مەحاڵە بێگومان .. بەلام .. وەك هەر زیندەوارێك منیش ژیاوم .. نەم‌دەتوانی لەکاتو رۆژو مانگو ساڵ رابکەم ئاهـ ... ئەدی بۆ زەینم پەلم ناگرێتو یەکەیەکەی یادگارەکانم پێشان‌دات .. ( پێدەکەنی .. گاڵتەبە قسەکانی خۆیدەکات ... سلوێ دەگەرێتەوە لای ... محمود لەسەر پێکەنین بەردەوامە ) .

**سلوێ** : محمود .. ئەمە بە چ پێدەکەنی

**محمود** : هەولمدا یادگارەکانم بێنمەوەیاد

**سلوێ** : هیچت هاتەوە یاد ؟

**محمود** : هیچ

**سلوێ** : هیچ ؟

**محمود** : سلوێ .. من وای بۆ دەچم .. بنیادەم لەپیری‌دا پتر وڕێنەو خەیاڵ دەکات .

(سلوێ خەریکی کیسەیە بە دەستی‌یەوە گرتوە)

**سلوێ** : محمود .. محمود .. دەزانی کاتی قسەی ناو پەرتوك دەکەیت .. هیچ شتێك لەگەڵت سوودی نی یە ..

**محمود** : هەرخۆم دەزانم لە گەنجیدا خەیاڵم چەند بەگوڕ بوو .

**سلوێ** : محمود .. شتێك هــەیە ... پێشــانت ئەدەم بزانم هەڵی دێنی

**محمود** : ئامادەم .. هەرچەند دەزانم زەینیشم کوێر بووە .

**سلوێ** : گوێبگرە .. بەرای تۆ دەبێ چ لەنــاو ئەم کیسەیەدا هەبێت ؟

**محمود** : نازانم .. ها .. باشە کۆتری تێدایە .

**سلوێ** : توخوا ئەگەر بیکەیتە گاڵتە

**محمود** : وەڵلاهی سەیرە ... بروسکەیەك لە چەند ووشەیەك پتــر نی‌یە .. ئــاوا فــرمێســك‌و شــادی گێــرایــەوە شادەماری خوێنمان .. ( سەیری‌دەکا) دایکایەتی .

**سلوێ** : چۆنە ؟

**محمود** : خۆشی‌و بوونێکی بەردەوامە .

**سلوێ** : سەوزایی‌یە .. بەختەوەریی‌یە .. (بێ‌دەنگی) دەپێم بڵێ چی لەناو ئەم کیسەیەدا هەیە ؟

**محمود** : خەونی تێدایە !

**سلوێ** : خەون ؟! )پێدەکەنێ) مەیکە بەگاڵتە تکایە هەڵێنە .

**محمود** : ( سەیــری کیسەکــە دەکا) تــۆ ئەمــەنــدە بــەرزیت ، گشت کــات هــەوڵی خــۆشی‌من ئەدەیت .. قەت بــڕواناکــەم بزەوخــەنــدە لەسەر لێوت بتۆرێ .

**سلوێ** : دیسان ... ئەمە شیعرە .

**محمود** : (لێی دەچێتە پێش بە سۆزەوە ماچی‌دەکات) نەخێر ووشەی خۆشەویستی‌یە .

**سلوێ** : ســوپاس .. محمــود .. دەزانی خەڵکی ، ئــەوانەی دەماننناسن حەسودیمان پێ‌دەبەن .. هــەموو دەڵێن ئەم دوو بنیادەمە بۆیەك دەژین .. سەیریان دێت کەتا ئەم تەمەنە لێك بێزار نەبووینە .

**محمود** : چۆن دەتــوانم لێت بێزاربم .. تــۆ هەرگیــز مایــەی بەختەوەری من بووی .

**سلوێ** : هــەردووکمان بــەجووتــە ... بــەردەوام بیــرمــان لە دڵسۆزی کردوتەوە .

**محمود** : باوەڕناکەم قەت درۆمان لەگەڵ یەك کردبێت .

**سلوێ** : رەنگە درۆی سپیمان کردبێت .. لەپێناو بەرژەوەندی .

**محمود** : بۆیێ .. هەبێنیش شەرمەزاری دایدەگرتین .

**سلوێ** : مردن نەك درۆ .. هەروامان بیردەکردەوە .

**محمود** : لەبەرئەمە بەرامبەر بە ئەرکی سەرشانمــان دڵسۆز بووین .. هەتا خانەنشین‌بوورین

**سلوێ** : لە هەموو کــارێکا دڵســۆز (بێ‌دەنگی) دەیەڵلا دەی هەنوکە پێم‌بڵێ چی لەناو ئەم کیسەیەدا هەیە ؟

**محمود** : (بە زەردەخەنەوە) .. زانیم

**سلوێ** : باوەڕ ناکەم .

**محمود** : (پێدەکەنێ) بولبولی تێدایە .. (بێ‌دەنگی) نا نا ژوژگی تێدایە .

**سلوێ** : تکات‌لێ دەکەم بێ گاڵتە .

**محمود** : ئا .. ئەندیمۆنی تێدایە .

**سلوێ** : ئەندیمۆن ؟ ئەندیمون چی‌یە ؟!

**محمود** : ئەندیمۆن .. لە چیرۆکە یۆنانی‌یــەکان .. رەمــزە بۆ جوانی‌و پاڵەوانیەتی نەمرەکان .

**سلوێ** : محمود .. تکادەکەم .. ئێ دەبزانە چ لەم کیسەیەدا هەیە .

**محمود** : (لێی نزیك‌دەبێتەوە ، هەوڵ دەدات کیسەکە بفرێنی .. سلوی لەبــەردەستی رادەکــات .. ئیــدی یــەکتــری راودەنێن .. تا لەدواییدا کیســەکە وەردەگــرێت .. دەستی دەخاتە ناو کیسەکە جووتێ پێڵاوی منداڵان دەردێنێ) نەمووت .. ئەندیمــۆنی تیایــە .. دەمزانی یادگارێکی تیایە .. سلوی بیرتە .

**سلوێ** : چی ؟

**محمود** : ئەمە .. یەکەمین جووتە پێلاوە بۆ میدیامان کری .

**سلوێ** : راستە .

**محمود** : ئەوکاتە زۆر بەختەوەر بووین .. بە رادەیەك لێی بێزار بووین (جولانەوەیێکی بێدەنگ چۆك دادەداتــەوە .. لەسەر لەپی دەست دەڕوات)

**سلوێ** : (پێدەکەنی) بەم شێوە .. میــدیا لەســەر پشتت ئەم ماڵەتان گێرە دەکرد .. ئاهـ ئاهـ .. راستە زەمانێك لە بەختەوەری بێــزار ببووین .. زۆر جــاران ئەوەنــدە پێدەکەنین میدیا لەترسان دەگریاو هاواری دەکرد .

**محمود** : (هەناسەیێك) ئای کە بەختەوەر بووین .

**سلوێ** : رۆژ بە رۆژ .. ژیانمان خۆشتر دەبوو .

**محمود** : (بە دەنگێکی نزم) ئێستاش رۆژ بە رۆژ ژیانمان پتر ناخۆش دەبێت .

**سلوێ** : ژیان ئاوایە ( هەراوهۆریای مندالان و هەلهەلە لێدان تێکەل دەبن ) مندال .. لەشین و شایی بەزمی خۆیان هەردەکەن ( لەبەر پەنجەرەکەوە بانگدەکا ) محمود وەرە ... ئەوە مریمی سوراوسپیاو دەکەن ... ئەللا .. چەند شەرمنە .

**محمود** : (دەچێتە لای) تەماشای ئەم هەموو منداڵەی وەك پەپولە بلاوبوونەتەوە .. دەبی مریم لە نۆزدە سالان پتربی .. تۆ سەیرکە چەند ناسك لەبەر دەستی ئەم ئافرەتە رووهەلگرە دانیشتوە .. ئەللا .

**سلوێ** : پرچی درێژە .. رەش دەلێی چاوی مارییە .

**محمود** : زۆر جوانـە زۆر ... هەردایـنـێن و گۆرانی شـاعـیر بەسەریدا هەربلێ .

**سلوێ** : محمود .. دەزانی مریم دەست و پێمان بوو .. چمـان بوویستبا فرچکێکی لێ دەدا بۆی دەکرین .

**محمود** : تەماشای دەستە خوشکەکانی بکە .. ئەری ئەوێ هێ کچەکەی شاکرە فەندی نییە .

**سلوێ** : بەلێ .. خۆیەتی .

**محمود** : ئەمیش گەورە بووە .. شەیتانی ئەم گەرەکە بوو .. هەموو لێی دەترسان .

**سلوێ** : ئێستا هەندێك لەم کچانە .. دەلێن خۆزگە ئێمەباین لە جێگای مریم .

**محمود** : ئا .. سـەیرکـە .. ئەوە منـداڵەکان کـردیـانـەوە گەرەلاوژەئای کە هاروبەتەرن (لەبەر پەنجەرەکە لادەچی )

**سلوێ** : (ئەمیش لادەچێ) محمود .. ئـەرێ میدیـا هەرکـە دەسالان بوو چمان پێ دەگووت .

**محمود** : (جگارەیێك دادەگیرسێنێ) جـا من بلێم چی .. ئەم عیفریتە خۆ بەتەنیا ناوێکی نەبوو

**سلوێ** : دەزانم .. بەلام لە دە سالان .. ناوێکی گەلێك خۆشمان لێنابوو

**محمود** : (پێدەکەنێ) ئا دەزانم .. ناومان لێنابوو سوورەگولی باغان (پێدەکەنن و ئەم ـ ناوە ـ دەلێنەوە)

**سلوێ** : من لەم ژوور بۆ ئەو ژوور سەراودوم دەنا .. ئەمیش دەیزروکاند .. تۆش وەك هینـدە سورەکـان هاوارت دەکرد .. (لاسایی) سـوورەگولی بـاغان (بێدەنگی) قەت بروناکەم .. تۆو پیرییان نەوتوە .. تۆ دەبێ لە « 90 » سال پتر بژی .. ئەدی ئەوەنییە ئێستاش بە. فەلسەفـەو قسەی نـەستەق دەمـان‌دوێنی .. زارو زمان و دلە چاکەکەت هەرماوەو نەگۆراوە .، ( دەچێتە لای ... سەری دەخاتە سەر سینگی ) باشترین دل لە ژیانمدا شارەزای‌بووم .. بروسکەی سوورەگولی باغان زیندوی کردینەوە .

**محمود** : ( دەست بەسەر سلوی دادێنی ) سلوێ .. وەرە با زەیینمان تاقی‌بکەینەوە ... باشە .. پاش سوورەگولی باغان .. چ ناوێکمان نا بیرتە .

**سلوێ** : (بیردەکاتەوە) نازانم .

**محمود** : (بەبانتومایم ... هەردوو دەستی بۆ پێشەوە دەبات و چاوی دەنووقێنێ .. جارێك بۆ چەپ و جارێکی‌تر بۆ راست وەردەسورێ پاشان دەوەستی ) سالێك پتر هەرکە دەنووست بەشەو ئەمە وەزعی بوو .

**سلوێ** : ها .. ئائائا .. راست‌دەکەی ... چمان پێ‌دەگووت ؟

**محمود** پێمان‌دەگوت ... خەوارێ ؛

**سلوێ** : ئـا ئە ... خـەوارێ .. روحەکـەم میدیـا .. دەزانی رۆیشتنەکەی هەر لەتۆ دەکا .. محمود کاتی خۆی کە یەکتریمان ناسی زۆر لەرۆیشتنە سەربـازی‌یە کـەت دەترسام ... نیوچەوانیشت هەموو دەمگـرژ بوو .. مۆن و ئالۆز دیاربووی .. یەکجار بروات بەخۆت هەبوو ( ئەلبومەکە دەکاتەوە ) سەیری ئەم وێنەیە .. لەگەل هاورێ مامۆستاکانت گرتوتە .. بزانە ئـەمان چـەند رێك‌وپێك‌و کەیف خۆش وەستاون .. تەنیا تۆ گـرژو مۆنێ دیاری .. (بێ دەنگی) محمود .. ئەم مامۆستایە ناوی چ بوو .. ئا ئەمە .. ئەمە .. جارجارە مێوانداری دەکردین .. هەولی نووسینی رۆمانی ئەدا .

**محمود** : ئای کە دلێکی چاك‌و بەوەفای هەبوو .. پەرێکی سپی‌و بێ گەرد بوو .. ئێ‌ی هێ‌ی کاکە ماجد ... (هەناسە) شورشگێرێکی رەسەن‌بوو .. سەرتاپای ژیانی لەنێوان چـوار دیواری بـەندیخـانـە بـردە سـەر .. سلوی دەزانی .. تا ئێستا برادەرێکی وەك ئەمم نـەدیتەوە

هەتا بلّێی راستگۆو دلسۆزو پاك بوو .. ئای هەی ڕۆژگار .. بەردیش دەتاوێنێتەوە ئەم فێریکردم تام لە ژیان وەرگرم .. دەیگوت پێویستە مرۆڤ دوورکەوێتەوە لە سۆز .. ئەو فێرە ژیانی کردم .

**سلوێ** : (باسەکە دەگۆڕێ) میدیا بە بروسکە کەم ووشەکانی ئەم هەموو کۆنە بریناەی هەڵوەشاندینەوە .

**محمود** : (پێدەکەنێ) چۆن وادەڵێی ... بەمەندە ووشەیە بزەی خستەوە سەر لێومان .

**سلوێ** : (بە خۆشی یەوە) ئاخر ئەم هەموو خۆشی یە ، وامان لێدەکات بیر لە رابردو بکەنیەوە .

**محمود** : بروسکەیێکی بچوك .. روناکی خستە سەر رابردومان کە هەرگیز بەیادمان نەدەهاتەوە .

**سلوێ** : بروسکەیێك .. هێمنی و هێوری خستە گیانمان

**محمود** : خۆشەویستی راستەقینە .. بەگوورە

**سلوێ** : پێویستە شتێك بکەین ... با ئاهەنگ بگێڕین ؟!

**محمود** : تۆ خواردەمەنی خۆش و بە لەزەت ئامادەبکە

**سلوێ** : نا نا ... با بەخۆی بێت .. حەز لەچ دەکا ئامادەی بکات ..

**محمود** : هێزو توانای دایە بەر پیری زەمانە

**سلوێ** : دێت و چەند رۆژێك لێرە لەگەڵماندا دەژی جا وا هەست دەکەین جاری جارانە .

**محمود** : ئێستا من وادەزانم زۆر زۆر بەهێزم .

**سلوێ** : ئاهـ با سەرلەنوێ بیربکەینەوە ـ هەندێ نهێنی ئاشکرا بکەین .

**محمود** : ئەو خانوانەم دێتەوە یاد کە تیایاندا ژیاوین وەکو قەرەج لەم خانو بۆ ئەو خانو بارمان دەکرد .

**سلوێ** : زەینی میدیا روونە ... بێت زۆر شتی پێ دەگێڕینەوە .

**محمود** : حەتمەن .. سلوێ لەیادتە هەرکە ماڵمان لە « قەلات »ی بوو ... بنیادەمی بێ دەخلی تیا دەژیا .. ئاهـ ئای کە ژیانێکی خۆشمان لەوێ بردەسەر .

**سلوێ** : میدیا بێتەوە بە دەنگە خۆشەکەی ئەو گۆرانییە میللییانەمان بۆ دەڵێ .. ئەرێ تۆ هیچیانت لەبەر نەکردووە .

**محمود** : نەوەڵلا .

**سلوێ** : (ئەم گۆرانییە بە هێمنی دەچڕێ )

**« گەوهەرێ ، گیان گەوهەرێ**
**سینگت حەوزی کەوسەرێ**
**خۆشتر لە ئاوی زمزم**
**حەجاجی دەچنە سەرێ »**

( بە دەنگ پێدەکەنێ) تۆ ئەم گۆرانییەت زۆر پێ خۆش بوو .

**محمود** : بەڵێ راستدەکەی .. ئەم گۆرانیەشم زۆر بە دڵبوو (گۆرانی دەڵێت) :

**« لەنێو سابلاخدا بورجێك دیارە**
**بەقەد ئەو بورجە خەم لە دلم بارە**
**لەبێ لوتفی یار ، هەناسەم سوارە »**

( بێ دەنگی ) ئای کە ئەم گۆرانیانە ناسکن .. بەتایبەتی شەوان هەرکە دەمبیست وامدەزانی دونیا هەمووی هی منە .

**سلوێ** : خوایە گیان .. میدیا هەرنەگەیشت

**محمود** : بێت ، بەختیارمان دەکاتەوە .. سلوێ گیان

**سلوێ** : بەڵێ

**محمود** : خۆت ئاگاداری .. بیست ساڵ زیاترە دەمم لە شەراب نەداوە .. ئێستاش ئەو شوشە شەرابەی جیرانەکەمان پێشکەشی کردم ... کە بەیەکەوە لەگەرەکی ئەلماس بووین ... شەرابەکە هەرماوە .. ئەو رۆژە زۆر خەمبار بووم دامگرت تا پێکێکی لێبخۆمەوە .. بەلام زوو پەشیمان بوومەوە .. بردمەوە ناو شوشەکانی ترو دامناوە شوێنی خۆی .

**سلوێ** : نەتخواردەوە ؟

**محمود** : نەخێر .

**سلوێ** : بۆ نەتخواردەوە .

**محمود** : زۆر جار خەم ئەقل و گیانیش لاوازدەکات ... زۆرجار بنیادەم پێویستی بەتاڵی هەیە ... سلوێ تۆ برۆ خواردەمەنی بەلەزەت بۆ میدیا ئامادەبکە منیش دەچم شوشە شەرابەکەم دێنم ... نەختی سەرم گەرمدەکەم ... شەرابەکەم کۆنیش بووە .. (سلوێ دەڕوا)

( محمــود وون‌ده‌بێت‌و پـاشــان ده‌گـه‌ڕێتــه‌وه شوشه‌یێکی پڕی به ده‌ستـه‌وه‌یه‌و پـه‌رداخێك پـڕ ده‌كات )

**محمود** : بابچمه باخچه له‌وێ خواردنه‌وه خۆشه (بانگده‌كات) سلوێ .. من له باخچه‌م .. گه‌ر ئاره‌زووت‌كرد تامێكی شه‌رابه‌كه بكه ...

**ده‌نگی سلوێ** : باشه باش .

**محمود** : له‌لایه‌ك به‌هاره .. له‌لایێكیش میدیای تاقانه‌م ده‌بینم ... سه‌ره‌رای ئه‌م شه‌رابه كۆنه‌و سه‌یری گوڵ‌و په‌پوله ره‌نگاوره‌نگه‌كـان .. (سه‌یـرێكی پێكه‌كـه‌ی ده‌كات) په‌حا .. هێنده كۆنه هه‌رده‌ڵێی خوێنه . (ده‌رده‌چی) .. (ده‌نگی هه‌لهه‌له‌و هۆرنی ئۆتۆمبیل ده‌بیسترێ له‌گه‌ڵ چـه‌پڵه ریـزه‌و هـات‌وهـاواری منـدالان ... سلوی ده‌رده‌كـه‌وێ په‌رداخێكی له‌ده‌ستـه پـڕی ده‌كـا له شه‌رابه‌كه .. به‌یه‌ك قووم هه‌مووی هه‌ڵده‌قوڕێنی )

**سلوێ** : په‌حاح .. شه‌رابه كۆن ... چه‌شنی ژه‌هـره (ده‌نگه ده‌نگی ده‌ره‌وه ده‌بیستێ .. ده‌چێته به‌ر په‌نجه‌ره ) مـریه‌میشیـان بـرد .. خـوای له‌گـه‌ل .. هیـوادارم بـه‌ختیـاربێت .. (ده‌رده‌چی ... تـاریكی چـه‌نـد چـركه‌یـه‌ك ... پاشـان روونـاكی ده‌گـه‌ڕێتـه‌وه .. مه‌به‌ست به سه‌رچوونی ماوه‌یه سلوێ شڵه‌ژاوه ژانی گـوتوه .. هـه‌ست به ڕشـانـه‌وه ده‌كـات .. هـات‌و هاواریه‌تی به ده‌نگێكی خنكاو ) محمود .. محمود .... ( بـه‌رده‌بێتـه‌وه .. ، گـه‌وزده‌دات وه‌ك مـریشكی سـه‌ربـڕاو ...... ده‌قـیـژێـنـی ) محمود .. محمود .. خنكام .. چاوم ره‌شكه‌وپێشكه ده‌كات .. سه‌رم‌ده‌سوڕێ .. ئای .. ده‌وه‌ره .. زوو وه‌ره بمگه‌یێ .. بگه‌فریام .. ئای .. ( به زه‌حمه‌ت هه‌ڵده‌ستێنه‌وه دووباره به‌رده‌بێته‌وه .. وورده وورده گیانی ده‌رده‌چێت )

**محمود** : ( به ده‌نگێكی خنكاو ) سلوی .. سل .. وێ .. ( له‌به‌ر ده‌رگـا به‌رده‌بێتـه‌وه .. ده‌ناڵێنێ .. بـه‌ره‌و شوشـه شه‌رابه له‌سه‌ر سك ده‌ڕوات .. ) ئای كه بێ ئـه‌قلم ( سـه‌یرێكی شـوشه‌كـه ده‌كـات بـه‌رده‌بێتـه‌وه .. بـه‌ئـازاره‌وه هـاوارده‌كـات ) سلوێ .... له‌كـوێ‌ی .. كوا هێـزو توانـام .. خوا گیان .. ئه‌م ژانه چی‌یه له‌ناو هه‌ناوم هه‌ناوم .. ئه‌ی هـاوار ... ( وه‌ك مـریـشـكـی سـه‌ربـڕاو گـه‌وزده‌دات .. خـۆی ده‌گـه‌یـنـێـتـه لای سلوێ ... سه‌ری به‌رزده‌كاته‌وه ) سلوێ .. ده‌زانی چیم‌كرد ؟ شوشه ژه‌هری مێـروله‌م هێناوه .. ئـه‌ی خوایه .. چۆن هه‌ڵه‌یه‌كه من‌كردم .. نازانم بۆ شوشه شه‌رابه‌كه تێكه‌ڵی ئه‌م شوشه ژه‌هرانه ببوو .. سلوێ .. یه‌ك په‌رادخی پراوپرم له‌م ژه‌هره خواردوته‌وه ... (هاوارێكی به‌رز ده‌كات به‌رده‌بێته‌وه ) .... سلوێ ئه‌م ژه‌هره زۆر كوشنده‌یه سلوێ .. پێویسته شتێك بكه‌م .. ( به‌رده‌بێته‌وه ... له‌سه‌ره‌خۆ گیـانی ده‌رده‌چێ ) . ( روونـاكی كزده‌بێت ... بـۆماوه‌یـه‌ك پاشـان وه‌ك جارانی لێدێته‌وه مه‌به‌ست به‌سه‌رچوونی ماوه‌یـه . زه‌نگی ده‌رگا ده‌بیسترێت .. میدیا به ده‌نگێكی به‌رز بانگ دكات ) .

**ده‌نگی میدیا** ] : بابه ... دایه .... بابه .. دایه

( له‌سه‌ر بانگ‌كردن به‌رده‌وام ده‌بێت )
- په‌رده داده‌خرێت -

**ته‌واو**

1 — ئه‌ڵماس : گه‌ره‌كێكه له شاری كه‌ركوك .
2 — بوكانه بووكانه بووكێ : گۆرانی بووك‌گواستنه‌وه‌یه .. به‌تایبه‌تی له‌ناوچه‌ی هه‌ولێر .
3 — خه‌واری : به‌م كه‌سه ده‌ڵێن كه له‌كاتی نووستن‌دا بڕوات
4 — قه‌ڵات : مه‌به‌ست له قه‌ڵاته دێرینه‌كه‌ی شاری كه‌ركوكه .
5 — ئه‌م كۆپله‌یه‌و ئه‌وه‌كه‌ی تریش له گۆرانی‌یه‌كانی ـ حه‌سه‌ن زیره‌كی ـ ئه‌مر وه‌رگیراوه .

تێبینی :
ئه‌م شانۆگه‌ری‌یه له ژماره — 6 — سالی ، 1980 ، ی گۆقاری ـ الاقلام ـ ی ژماره تایبه‌ت به ـ شانۆ ـ بلاوكراوه‌ته‌وه .

# کاروانی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر ٧

•

ئامادەکردنی : شوان

•

- هونەرمەندی کورد « اندریوس اسرائیل خمو » باکوری

•

دەنگو ئاوازێکی بەسۆز ، دەستو پەنجەیەکی بە برشتو ڕەنگینو هونەرمەندانە .... ئەو دەنگەی لە ئاوازەکەی تێر نابیت بەڵام ئێستا خۆی لێمان نامۆ کردوە .. یان ڕاست بلێم بە زیزی نامۆ کراوە .

ئاخۆ شەیداو عاشقی دەنگو ئاوازی کۆنی ڕەسەنی کوردی باکوری لەیادکردوە یان پەرەپێدانی ڕەورەوەی پێشکەوتنی مێژوو فەرامۆشی کردوە ؟ .. ئەو پرسیارەو چەندین خولیای تر لە زمان حاڵی خودی باکوریەوە دەبیستین ..

لەجێی خۆیەتی کەهیچ نەبێو دەمەنا دەمێ ئاورێك بەلای ئەم ئەدیب یان ئەو هونەرمەندا دەدرێتەوە .. بۆیە ڕۆژی 1983/10/24 بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری لەهەولێر کۆڕێکی خنجیلانەی بۆ هونەرمەند باکوری سازکردو ماموستا وریا ئەحمەد کۆڕەکەی بەڕێوەبرد .

**( بیرەوەری هونەری هونەرمەند )**

هونەرمەند « اندریوس اسرائیل خمو » باکوری لەبریتی باسی تایبەتیو هەڵدانی ناونیشانی یەکسەر چووە دنیای هونەری خودی خۆی کرد کەچۆن شەیدای سازو ئاوازی ئاڵەتی موسیقایی بوو .. لەم ڕووەوە ، بیرەوەریی سەردەمی منالی گێڕایەوە ، بەوەی کاتێ لە شاری کۆیە دەبێتو لە تەمەنێکی کەمی منالیدا دەبێت کە دراوسێیەکیان دەبێتو بەڕێکەوت هەردەمەنا دەمێ پیاوێکی پیری کرمانجی دێت بەمیوانیانو لەتەك گێڕانەوەی چیرۆکەکانی ( مەمو زین ) و (لاسو خەزاڵ) دا بەدەستو پەنجە باریکەکانی فوویەك بەگەرووی شمشاڵە ئاسنینەکەیدا دەکات .. ئیدی لەو ساتەوە هۆگری شمشاڵو ئاڵەتەکانی دی موسیقا دەبێتو ئەو خولیایە هەراسان بەکاسەی سەری هەڵدەگرن بۆیە ئیدی دەبێتە هاوڕێی شمشاڵێکی ئاسنین .

هەردوای برینی ئەو تەمەنەی ، بەشداری چالاکی هونەری پلەکانی خوێندنی قوتابخانەکەی دەکات ... باکوری تەنیا خۆی بە قەرزارباری ئەو پیرەمێردە کوردە کرمانجیە نازانی ، بەڵکو بەشانازییەوە ڕووی دەمی دەکاتە (دکتۆر محمود سامی حافظ) کە دکتورای لە موسیقادا هەبووەو فێری نۆتەکانی موسیقای کردووە لەشاری کەرکوك .. دیسان باسی ماموستا جورج الخيالي دەکات کە لەساڵی 1952 دا سەرۆکی تیپی موسیقا بووە لە شاری کەرکوك .

**(قوتابیەکی هونەرمەند)**

باکوری سەرەڕای ئەوەی قوتابی بووە لە [ دار المعلمين العالی ]



ەشاری بەغا ، ڕاستەوخۆ بەشداری چالاکی‌یە هونەریەکانی ێستگەی کوردی لەبەغا کردوەو هاوبەشی ئاهەنگەکانی کولێژی ەندازیاری‌و کولیژەکانی دی زانکۆی بەغدای کردوەو شان ـەشانی تـەواوکردنی کـولێژەکـەی خۆی بـەردەوام لەگـەڵ هونەری گۆرانی‌و موسیقادا ژیاوە .

**[ گـۆرانی بیژێکی هـونەرمـەند یـان هـونـەرمـەنـدیکی ئاوازدانەر ]**

باکوری لەکۆڕەکەیدا زۆر بە هێمنی‌و قوڵی ئەو لایەنەی ڕۆشن کردەوە کە زۆربەی گۆرانیەکانی لە ئاوازی خۆیـەتی‌و تەنیا دوو ئاوازی بەگۆرانی لەلایەن هونەرمەندانی دیوەوتراون

یەکەمیان : ئاوازێکی بۆ گوڵبەهار داناوە .

دووەمیان : ئاوازی شیعری ( ئەی‌گـوڵ ئەتبینم لەبـاخچەی ڕەنگینی ) بۆ عەباس محەمەد ئەمین داناوە .

**[ یادێکی شیرین‌و گۆرانی « ئەری لەیلێ » ]**

یـادو بیرەوەری پیـرۆزو شکۆدار هـەرگیز فـەرامـۆش ناکرێت‌و هەمیشە ویردی سەر زمانە ، بۆیە باکوری هونەرمەند بۆ چەند جارێك ئەوەی دووپات کردەوە : کـە بۆ یـەکەمجـار گۆرانی ئەری لەیلێ بەدەنگی خۆی لە ئێستگە تۆمار کراوەو دوا بەدوای ئەوە بەسێ قوڵی [ خۆی‌و شەمـاڵ صائب‌و نـەسرین شیروان ] تۆماریان کـردوە ، تا بـۆ دواجار لە سـاڵی 1956 دا هونەرمەند شەماڵ صـائب بە تـەنیا لەسـەر قەوان تـۆماری دەکات‌و بلاو دەبێتەوە .

**( باکوری‌و تیپی باواجی کۆیە )**

تیپی مـوسیقـای بـاواجی کـۆیـە ، یـەکێکـە لەو تیپـە هونەریانەی خاوەنی دەنگ‌و ڕەنگی خۆیەتی‌و شوێنێکی شیاوی لەژیانی هونەری گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی پێبراوە ... دیارە تیپێکی ئاوا ڕێك‌وپێك لەخۆوە سەرهەڵنادات .... لەم ڕووەوە ، هونەرمەند باکوری دوا : [ یەکەمجار کە دامەزرام ، بووم بە مامۆستای ناوەندی کۆیە ، دوای ئەوەی ماوەیەك تیپەری ، بیرم لە چالاکی هونەری‌و ئاهەنگ سازکردن دەکردەوە ، تا ڕۆژێـك ئاگاداری بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمم کرد کە ماموستا شەفیق صابیربوو ، بەوەی نیازی ئەوەمان هەیە ئاهەنگێك بۆ قوتابی‌و مامۆستـایانی قـوتابخـانەکـەمان سـاز بکەین‌و ڕەزامـەندی نیشاندا ، ئاهەنگ سازکراو لای هەمووان پەسند کرا ... ئەمە بووە هۆیەکی هاندەرو پاڵپشتێکی بەهێز لە پێکهێنانی تیپێکی هونەری‌و موسیقی بکەین ... تا ئەو ئاواتەمان بە پشتیـوانی لاوان‌و دلسۆزانی شاری کۆیە هاتە دی .. گەڕاین بۆ ئـەوەی ناوێکی خۆشی بۆ بدۆزینەوە ، لەسەرەتادا ، ناوی تیپی مۆسیقای قوتابخانەی کۆیەمـان لێنا ، بـەڵام کەسـەیر دەکـەین ئەمـە مەودایەکی تەسکەو لاوانی دی ناتوانن بەشداری تێدا بکەن ئەوسا ناوی تیپی هەیبەت سولتانمان لێنا ، ئەمە شیان ناوێکی دوورو درێژبوو ، تا لەدوایدا ناوی (باواجیم) بەلاوە پەسندبوو . هەر لەو دەمەدا ماموستا (نشأت) کە بەڕێوەبەری پەروەردەی شاری هەولێـربوو کـۆمەکی لەگـەڵدا کردین‌و چـەند پـارچە ئالەتێکی مۆسیقای پێشکەش بە تیپی قوتابخانەکەمان کرد ] .

هەروەها باسی چەند هونـەرمەنـدێکی کرد کـە لەتیپی بـاواجی کۆیـەدا ڕۆڵی گرنـگ‌و دیاریـان هەبـووە ، لەوانـە : مامۆستایان ( سەرداری ظاهرو ئەنوەر طاهر ) .

**( چالاکی هونەری‌و پاراستنی دەنگ‌و ئاوازی ڕەسەنی کوردی )**

هونەرمەند باکوری یەکجار بەوردی لە ژیانی هـونەری خـۆی دواو گەلێ لایـەنی شاراوەی ئـاشکرا کـرد ، بەوەی : سەرەڕای بەشداری لەتێکرای چالاکی‌یە هونەریەکانی پلەکانی خوێندنی قوتابێتیدا ، هاوبەشێکی گورج‌و گوڵی تیپی ئێستگەی بەشی کوردی بووە لەبەغداو بەشانازی‌یەوە باسی بەشداری ئەو

ئاهەنگانەی کرد کە لەساڵی 1960 بۆ ئەندامانی کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە سازکرا .

هەروەها باسی گرنگی بەشداربوونی چالاکی هونەری کرد کە چۆن مرۆڤ بە ئەرکی سەرشانی هەڵدەسێ و لەو دەلاقەیەوە خزمەتی کە لە تووری نەتەوەی دەکریٚ و بە پوختی دەپارێزری ، بەنموونە ئەو هەوڵ و تەقەلایەی خستەروو کە چۆن دەنگ و ئاوازی [ سێوە ، مەلا ئەسعەدی کۆیەو حەمەدەمینی عەباس ] لەساڵی 1957 تۆمارکراوە پارێزراوە .

## ( بەجیٚهێنانی ئەرك یان داواو پارانەوە )

مەلا نەجمەدین وتەنی : [ با ئیدی بەس حازرکوژی مردو پەرست بین ] با لایەکی دڵسوزانە بەلای ئەو مرۆڤە هونەرمەندو شارەزاو لێهاتوو بەهرەوەرانەدا بکەینەوە . دەستگیرویان بکەین ، ریٚزیان لیٚبگیرن و بە پەرۆشەوە بەرەو پیری داخوازی و داواکاریە رەواکانیانەوە بچین و چەندەمان لەدەست بیٚت دریٚغیان لیٚنەکەین ، ئای مرۆڤ چەندە نیگەران دەبیٚت کە ئاواتی مرۆڤی مەزن و داهێنەرو دڵسوزنا پەتە دی ...
هونەرمەند لە وەلامی پرسیاری یەکیٚ لە ئامادە بووی کۆڕەکە ووتی :
گەلیٚ پرۆژەم بۆ داهاتوو هەیە لەوانە :

1 – ئەو گۆرانیانەی هەمن سەرلەنویٚ تۆماریان بکەمەوە کە لەگەڵ پیٚشکەوتنی موسیقاو هونەری سەردەمدا بگونجیٚ .
2 – هەروەها ئەو گۆرانیە تازانەی ئامادەم کردون ، تۆماریان بکەم . سەبارەت بە گۆرانیە تازەکانی وتی : ( من خۆم زۆر لیٚتان ئەپاریٚمەوە کە تاماوم دەنگم سازەو تا تاقەتم تیٚا ماوە ، ئەو گۆرانیانەم بۆ تۆمار بکەن با لەکیس نەچن ) !..

هەروەها لەرووی گلەییەوە ئەم رازەشی درکاند :
( ئەوە دوانزە ساڵە کەس لیٚ ی نەپرسیومەتەوە ، خۆشم ناچم بۆ بەردەم ئیٚستگەو بڵیٚم گۆرانیم بۆ تۆمار بکەن ) .. ئەمەو دوای وەلامدانەوەی گەلیٚ پرسیاری بەریٚوەجیٚ کۆڕەکە کۆتایی هات .

- هونەرمەند « اندریوس اسرائیل خمو » ، باکوری ساڵی 1928 لە دایك بووە .
- ساڵی 1949 قوتابخانەی ئامادەیی لە شاری هەولیٚر تەواو کردووە .
- پلەی [ خانەی باڵای مامۆستایان ـ دار المعلمین العالي ] لە شاری بەغدا بریووە .
- ساڵی « 1956 – 1957 » بە مامۆستای قوتابخانەی ناوەندی کۆیە دامەزراوە .
- ئیٚستاش مامۆستای وانەی ئینگلیزییە لە خانەی پیٚگەیاندنی مامۆستایانی کچان لە هەولیٚر ..

## ـ بۆ روو لە تیٚکستی خۆماڵی دەکریٚ ؟ ـ

هەر دوا بەدوای ئەوەی تیپی نەتەوایەتی سەر بە دامەزراوی گشتی سینەماو شانۆ لە هەولیٚر ، بو ماوەی چەند رۆژیٚك شانۆگەری ـ سورمەخان ـ ی پیٚشکەشکرد ، کۆمەلیٚ هونەرە جوانەکانی کورد لە هەولیٚر رۆژی 18/10/1983 کۆریٚکی رەخنەیی لە هۆلیٚ بەریٚوەبەرایەتی رۆشنبیری جەماوەری بە ناونیشانی ـ سورمەخان . لە نیٚوان نویٚ بوونەوەو جوینەوەدا بۆ کاك حیدر عبدالرحمن سازکرد .

شایانی باسە شانۆگەری ناوبراو لە نووسینی کاك (محمد عبدالله یونس) و هونەرمەند صفوت جراح دەرهێنەری بوو .

موحازیر دوای ئەوەی بە پیٚ ی سەرنجی تایبەتی خۆی ئەرکی هونەرمەندانی شانۆییەکانی دەستنیشان کردو کە دەبیٚت هونەرمەند مەبەستی تایبەتی پیٚش (مەسئولیەت) و مەبەستی گشتی نەخا ، چوونکە گەر بە پیٚچەوانەوە رەفتاریکردو قازانجی تەسکی خۆی بەرچاوخست ئەوا گوناه دەرهەق بە میٚژوی میللەتەکەی خۆیان دەکەن و لەکەیەك بە رووی کەشەداری شانۆی راستەقینەوە دەنیٚن و یەك دۆز لە پەرۆشی جەماوەر دانامرکیٚنەوە .

هەروەها سەبارەت رووکردنە تیٚکستی فۆلکلۆری وتی : [ ... لەم ماوەی دوایییەدا دەرهیٚنەرەکانمان رویان لە هەموو لایەنەکانی تری ژیان وەرگیٚراوەو تەنیا یەخەی داستانە دڵداریەکانیان گرتووە ، واتیٚ بکەم ئەو رووتیٚکردنە گەرمە نهیٚنی خۆی هەیە کە من لیٚرەدا هەندیٚکیان دەدرکیٚنم ، ئەوانەی کە پەیوەندی بە شانۆگەرییە فۆلکۆریە دڵداریەکانەوە هەیە :

1 – دەسگیربوونی مادەکە بە ئاسانی ، یان بە شیٚوەیەکی تر بڵیٚین گواستنەوەیان لە سەر شریتیٚکی تۆمارکراو بە دەنگیٚکی بەجۆشی میللیانە بۆ سەر کاغەزو شیٚواندنی دەقە رەسەنەکەی ....

٤ — نووسەر یان دەرهێنەر لەو نهێنی یە گەیشتون کە بینەرە سادەکەی ئێمە حەز لەچی دەکات ، بۆیە بە دوای ئەو حەزە کەوتوون و لەگەڵ ئاستی بیرکردنەوەو زەوق و چێژی ئەو بینەرە سادەیەدا دەڕوا ، حیسابی سەردەم و گۆڕان و بەرەو پێشەچوونی شانۆ ناکات ] .

کاک حیدر ئەو هەڵوێستەی بەوەدانا کە جۆرە فێڵێك لە خەڵکە سادەکە دەکرێت چونکە پێی وایە کەسانی سادەو ساکار هەمیشەبە قووڵی و وردی بە ناخی ڕووداوەکاندا شۆڕ نابیتە خواری و حەزی لە ڕووداوی کارتۆنی و دڵداری یە جوان پەرستیەکان و دیمەنە پێکەنیناویەکانە ، بۆیەکاتێ گوێ لە وشەیەکی بریقەدار دەبێت خێرا ختووکەی سۆزو هەستی دەدرێت و ئاکامیش بە ڕێژنەی چەپلەیەك کەف و کوڵی وروژاوی خۆی دادەمرکێنێتەوە .

**- بیری شانۆگەری سورمەخان -**

موحازیر لە ڕوی ناوەخنی فیکری سورمەخانەوە پێی وابوو : سورمەخان خۆی لە چەند بابەت و مەسەلەیەکی تایبەتیدا دەنوێنی ، بە جۆرێ ڕایەڵی تێگرای ڕووداوەکانی سورمەخان خزمایەتیان لەگەڵ یەکدا هەیە لە قازانجی ئامانجە سەرکی یە دیارەکەیدا کار دەکات .. ئەگەرچی لەو ڕووەوە بەسەر سێ خانەی جیادا دابەشیان دەکات :

١ — خۆشەویستی لە ڕووی یەکەمدا : کاک حیدر سەبارەت بەم لایەنە دەڵێ :

[ ڕووی سەرەکی ئەم شانۆگەری یە ، مەسەلەی خۆشەویستیەکی نەمرە ، لەو خۆشەویستیانەی کە مێژوو بەوپەڕی شانازیەوە لە ئامێزی دەگرێ و زۆر بە پیرۆزیەوە بۆ نەوەکانی داهاتوی هەڵدەگرێ ، نمونەی ئەم خۆشەویستی یە لە مێژووی فۆلکۆری کوردی‌ماندا زۆر ە وە هەر یەکێك لەوانە نرخ و بەهای خۆی هەیە ... ] .

کاک حیدر بە شێوەیەکی هێمن و زیرەکانە جەمسەری خۆشەویستی ئافرەت و خاکی بەیەکەوە گرێ‌داو وتی :

[ ... خۆشەویستی ئافرەت و خۆشەویستی خاك لەیەك سەرچاوەوە هەڵ دەقوڵێن و تەواوکەری یەکدین ، چونکە مرۆڤ لە ڕێگەی یەکێکیانەوە عەشقی ئەوی تریان دەبێت و لێی جیا نابێتەوە ] .



2 — سەردەم : لە هەڵسەنگاندنەکەی سورمەخاندا باسی ئەو بارو دوخەی ژیانی ڕوودا‌وەکەکرا . بۆیە موحازیر لە ڕوانگەی سەردەمی سەرهەڵدانی سورمەخانەوە ناوەخنی باسەکەی شی‌کردەوە : [ زەمینەی شانۆگەری‌یەکە نیشاندانی سەردەمەکەیەتی ، ئەو سەردەمەی کە سورمەخان - ی لێ هاتۆتە بەرهەم ، گەرمەی دەرەبەگایەتی و چڵکاو خۆری و زوڵم و ستەمکاری بووە . ]

هەر لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونی تایبەتی کاك حیدر خۆی گەلێ بیروڕای سەبارەت سەردەم و دوخی سورمەخان دەربڕی و تێبینیەکانی ئاراستەی دەرهێنەری شانۆگەریەکەکرد :

[ دەرهێنەر بەشێکی هەرە زۆری شانۆگەریەکەی بۆ نیشاندانی ئەو سەردەمە تەرخانکردوە ، ویستوویەتی لە چەند نموونەیەکی وەکو باج لێ‌سەندنەوە ڕووی سلبی ئەو قوناغە نیشان‌بدا .

بەلام بەر لەوەی بینەر گرێ‌یەك لە دەروونیدا گەلالەبێت ، لە ڕق و کینەی ئەنجامی کارەساتە تاڵەکان ، هەر زوو لە دیمەنی یەکەمدا کۆمەڵە جوتیارێك دێنە بەر دەرگا ، دەیکەن بە هەراو هۆریا ؛ گوایە ماف خۆیان لە - خلیل بەگ دەوێ ، نووسەر ئەو کۆمەڵە جوتیارە زۆر بەلاوازی نیشان‌دەدا ، چارە نووسەکانیشیان زۆر بە نیگەرانی بەجێ دێڵێ ، بەگ گاڵتە بە قسەکانیان دەکاو بای دەنکە گەنمێك کار لە بیری بەگ ناکەن ، بگرە هەتا زەوقیشی تێك نادەن بە گاڵتەوە فڕێیان دەدەنە دەرەوە ، ئەوانیش زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی ملی ڕێگا دەگرن و دەچنە دەرەوە ] .

3 — ڕووی سێیەم : (مەسەلەی نەتەوایەتی) .

کاک حیدر ڕوویەکی دی‌و لایەنێکی گرنگی خۆماڵێتی ئەم شانۆگەریەی ئاشکراتر کردو بۆ چونی خۆی بەم جۆرە دەبڕی :

[ روویەکی تری ئەم شانۆگەریە گێرانەوەی داستانێکی قارەمانێتیو پاڵەوانیەتی یەزیدیەکان بوو بەرامبەر بە عەجەمە چاوچنۆکەکان ، ئەوانەی بە درێژای مێژو چاویان لە خاكو سامانی نەتەوەکانی تر بوە ... ] هەروەها موحازیر سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتیو جۆری مامەڵەکردن لە تەك شانۆگەریەکەدا ئەوەی نیشاندا کە ؛ لە شانۆگەریەکەدا مەسەلەی نەتەوایەتی قەوارەی شیاوی خۆی نەدراوەتێ !

## [ سورمەخانو قوتابخانەیەکی شانۆیی یان چەند قوتابخانەیەك ]

کاك حیدر بە شێوەیەکی فراوان لەو بابەتە دوا کە پێویستە هەموو کارێکی شانۆیی خاوەنی دەنگو رەنگی تایبەتی خۆی بێتو یەکگرتن لە بابەتو زمانو لە خوو رەوشتی کۆمەلایەتیدا هەبێت بۆیە بە پێ بیرورای خۆی ، ئەوەی دەرخست کە شانۆگەری سورمەخان شیرازەی ئەو یەکگرتنەی پچراوەو تێك هەڵکێشی چەند ڕێبازێکی جیاوازە وەکو ڕێبازی (ڕۆمانسی) و (واقیعی) و (کەلەوپور) و (خەیالی) ..

## [ کپ بوون یان جوینەوە ] لە سورمەخاندا

بەهۆی ئەو بارو دۆخەی نەتەوەیەك تێدا دەژی گەلێ جار دیاردەو هەلوێستی ڕووداوەکان جۆرە لەیەكچوونو دووبارە بوونەوەی تێدا بەدی دەکرێت ، بەلام هەریەکەشیان چێژو خۆشیەکی ئەدەبی تایبەتیو جیاواز دەبەخشن ، بەتایبەت لەداستانە فۆلکۆریە دلدارەکاندا ، بۆیە مەرجی سەرەکی سەرکەوتنی ئەوکارە شانۆییانەی ناوەرۆکی ئەم بابەتانەیان لە ئامێز کردووە ، تەواو بەستراوە بە هۆشیاریو شارەزایی نوسەرو دەرهێنەری شانۆگەریەکەو جۆری مامەلەکردن لەگەلیدا .

سەبارەت بەم لایەنەی شانۆگەریەکە کاك حیدر بەم جۆرە بیرورای دەردەبڕێ :

[ لە دەقە رەسەنەکەی (محەمەدو سێوی) دا سێوێش وەکو سورمەخانێ چۆن کاکەمین دەکوژێ لەسەر خورشیدی ئامۆزای ، ئاوا سێویش حسێن بەگ دەکوژێ لەسەر محەمەدی ئامۆزای ...

بەکورتی ئەو بەراوردەم بۆیە هێنایەوە بۆ ئەوەی بلێم کە ڕووداوەکانی سورمەخان شتێکی نوێیان تێدا نەبوو ، بینەر تووشی سەرسامیو کتوپڕ یەك بکات ، بۆیە سەرباری ئەو ئارەق ڕشتنەی دەرهێنەر ڕشتی لەگەڵ ئەو ـ دەق ـ ەدا شتێك دروست نەبوو داهێنانێکی تیابێ . ] .

برای موحازیر کاك حیدر جگە لەو لایەنانە تیشکی سەرنجو بۆچوونی بۆ گەلێ لایەنی دی شانۆگەریەکە ئاراستە کردو بەگشتی بابەتەکەی گورو هێزو پێزێکی چاکی تێدابوو ... ئەمەو سەرەرای ئەوەی دوای پێشکەشکردنی باسەکە هونەرمەند (صفوت جراح) دەرهێنەری شانۆگەریەکە لەشێوەی ڕوونکردنەوەدا ، بیرورای خۆی دەربڕی .

- **حیدر عبدالرحمن .. لەساڵی 1956 لەشاری هەولێر لەدایك بووە .**
- **خوێندنی ئامادەیی تەواوکردوە .**
- **یەکەم نووسینی لەساڵی 1971 دا لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بلاو کردوتەوە .**
- **گرنگترینی ئەو شانۆیانەی هەڵیسەنگاندوونو وتاری لەسەر نووسیونو لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بلاوکراونەتەوە ئەمانەن :**

| | | **دەرهێنانی** |
|---|---|---|
| **1 ــ مەرەزە** | = | **سلمان کاکەیی** |
| **2 ــ چلپاو** | = | **صباح عبدالرحمن** |
| **3 ــ گریان** | = | **طه بابان** |
| **4 ــ مالەی سەرگردەکە** | = | **زهیر عبدالمسیح** |
| **5 ــ النسر وعیون المدینه** | = | **ابراهیم عبدالجلیل** |
| **6 ــ خانزاد** | = | **عباس ژاژەلەیی** |
| **7 ــ مۆنکیبۆت** | = | **صباح عبدالرحمن** |
| **8 ــ سورمەخان** | = | **صفوت الجراح** |

**هەروەها گەلێ نووسینی دی لەسەر بابەتی شانۆ بلاوکردوتەوە .**

# لە سلێمانی

○

ئامادەکردنی

- ئاسوس -

○

## جێ‌نزرگەی پیرەمێردو چاپخانەکەی :

زوربەی خوێنەرە ئازیزەکانمان ئەوە دەزانن کە پیرەمێرد)ی شاعیر کەلە ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگە لە جیهانی ڕۆژنامەنووسی کورردیدا . دوای گەڕانەوەی لە ئەستەمبول لە کاتێکدا شارەوانی سلێمانی ڕۆژنامەی تایبەتی دەرکرد ، پیرەمیرد بوە بەڕێوەبەری ، ئەو سەردەمە خوالێخوشبوو حسین نازم سەرنووسەری ڕۆژنامەکەبوو ، پاش کۆچی دوایی حسین نازم ، پیرەمیرد بوە سەرنووسەر ، دوای ئەوەی لەگەل شارەوانیدا نێوانیان تێکچوو ئیتر خۆی بوە خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەری ڕۆژنامەکە تا ڕۆژی 950/6/19 کە خۆری ژیانی ئاوابوو لەگەل ڕۆژنامەنووسیدا ژیا . لەنزیك مەکینەی کارەبای ئەوسەردەمەی سلێمانی لەگەڕەکی گویژە جێ نزر گەی پیرەمێردو شوێنی چاپخانەکەو ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین) هەمیشە شوێنی گردبوونەوەی ئەدیبان‌و شاعیران‌و نووسەرانی شاری سلێمانی‌بوو ، دوای کۆچی دوایی پیرەمیرد «رەحمەخان»ی کچی کە دایکی مامۆستایان فائق هوشیارو ئەحمەد زرنگە کرا بە خاوەنی ئیمتیازو بەوودوا بەڕیوە بردنی ڕۆژنامەی (ژین) بە مامۆستایان جمیل صائب‌و نوری أمین محمودو گۆران‌و احمد زرنگ سپێررا . دوای داخستنی ڕۆژنامەکە لە سالی 1963 دا ئیتر چاپخانە کۆنەکەی پیرەمیرد هەر لە شوێنی خۆی مایەوە .

لەم ڕۆژانەدا پاش پەیوەندی کردن بە مامۆستایان هوشیارو زرنگەوە بەڕیوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە شاری سلێمانی ئەو چاپخانەیەی گواستەوە بۆ مۆزەخانەی ئەتنوگرافیا کە دەکەویتە سەرشەقامی نالی لە گەڕەکی سەرکارێز ، وەنیازیشیان وایە ژوورێکی تایبەتی بۆ دروست بکەن کە چاپخانە کۆنەکەی تێدا بپارێزن ، بریاریش وایە لە



دوای تەواوبوونی ژوورەکە ئاهەنگێك بەو بونەیەوە ساز دەکەن وەبریاریش وایە بەرهەمەکانی‌و ڕۆژنامەکانی لەو شوێنەدا پیشان بدرێ‌و ببێتە جێ نزرگەیەکی نوێی پیرەمێرد کە پاشماوەکانی تێیدا بپاریزرێ .

### «یادی دامەزراندنی شاری سلێمانی»

ڕۆژی 982/12/4 لە کاتی میهرەجانی نالیدا کاك محمد أمین پێنجوێنی کە ئەوکاتە بەڕیوەبەری ڕۆشنبیری جەماوەر بوو لە سلێمانی ، ڕای‌گەیاند کە بەیاریدەی یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردو کۆڕی زانیاری کوردو هەموو نووسەرە پسپۆڕەکان دەیانەوێ لە سالی 1984 دا بە بۆنەی (200) سال تێپەڕبوون بەسەر دامەزراندنی شاری سلێمانیدا میهرەجانێك بۆئەم بۆنەیە بگێڕن کە نزیکەی مانگێك بخایەنێ . لەم ڕۆژانەدا بەڕیوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە ڕێگای بەرنامە تەلەفزیۆنیەکانیەوە وایان ڕاگەیاند کە سوورن لەسەر جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو بریارەی کە لەوەوپێش درابوو دەربارەی یادی 200 سالەی دامەزراندن‌و بنیات نانی شاری سلێمانی .



## ئێوارە كۆڕێك بۆ مامۆستایانی زمانی كوردی

لیژنەی تایبەتی زمانی كوردی سەر بەلقی ڕاهێنانی لە مەڕ بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی سلێمانی ئێوارەی 1983/12/11 كۆڕێكی تایبەتی بۆ ئەو مامۆستایانە سازكرد كە ئەدەب و زمانی كوردی لە قوتابخانە ناوەندیی و سانەوی و ئامادەییەكاندا دەڵێنەوە ، لەم كۆڕەدا مامۆستا فۆاد رؤوف صراف بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی (الوطن) كە سەرۆكی لیژنەكەیە بەخێرهاتنی میوانەكانی كردو ئەوەی ڕاگەیاند كە لەپێشا وانەیەكی نموونەیی پێشكەش دەكەن . مامۆستا گوڵبەند ئەحمەد مامۆستای زمانی كوردی لە قوتابخانەی (الوطن) وانەیەكی نموونەیی بە قوتابییانی پۆلی یەكەم وتەوە ، ناونیشانی وانەكەی (پیت و جۆرەكانی ، برگەو جۆرەكانی ، پیتە بزوێن و نەبزوێن) . دوای تەواوبوونی وانەكە دەربارەی هەڵسەنگاندنی و تێبینی تایبەتی ، بەرودوا مامۆستا روناك محمود علی یاریدەری بەڕێوەبەری ئامادەیی كچان و مامۆستا سعاد صالح سعید ، مامۆستای زمانی كوردی لە ناوەندی سەیوان و مامۆستا عبدالرحمن أمین صالح سەرپەشتیاری پسپۆری زمانی كوردی چەند سەرنجێكیان دەربارەی وانەكە دەربڕی شیاوی باسە كە جگە لە مامۆستایانی زمانی كوردی ئەم بەڕێزانە بە تایبەتی میوانداری كرابوون بۆ ئەم كۆڕە :

مامۆستایان انور سلیمان و وفاضل رشیدو عبدالرحمن أمین صالح كە هەرسێكیان سەرپەشتیاری پەروەردەیی پسپۆرن ، هەروەها مامۆستایان نیهایەت جەلال تایەر بەڕێوەبەری ناوەندی پەیام و روناك مەحمود یاریدەری ئامادەیی كچان و سعاد صالح مامۆستای قوتابخانەی سەیوان لەدوای تەواوبوونی گفتوگۆ لەسەر وانە نمونەییەكە ئەم پێشنیازانە خرانە بەردەست لێپرسراوان :

1 ـ داوابكرێ لەو مامۆستایانەی زمانی كوردی لە پۆلی یەكەمی ناوەندیدا دەڵێنەوە چ جۆرە سەرنجێكیان دەربارەی كتێبی كوردی پۆلی یەكەم هەیە پێشكەشی بكەن ، تا لیژنەكە ئەو سەرنج و تێبینیانە یەك خات و هەوڵبدرێ ئەم كەم و كوڕییانەی لەم كتێبەدا هەیە چاك بكرێ .

2 ـ داواكرا كە ژمارەی وانەی كوردی لە قوتابخانە ناوەندی و سانەوی و ئامادەییەكاندا زیاد بكرێ ، چونكە بەرێژەی گرنگی وانەكەوە ئەو چەند سەعاتەی لەبەرنامەدا بۆی دانراوە كەمەو بەش ناكات .

3 ـ تا ئێستا لە [لقی پیشەییدا] وانە لە «ئامادەیی كشتوكاڵ و ئامادەیی پیشەسازی و ئامادەیی بازرگانی ، لەم قوتابخانانەدا بەرنامەیەكی جێگری دانراو بۆ زمانی كوردی نییە ، پێویستە ئەمە چارەسەر بكرێت .

4 ـ پێشنیازكرا كە لیژنە زانیارییەكان پێك بهێنرێت و بكەونە كارو چالاكی خۆیان بنوێنن .

5 ـ پێشنیازكرا كە لیژنەی زمانی كوردی لە وەرزی داهاتوویدا ئەم چالاكییانە پێشكەش بكات .

آ ـ پێشكەش كردنی وانەیەكی تر بۆڕاهێنان .

ب ـ باسێك دەربارەی ڕەخنەی ئەدەبی .

ج ـ كۆڕێكی ئەدەبی دەربارەی ڕێبازە ئەدەبییە جۆراو جۆرەكان .

د - ئامادەکردنی چەند بڵاوکراوەیەکی ڕێك‌وپێك‌و ئاڵوگۆڕ کردنیان لەنێوان قوتابخانە کاندا .

هـ - سازکردنی چەند پێش برکێیەکی شیعرو ووتاربێژی لە نێوان چەند قوتابخانەیەکی ناو شاری سلێمانیدا .

و - تەرخانکردنی کۆڕێك بۆ شی کردنەوەو لێدوان لەسەر بەرنامەی زمانی کوردی لەقۆناغەکانی خوێندنا .

ز - ئامادەکردنی باسێك دەربارەی چونیەتی دانان‌و داڕشتنی پرسیاری تاقی کردنەوەکان .

ح - پێك هێنانی سەردان لە قوتابخانەکان بۆئاڵ‌و گۆڕ کردنی شارەزایی‌و تاقی کردنەوە لە نێوان مامۆستایانی زمانی کوردیدا .

* * *

لەڕاستیدا هەر بەتەنیا ئەوە بەس نییە کە قوتابییەك لە بەشی کوردی کۆلیجی ئەدەبیات دەربچێت ، ئیتر خۆی بە مامۆستای زمانی کوردی بزانێ ، پێویستە زۆر دڵسوزانە هەوڵی خۆ ڕوشنبیر کردن بدات‌و شەیدای زمانەکەبێ بەڕادەیەك ئەو هەوڵ‌و تەقەللاو دڵسۆزیەی لەبەرهەمی قوتابیەکانیدا ڕەنگ بداتەوە . جا بۆیە ئەم جۆرە کۆڕانە بۆ مامۆستایانی زمانی کوردی کارێکی گرنگ‌و پیرۆزە ، هیوادارین بەم نزیکانە چالاکیەکانیان تیشك بەسەر قوتابخانەکانا پەخش بکات .
لێرەدا دەمانەوێ ئەوەش بخەینەوە یاد کە لە کاتی خۆیدا ئەو دەمەی مامۆستا دکتۆر کەمال فؤاد سەرۆکی بەشی کوردی - کۆلیژی ئاداب بوو هەمیشە قوتابیەکانی بۆ هەموو کۆڕە ئەدەبییەکان دەهێنا تالەسەر گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە ڕابێن‌و سوود لەو ئەدیبانەش وەربگرن کە تاقی کردنەوەی زیاتریان هەیە .
هەروەها یەکێ لە لێژنە چالاکەکان ، ساڵی 79 و 80 ڕووی لە گەلێ ئەدیب‌و شارەزاو پسپۆڕ نابوو کە باسی تایبەتی لە کۆڕەکانیانا پێشکەش بکەن ، سەرەڕای ئەو مامۆستایانەی کەلەو لیژنەیەدا بوون‌و ئامادەی کۆڕەکان دەبوون ، هەروەها میوانداری ئەدیبەکانیشیان دەکرد بۆ بەشداربوون لەو کۆڕانەدا ؛ بۆیە وای بە پێویست دەزانین کە لەوجۆرە کۆڕانەی لیژنەی زمانی کوردیدا چاکتر وایە ئەدیبەکانیش بانگ بکرێن تا ئامادەی گفتوگۆکان بن وە کۆڕەکان وا بەداخراوی نەمێنێتەوە

**کۆڕێك بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵە چیرۆکی (تەنیایی)**

بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر بەنیازبوو نێوارە کۆڕێك بۆ کاك بەهات قەرەداخی سازبکات بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵە چیرۆکی (تەنیایی) مامۆستا شێرزاد حەسەن ، بەڵام بەهۆی کۆتایی هاتنی وەرزی ڕۆشنبیری ئەم بەڕێوەبەرێتیە کۆڕەکە دواخرا بۆ کاتێکی تر .

●

# لە دهۆك

**ژ ئامادەکرنا : مەتین**

**چەندا بزاڤەك لسەر فێرگەهێن ئەدەبی**

ل ڕوژا 1983/9/29 ، ژ بزاڤێت ناڤخویی دیسان ، بێت ئێکەتیا نڤیسەڤانێت کورد تایێ دهوکێ ، کۆڕانگەهەك هاتە سازکرن ، بو چیروك نڤیسێ لاو ، سەیدا [ انور محمد طاهر ] ی لبارەگایێ ئێکەتیێ ، لسەر « الوجودیە » بڤێ چەندێ پروگرامێ بزاڤا ئێکەتیێ لسەر فێرگەهێت تورەیی ، بکوتایی هات .
ل سەرەتایێ ڕامان ژپەیڤا « الوجودیە » دیارکر . پاش وجودیەت کە ڕێبازەکا فەلسەڤی و دیروك‌و بنیادکارێت وێ ، کاك ئەنوەری ژمەرا خویا کرن . پشتی هینگی بکورتی لسەر ژیانا سارتەری ئاخفت ، یێ کو لساڵا 1905 ل پاریسێ ژدایك بوی . بەشێ فەلسەڤێ ل زانکوا سوربونێ خاندیە . پشتی جەنگا جیهانیا دووێ سارتەر بو ناڤەکێ مەزن ، دجیهانا فەلسەفێدا . لساڵا 1980 چاڤێت وی بئێك جاری نقیانیە . پاش سەیدای کرە بەحسێ ستوینێت وجودیەتێ یێت کو - ژوانا ، سەربەستی‌و



هەلبژارتن . بیرو هزریت سارتەری لسەر ڤێ چەندێ بو مە ئاشکرا کرن . چەند نمونەك ژ نفشتوکێت وی پێش چاڤی کرن . لسالا 1945 سارتەری کورانگەهەك گێرا ، تشتێ لێ گوتی کرە رەش بەلەکەك ل ژێر ناڤێ « الوجودیە مذهب انسانی » بیرو هزریت خو تێدا ژ خەلکیرا ئاشکرا کرن . پشتی هێرشێت دهاتنە سەر ، ئو هەڤرکیا لناڤبەرا وی‌و گەلەك هزرو بیریت دی . هەر وسا کاك ئەنوەری دیارکرن ئەڤ هوزانڤان‌و رومان نفیسێت ، سارتەر لێ داخباربوی مینا ، کافکای‌و دیستوفسکی‌و ویلیەم فولکنەری‌و همنگوای . دیسا بیرو رابیت وی لسەر دەورێ تورەڤانی د ژیانا مللەتادا بو مە دیارکرن . کاك ئەنوەری ناڤێ « 14 » پەرتوکا گوت ، کە ژێدەر منا ژێ وەرگرتیە بو نفیسینا بابەتێ خو . لدویماهیێ گێنگەشەکا گەرم خو کێشا مەیدانێ چەند برادەرەکە پشکداری تێدا کر . ئاخفتن لسەر وجودیەتێ د ئەدەبێ کوردی‌دا . کاك کریم فندی تێبینیەکا جوان دیارکر لسەر وجودیەتێ‌و ئەدەبی گوت .

کاك ئەنوەری بو مە بناغێت وجودیەتێ د ئەدەبیدا دیارنەکرن‌و نەگوتن . راستە باهرا پتر ژ بابەتی لسەر سارتەری بو کە فەیلەسوف ، لوەختێ کو مە دڤیا یا فەرتربو ، بو مە بەرفرەهەتر بەحسێ وجودیەتێ کربا کە ڤێرگەهەکا ئەدەبی ئو ئەڤ کەسێت لدویڤ رێچو شوپا وی چوین . هەر چەندە ئەم لسەیدای ناگرین چمکی بابەتێت ژ ڤی توڤی ، مینا تەڤنەکێ بەلاڤ‌و ئالوزن بسەعەتەکێ‌و دووا ، خودان نەشێت هەمی لایا بەحسی ژێ بکەت .

سوپاس بو کاك ئەنوەری‌و رەنجیا کێشای بو بەرهەڤکرنا ڤی بابەتی مە سود ژێ وەرگرتی :

## فیستەڤالەکا سترانێن کوردی
## ل دهوکێ

ل ژێر دروڤێ [ لاوێت حوکمێ زاتێ ، سترانا دبێژن بو شاهیێ - بو سەرکەفتنێ - بو پێشرەو صدام حسین ] فیستەڤالەکا سترانێت کوردی لپارێزگەها دهوکێ هاتە گرێدان ، لناڤبەرا روژێت 1983/10/3 ئو هەتا 1983/10/7 ب پێش هێژا ،

پارێزەرێ دهوکێڤە ، سەیدا [ محمد سعید عبدالرحمن ] ی رێبەرێ گشتی ، یێ رێبەریا پەروەردەی لدهوکێ ، ئەڤ فیستەڤالە ڤەکر ، ل روژا 1983/10/4 لهولا مەلبەندا لاوێت دهوکێ .گش مەلبەندێت لاوا ، پشکداری د ڤێ چاڤپێکەفتنا هونەرییا مەزن‌دا کریە . ژ دەڤەرا کوردستانێ ، یا حوکمێ زاتی . ژپارێزگەها دهوکێ ، مەلبەندا لاوێت زاخو ، وە مەلبەندا لاوێت دهوکێ د ڤێ فیستەڤالیدا ، دەهـ ستران پێش‌کێش کرن . باهرا پتر ژ ڤان سترانا دفولکلوری بون . هەروسا پارچەکا موسیقی‌و عود لێدان‌و داهوەتەکا کوردی هاتنە پێش کێش‌کرن ، ژلایێ ڤان هەردوو مەلبەندا ڤە .

ژ پارێزگەها هەڤلێرێ ، مەلبەندا لاوێت شەهید ابراهیم و لاوێت عێنکاوەو لاوێت رەواندوزو لاوێت کویسنجەق . پشکداری د ڤێ فیستەڤالێدا کر ، ب چەند تیپێت موسیقی یێت روژهەلاتی‌و روژئاڤایی ، وە چەند سترانبێژەکێت ژێ‌هاتی . ژ پارێزگەها سلێمانیێ ، مەلبەندا لاوێت حەلبچەو رانیەو چەمچەمال‌و سلێمانیێ ژی ، پشکداری‌کرن ب چەند تیپەکێت موسیقێ یێت روژهەلاتی‌و مللی‌و روژئاڤایی ، هەروسا ب چەند تابلویەکێت داهوەتا کوردی‌و سترانا . لدویماهیکا فیستەڤالێ ناڤێت هونەرمەندێت سەرکەفتی ، دلێدانا هەمی رەنگێت ئامیرێت موسیقی دا ، هاتنە ئاگادارکرن . هەروسا تیپێت موسیقی‌و داهوەت ئو جوانترین کورس‌و دەنگ ، هاتنە ئاشکراکرن . دیسان چەند موسیقاژەن‌و سترانبێژو چەند خوەیێت دەنگێن خوش ، هاتنە خەلات‌کرن .

هەر وەکی ژ چەند تێبینییەکێت رێبەریا لاوێت پارێزگەها دهوکێ

ـ يار ، لسه‌ر ڤێ ڤیسته‌ڤالێ ، هنده‌ك كیماسیی‌و گلی خویابون . ژوان ، ته‌نگیيا جهی . هولا ڤیسته‌ڤال لێ هاتیه‌كرن ، ته‌نها جهێ [ 250 ] كه‌سا دكه‌ت ، لده‌مێ كو هـژمارا پشكدارا بتنێ ، گه‌هشته [ 285 ] كه‌سا ، ژبل چه‌ند خێزانه‌كا ، له‌وما نه‌هێلان بینه‌ر ژ دهوكێ بێهنه‌پێش ڤێ ڤیسته‌ڤالێ . ژ لایه‌كێ دیڤه هنده تیپێت هـونه‌ری ، سـتـران‌بێژێت مـه‌زن ئینـابـون ژ ئیـزگـه‌و ته‌له‌ڤزیونا . هه‌روسا د ڤان تێبینییادا هات ، كو نـوینه‌ره‌ك ژ ئه‌میندارییا گشتی یا ره‌وشه‌نبیریی‌و لاوان ، لڤێ ڤیسته‌ڤالێ مه نه‌دیت ، مینا ڤیسته‌ڤالا شانوگه‌ریێ لبه‌ری ڤێ .

ب ڤێ هه‌لكه‌فتنێ ، مه پێ خوشه ئه‌م ڤێ چاڤ پێكه‌فتنێ بكه‌ین ، ل گه‌ل هونه‌رمه‌ندێ گه‌نج ستران‌بێـژێ ده‌نگ خـوش [ غانم محمد سیتو ] . لسه‌ر ڤێ ڤیسته‌ڤالێ كاك [ غانم ] دبێژیت : ئه‌ز دكارم بێژم ، بشێوه‌كێ گشتی ئه‌ڤ ڤیسته‌ڤاله یا ب سه‌ركه‌ڤتی بو ، لاوێن حوكمێ ئوتونومی ته‌ڤدا كومكرن د به‌ڤلیه‌كا هونه‌ری دا ، یا جوان‌و ژێهاتی . ژپێش‌چاڤی‌كرنا ڤان بزاڤێن هونه‌ری ، دیاربو كو گش تیپێن پشكداری كری ، دپێ‌چێبـوی بون ، وه دده‌ست‌هه‌ل‌و چه‌له‌ك بون . ئه‌ڤ سه‌ركه‌ڤتنه ، پترزل‌و رون بو ، بشێوه‌كێ تایبه‌تی ، ل ده‌ڤ تیپا كویێ ، وه تیپا مه یا مللی یـا فولكلوری . ئو پێڤه دچیت كاك غانم دبێژیت : ژ لایه‌كێ دیڤه چه‌ند ده‌نگه‌كێن خوش ، ل پاناڤا سترانا ، سه‌رهه‌لدا ، مینا مجید خالدو فارس یوسف‌و نزار حسێن ی . دیسان هنده‌ك عازفـێن بژاره ، دیار بـون ل لوكه‌كـا هونـه‌ری یا بـالا ، ژوان صلاح پشده‌ری‌و صباح زاخولی . لدیماهیكا ئاخڤتنا خو هونه‌رمـه‌ند [ غانم محمد ] ی چه‌ند كێماسیه‌ك دیاركرن ، ده‌ربـاری بێ سه‌روبه‌ریا هولا ڤیسته‌ڤال لێ هاتیه‌كرن ، وه به‌رته‌نگیا جهێ وێ .

- ● غانم محمد سیتو ●
- سالا 1961 هاتیه دونیایێ لگوندێ [ زێوا شه‌فیقی ]
- سالا 1970 ده‌ست ب سترانا كریه .
- سالا 1974 چویه ئێزگا كوردی ، ل به‌غدا چـه‌ند سـترانـه‌ك توماركرینه . وه یێ به‌رده‌وامه لسه‌ر بزاڤێن خو ، هه‌تا ڤێ كاڤێ .
- ئه‌ندامێ نیقابا هونه‌رمه‌ندایه ، ل تایێ دهوكێ .
- نهو ستران بێژه ، ل رێڤه‌به‌ریا ره‌وشه‌نبیری یا جه‌ماوه‌ری ل دهوكێ .



**لاوكێ مه‌عده‌نی دكوره‌كی دا**

ژبزاڤێت رێبه‌ریا ره‌وشه‌نبیریا جه‌ماوه‌ری لدهوكێ ، ل روژا چار شه‌مبێ ل 1983/10/5 كوره‌ك هاته پێش‌كێش‌كرن ، لسه‌ر چیروكا [ لاوكێ مه‌عده‌نی ] ژبه‌رهه‌ڤكرنا لاوكێ هێژا [ شڤان عه‌لی ] . كاك شڤانی چه‌ند ده‌قـه‌كێت ڤێ چیروكـا فولكلوری دگـه‌لێك بـه‌راورد كـرن . جهـوارو دیـوركـا كـریـارێت چیـروك ژێ به‌حس‌دكه‌ت ، بو مه دیاركرن . ئه‌ڤه‌و هژماره‌كا گه‌نجێت دهوكێ لڤی كوری ئاماده‌بون .

**دووكور ب هه‌لكه‌فتنا رابورینا 20 سالا**
**لسه‌ر خاتر خاستنا نالبه‌ندێ نه‌مر**

دوو ئێڤارییا ، هوزانڤانێ نه‌مر [ ئه‌حمه‌د نالبه‌ند ] مێهڤانێ كوچكا ره‌وشه‌نبیرو ئه‌دیب‌و ئه‌ده‌ب دوستا بو لباژێرێ دهوكێ . هوزانڤانێ هێژا خالد حـوسینێ نوژدار ل روژا ئێـك شه‌مبێ 1983/10/9 ، ژبزاڤێن رێبه‌ریا ره‌وشه‌نبیریا جه‌ماوه‌ری ل دهوكێ ، كورانگه‌هه‌ك گێرا لباخچێ یانا نوهه‌درا . دڤی كوری‌دا ، یێ كو هژماره‌كا مه‌زن ژ گه‌نجێن باژێری ، لێ ئاماده‌بوین ، سه‌یدا خالد حوسێنی ، بو مه لسه‌ر نالبه‌نـدی‌و سفرێت خـارنێ ئاخڤت . لبه‌ری كور ده‌ست پێ بكه‌ت ، هوزانڤانێ لاو ، هێژا [ رمضان عیسێ ] گوتاره‌ك خاند ، بناڤێ رێبه‌رێ گشتی ، یێ ده‌زگـه‌ها ره‌وشه‌نبیری‌و به‌لاڤكرنا كوردی لپێشیا بابه‌تێ خو ، سـه‌یدا خالدی ، كورتیه‌ك ژ ژیانا نالبه‌ندی پێش‌چاڤی كر . لسه‌ر ژیانا كومه‌لایه‌تی لده‌ڤه‌رێ ئاخڤت ، ل 60 سالێن چه‌رخێ بیستێ . به‌حسێ خه‌لاو هه‌ژاری‌و نه‌خوشیێن لده‌ڤه‌رێ كر . پاش لسه‌ر ژیانا فه‌قییا ، لمزكه‌ڤت‌و جامعا ئاخڤت‌و خارنا وان ، یا كو لده‌رو كولانا . لسه‌ر خارنی‌و سفرا ، نالبه‌ندی چ لسه‌ر خو نه هێلایه . ژین‌و ژیارا هاولاتیا ، دیاردكه‌ت ، كا چ دخـارن گه‌له‌ك نـاڤێن خارنێن ئه‌م نه زانین ، د هوزانێن خوه‌دا ، نالبه‌ند ژ مه‌را خویا دكه‌ت . پێڤه دچیت ـ كاك خالد ـ دبێژیت : ئه‌و كـه‌سێ سفره



دده‌ینا ، نالبه‌ندی خو نێزیك دکر ، ب باش به‌حسێ وان مروڤا دکر . وه ئه‌گه‌ر چاخێ سفره ده‌ینانێ ، نه ڤرێ کربانه ددوی وی را ، دا بدژواری هاڤێته خوه‌یێن وان سفرا . ئاخفتنێن سه‌یدای کرین و گوتین ، چه‌ند هوزانه‌کێن نالبه‌ندی لسه‌ر ئینان . لدویماهیکێ گێنگه‌شه لسه‌ر بابه‌تی شاریا ، گه‌له‌ك براده‌را ئاخفت ، ژوان کاك انور محمد طاهر وحجي جعفرو عبدالكريم فندی . هه‌می گه‌هشتنه هندێ ، که ئه‌ڤ بابه‌ته ده‌رگه‌هه‌کێ نوی‌یه ، نالبه‌ندی قوتابی‌و ، لبابه‌تێن دی یێن هوزان پێ ڤه‌هاندین زێده‌کریه . دیسا هنده‌ك پسیارا خو هاڤێته گوڤه‌ندێ . کاك خالد ی به‌رسڤا هه‌میان دا . ئو کوڕ ب کوتایی هات ، پشتی نێزیکی سه‌عه‌ت و نیڤا کێشای . ئه‌ڤه‌و ل روژا بێنج شه‌مبێ 1983/10/13 ، ب هه‌لکه‌فتنا رابورینا بیست سالا لسه‌ر مرنا وی . دیسان سه‌یدایێ خالد کوڕانگه‌هه‌کا دی پێش‌کێش‌کر ، لئێکه‌تیا نفیسه‌ڤانێن کورد ـ تایێ دهوکێ ـ لسه‌ر ژیان‌و به‌رهه‌مێن نالبه‌ندی . دڤی کوڕی‌دا گه‌له‌ك لایێن ژیان‌و هوزانێن نالبه‌ندی ، بو جارا ئێکێ هاتنه رون‌کرن . کاك خالد لسه‌ر ژیانا هوزانڤانی په‌یڤی ، هه‌روسا جهێت لێ خاندی‌و سه‌یدایێن ده‌رس گوتینێ‌و ژیانا خێزانا وی . کاك خالد دیار کر کو نالبه‌ندی سالا 1952 هوزانه‌کا درێژ ب حازم به‌گێ گوتیه ل زاخو . وه سالا 1955 هه‌ر لزاخو هوزانه‌کا دي ب میر فه‌یسه‌لی گوتیه . سالا 1956 چو نك [ سه‌عید قه‌زازی ] دا هوزانێن وی چاپ بکه‌ت ، لێ چ نه‌دا ده‌ستی ، ژبل تشتکه‌کێ کێم ژ دراڤی . سالا 1957 نه‌خوش که‌ت ، ئو چو ئامێدیێ . ژبو به‌رفره‌هه‌کرنا بابه‌تێ خو ، وه ده‌ست‌نیشانکونا راستی‌یاو روهن‌کرنا هه‌می کوژی‌و قولاچکێن ژیان‌و هوزانێن احمد نالبه‌ندی ، سه‌یدایێ چالاك کاك خالدی ، چه‌ند چاڤ پێکه‌فتنه‌ك کربون لگه‌ل هنده‌ك مروڤ‌و هه‌ڤال‌و هوگرێن هوزانڤانی ، ژوان ، [ محمد سلیم امین ] بامه‌رنی ، [ سامي محمد جخسی ] ، مه‌لا [ علي احمد شه‌ماما ] ، [ حجي یوسف حجي رجب ] ، مه‌لا [ طه مائی ] .

پاش په‌ند پسیاره‌ك ئاراسته‌ی سه‌یدای کرن ، ژوان پسیارا

- ژبه‌ر چ گوتیه نالبه‌ند ژبنه مالا « باگێری‌یه » ؟
- چه‌ند شاعیرا کار تێ کریه‌و کیژکن ؟

ئو بێڤه دچیت دبێژیت : ئه‌ز دبێژم دیروکا مشه‌خت‌بونا نالبه‌ندی بو چه‌لێ به‌ری ڤێ سالێ یه ئانکو به‌ری سالا 1924 یه . دیسا یا فه‌ربو کاك خالدی سه‌ره‌کانێت ره‌وشه‌نبیری‌یا هوزانڤانی دیارکربان . برایێ خالد به‌رسڤا ڤان پسیاران دا گوت : سه‌ره کانێت ره‌وشه‌نبیری‌یا هوزانڤانێ مه ، کتێبێن ئایینی بون ، ئه‌ڤێن خاندین . لسه‌ر هوزانڤانێت کار دهوزانا وی دا کری ، گوت : جزیری‌و خانی‌و فه‌قیێ ته‌یران‌و مه‌لایێ باته‌یی ، ڤان هوزانڤانا کار تێ‌کریه . گه‌له‌ك بسپور ڤێ دبێژن‌و بو ڤێ چه‌ندێ دچن . سه‌یدا [ صدیق شرو ] برسکی دگێنگه‌شێ دا گوت : نالبه‌ند یێ دویر بو ژ خه‌یالێ . شعرێت وی مروڤ دکاریت بێژیت ، هه‌می سه‌ربور بون ، تشتێن پێش چاڤ دنڤیسین . تنێ دئایینی‌دا خه‌یال بکارئینایه . دیسان به‌لوی‌کر ، نالبه‌ند مروڤه‌کێ [ سطحي ] بو . په‌نج نه بون ل تشتی بچیت‌و ڤه‌کولیت . ئو ژ پسیارێت ژ سه‌یدایێ خالد کرین کاك صدیق دبێژیت :

- نالبه‌ندی علمێ خو ، چه‌ند گه‌هاندیه ، یێ لپشت خو ؟
- سه‌ر بورا خو [ ته‌جروبا ] خو چه‌ند گه‌هاندیه مه ؟ ددویڤ دا [ نزار محمد ] چه‌ند تێبینیه‌ك لسه‌ر کوشتنا وی دیار کرن . هه‌روسا چه‌ند لایه‌ك ژ هوزانڤانێن وی . سه‌یدا [ رشید فندی ] هنده تیشکێن روناهیێ ، بسه‌ر چه‌ند تێبینیه‌کێن د تاریی‌دا به‌ردان ژ وان تیشکا :
- چونا نالبه‌ندی بو چه‌لێ ژ ئه‌گه‌را خه‌لایێ بو .
- ژیانا خو ، نالبه‌ندی ، بده‌ستی خو نڤیسیه ، بو سه‌یدایێ هێژا مه‌لا [ طه مائی ] هنارتیه . یێ کو ئه‌م دشێین بێژین سه‌ره‌کانیا شعرێن وی‌و ژیانا وی‌یه . وه لسه‌ر ئه‌زمانێ توره‌ی گوت : شاعرێ کلاسیکی یێ دویماهیکێ یه لده‌ڤه‌رێ . یێ کو [ ریاده ] هه‌ی دباقژکرنا زمانێ کوردی دا ، ژ په‌یڤێن فارس‌و تورکی ، د هوزانا خو دا . لڤێرێ ئه‌ڤ کوڕێ قه‌شه‌نگ بدویماهیك هات . پشتی سه‌یدایێ موحاضر به‌رسڤا گشی پسیارا دایی .



# پۆستەی کاروان

خوێنەرانی ئازیز ..

بەوپەڕی بەختەوەریو بە شانازییەکی زۆرەوە بە هاوکاریو دۆستایەتی ئێوەی ئازیزو خۆشەویست ، وا لەم ژمارەیەشدا کورتە گەشتێکیتر ساز دەکەینەوەو دیسانەکێ سەر هەڵدەگرینەوەو ڕوو لە دونیای شیعرو چیرۆكو فۆلکلۆرو زانستو زانیاریو زۆر بابەتی تری ئەدەبیو ڕۆشنبیری بەتامو چێژ دەکەینەوە ؛ کە پێنووسە هەمیشە لەکارەکانی ئێوەی دۆستو دڵسۆزو برا لەناخی دڵی پڕ سۆزو خۆشەویستیانی هەڵهێنجاوەو خستوونیەتە سەر کاغەزو ئێوەش وەکو دیارییەکی خنجیلانە پێشکەشی گۆڤارەکەتان کردووە ، ئەو گۆڤارەی بەهاوکاری ئێوە پشت ئەستوورەو چاکی مەردایەتی لێکردووە بەلاداو ئیمرۆکە لەهەموو کاتێك زیاتر هەوڵی ئەوە دەدات ئەدەبو ڕۆشنبیریو کەلەپووری کوردیمان ڕەگی بەناخا بچێتە خواریو چاکتر بنج داکوتێو بچەسپێ لەپێناوی وەدی هێنانی ئەدەبێکی ڕەسەنو پێشکەوتنخوازو هاوچەرخدا ..

**خوشکان ، برایان ..**

وەکو دەیزانن کاروانی ڕۆشنبیری کوردی لەزۆر لایەنەوە وەکو پێویستە وا نییە ، بەڵکو تەکانی توندو خێراتری گەرەکە بۆ ئەوەی لەو قاوغە تەسکەی دەربچێو شان بە شانی ئەدەبی بەرەو پێشەوە چووی گەلو نەتەوە پێشکەوتووەکان هەنگاوی بێپسانەوە بهاوێژێت ، هەڵبەتە ئەمەیش هەروەها بە ئاسانی نایەتەدی ، بەڵکو هەوڵو کۆششو گیانی لەخۆ بووردنی دەوێو پێویستی بە شەونخوونیو ماندووبوونو خۆبەختکردن هەیە ، پێویستی بە دڵسۆزیو ویژدانو وەفاداری هەیە ، پێویستی بەوە هەیە کە هەمیشە لەگەڵ خودی خۆماندا ڕاستگۆبینو مەبەستی سەرەکیمان خزمەت گوزارییەکی ڕاستەقینە بێتو بەس ، هەرکاتێکیش توانیمان بۆ بەدی هێنانی ئەم لایەنانە دەست بنێین بە جەرگی خۆمانەوەو بەرژەوەندی تایبەتی بخەینە لاوە ، ئەوە بێ سێو دوو خواستو ئاواتی هەموو لایەکمان لە خاڵێکی سەرەکیدا یەك دەگرێتەوە کە ئەوەیش دڵسۆزیو وەفادارییە بۆ پاراستنو گەشەپێدانی ئەدەبو ڕۆشنبیری گەلەکەمان ..

**دۆستانی شیرین :**

**ئامادەکردنی**
**سۆران حەریری**

چەندین جاری ... خۆتانەو تەعبیر لە خواستو ئارەزووی ... دەکات ، دەنگی زوڵاڵی ئێوە دەچرپێنێتە گوێچکەی خوێندەواری کورد زوبانو ، بەپێی تواناش بوارێکی وا دە... عەرەبەکانیشمان تارادەیەك جۆرە ئاشنایەتییەکیان ... لەگەڵ ڕۆشنبیری کوردیماندا ..

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین «کاروان» ئاوێنەیەکی بۆ ئەوەی باری ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردی تیاید بداتەوە ، جا بۆ ئەوەی ئەم ڕەنگدانەوەیەیش پڕ بە پێستی خۆی بێتو نموونەی ئەدەبێکی پێشکەوتوو هاوچەرخ بنوێنێت ، با هەموومان هەوڵی ئەوە بدەین چاکترینو بەپێزترین بەرهەم بکەینە دیاریو لاپەڕەکانی «کاروانی» پێ برازێنینەوە .. هەڵبەتە ئەمەیش بێ درێژیو ماندووبوونێکی بێ سڵکردنەوەی دەوێ ، مەبەستیشم لێرەدا ئەوەیە ، باوەکو هەر ماندوو دەبین ، ماندووبوونەکەمان ئەنجامێکی چاکتری هەبێتو ببێتە مایەی زیاتر پتەوکردنو چەسپاندنی ئەدەبو کەلەپووری میللەتەکەمان ..

دوا بەدوای ئەم پێشەکییە کورتە بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە ڕێگەی ئەوە بەخۆمان دەدەین کە بەشێکی تری نامەو بەرهەمە شیرینەکانی ئێوەی ئازیز وەلام بدەینەوە ، هیوادارین لێمان زویر نەبنو ڕاوو پێشنیارەکانمان بە دڵێکی فرەوانەوە لێ قەبوڵ بکەن ، هەڵبەتە ئاواتی هەموولایەکیش لەبۆتەی خزمەتکردندا یەك دەگرێتەوەو ... هەربژین ..

- **بۆ ئەم خوشکو برا ئازیزانەمان کە شیعرو پەخشانو بەرهەمی ئەدەبییان بۆ ناردووین ..**

فؤاد کریم رسول ، کوردە نقشبندی ، یوسف کریم رضا ، حەسەن سەربەنی ، ابو بکر هێور ، هەڤال عبدالحافظ مایی ، صلاح محمد ، غریب میرزا جاف ، یوسف عزالدین

رؤوف ، تێکۆشەر نادر ، ازاد جاف ، نایف قادر علی ، دلزان
زەندی ، وشیار حمد حاجی ، چالاك لێشاو ، ابراهیم درویش ،
برزان محمد رشید ، یوسف مصطفی ، عبدالله کریم ڕەباتی ،
سیروان محمود ، لقمان یاسین ، شۆڕش محمد ، جمال محمود
ڕەنجاو ، بەختیار مامە ، مظفر شکر کاروان ، قاسم دلتەنگ ،
بێباك دیبگەیی ، شێواو ، محمد عثمان چۆمانی ، یاسین محمد
حمەخان ، هێرش ابراهیم ، هادی عمر محمد امین ،
عبدالرحمن محمد مصطفی ، مغدید احمد رسول ، عوبێد خدر
غەمبار ، سعید حمید هیوا ، نوزاد عبدالعزیز صالح خۆشناو ،
بۆتان جلال ، عبدالله حسن ، فرهاد هەیواز شەیدا ، عبدالله
لە«لندن» ، اسماعیل عزیز خۆشناو ، بەندی علی حسن ، محمد
مصطفی علي ، قادر سید حسن ، ادریس شەیداهۆ ، رحیم
صابر محمد ، خطاب حامد بندیان ، مصطفی یعقوب بێبەش ،
عبدالرحیم محمود خلیل ، باقی سەرکەش ، عبدالله حسین
رسول ، علی حیدر ـ ئاردەلانی ـ ، حمە زیاد بەرەکەیی ،
ئاراس حسن حمد ، محمد گردعازەبانی ، ئەزوەر پەرچەم ،
صابر دلگیر ، وشیار شفیق ، رشدي هادی عبدالرحمن ، ئاریان
عرفان حسن ، جەلال عازەبانی ، ئەمین حمید ، معین
مصطفی ، یوشو خضر ، لوری قادر اسماعیل .

**براو خوشکانی ئازیزم** :

بێگومان شیعر لایەنێکی زیندووی ئەدەبی کوردیمانەو هەر لە زووەوە سەری هەڵداوەو زەمینەیەکی لەباری بۆ خۆی ڕەخساندووە ، بەلام ئەمە وەنەبێ کە ئیتر حیساب بۆ بەشەکانی تری ئەدەبی کوردی نەکەین و هەر هەموو ، یاخود زوربەی هەرە زۆری نووسەرانمان بەو گەرمییەوە ڕوو لە مەیدانی شیعر دانان بکەن و چاو لە بەشەکانی تری ئەدەب بپۆشن و نزیکی نەکەون ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەم بابەتە ئەدەبییە بەلای ئەوانەوە هاسانترەو چاکتر خۆی بەدەستەوە دەدات ، جا گەر ئەو براو خوشکانەی ئیمڕۆ قەلەمەکانیان تاودەدەن لەو مەیدانەدا ، وای لێ تێگەیشتبن و وای بۆ بچن ، ئەوە بێ سێ و دوو خۆیان لە هەقیقەتەکە بەدوور دەگرن و سەر لە خۆیان و ڕۆڵەکانی کۆمەڵەکەیشیان دەشێوێنن و سەرە داوی ڕاستیەکە بزر دەکەن و دەی ئالۆزێنن ، کە ئەمەش لەگەڵ ئارەزوو ویستی زوربەی نووسەرو خوێنەرانی دڵسۆزی ئەدەب و ڕۆشنبیری میللەتەکەماندا یەك ناگرێتەوە .

هەڵبەتە ئەوەی زیاتر هانی دام کە ئەم چەند قسەیە بخەمە ڕوو ئەوەیە کە ماوەیەکی زۆرە وا هەست دەکەم بەشێکی زۆری خوشکو برا گەنجەکانمان ڕوویان لە شیعر کردووەو قەلەمەکانیان گرتۆتە دەست و ئەوەی بە خەیاڵیاندا دێ دەینووسنەوە ، جا چەندی پاکەو چەندی پووکە ئەوەیان مەبەست نییە ، بەڵکو دەیانەوێ کەسانێك بەلای خۆیانەوە بکێشن و دەستی «ئەشەدو بیللایان» بۆ بە سنگدا بدەن و بڵێن خوا هەڵناگرێ شاعیری چاکەو تەنانەت بێکەس و پیرەمێردو گۆران و فلان و فلانیش تۆزی ناشکێنن ، لەکاتێکدا گەر بەڕووی ڕاستی مەسەلەکەدا بڕوانین زۆر بە هاسانی دەتوانین بڵێین ئەمانە فێڵ لەخۆیان و کەسانی تریش دەکەن و لە هەقیقەتەکە دوور دەکەونەوە ، بەڵێ ئەم ڕوالەتە خەریکە تەشەنە دەکات و گەورە دەبێت ، بەلام من بەش بەحاڵی خۆم بەپەسندی نازانم و ، بەڵکو گەر هاتوو وا ڕۆیشت ئەنجامەکەی خراپ دەشکێتەوە ، لێرەدا دەوەستم و ڕوو لەو خوشکو برایانەم دەکەم کە لەم گۆشەیەدا وەلامم داونەتەوەو پێیان دەڵێم : خۆزگە هەندێ لەئێوە کە بەڕاستی خاوەنی بەهرەن و توانادارن چاکتر مامڵەتتان لەگەڵ ووشەی کوردیدا دەکردو زیرەکانە ئەوەی مەبەستتانە دەرتان دەبڕی و دەتان خستە ڕوو ، دوور لەو تەم و مژو پەناو پێچەی پەناتان وەبەر بردووە .. هەروەها ئەوانەی تریشتان کە بەڕای خۆم وای بۆ دەچم ، گەر بێتو ڕوو لە مەیدانەکانی تری نووسین بکەن ئەوە چاکتر لێی سەردەکەون و باشتریش خزمەتی گەل و نەتەوەکەتان دەکەن و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیشمان زیاتر دەبووژێتەوەو گەشە دەکات و ڕەگی بەناخی زەویدا دەچێتە خواری و پتەوتر دەبێت ...

● **بۆ نووسەرانی ئەم چیرۆکانە** :

ریڤینگێ وەغەرا دویر ، سەمفۆنیای بێدەنگی ، لە ناکاو ، کورتترین چیرۆك لە جیهاندا ، کا ، کوچی تۆ خەیلێ خەمگین بوو ، کەرێکی زیرەك ، پاشایەك ، کامێرای ئەم شەوە ، گومان ، پەپوولەیەك ، نامەو سام ، پیرەمێردو جەنگ ، ژنێکی مەکرباز ، بازنگ ـ گوڤار ، ناپاکی ، نوێن ، لەمەر قەرەجانەوە ، حەمەی ماجۆ ، هۆنراوەیەك و خۆشەویستێك ..

ئەم بەرهەمانەی سەرەوە بەخامەی ڕەنگینی چەند برایەکی خۆشەویست نووسراونەتەوە ، دیارییەکی تا بڵێی

ـەنرخن‌و پێشکەش گۆڤاری کاروانیان کردوون .. ئەم ئەرکەی ئەو برا نووسەرانە بینیویانە بۆ ئەنجامدانی ئەم چیرۆکانە مایەی شانازین .. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەو برا ئازیزانەمان دڵیان گەرد نەیگرێ کە دەڵێین ئەو بابەتە چیرۆکانە هی ئەوە نەبوون بلاویان بکەینەوەو سوودیان لێ وەربگرین ئەویش لەبەر زۆر هۆ کە رەنگە خویشیان هەستی پێبکەن ، وەك ئەوەی بەشێکی ئەم چیرۆکانە راستەوخۆ لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێردرابوون ، کەچی لە ئەسلا خۆیان چیرۆکی بێگانەن‌و ئێمەیش زیاتر ئەو جۆرە چیرۆکانە بلاودەکەینەوە کە لە زمانە رەسەنەکەوە کرابن بە کوردی ، هەروەها هەندێکی دیکەیان تابلۆی لاواز بوون دووریش بوون لە پەیرەوکردنی تەکنیك‌و هونەری چیرۆك نووسینەوەو زۆر لایەنی هونەریان تێدا فەرامۆش کردبوو ، جگە لەمانەیش هەندێ برای‌تر هێشا لەسەرەتای رێگاکەن‌و زۆریان ماوە تا بەم قۆناغەی ئارەزوویانە پێی بگەن ، بۆیە چاکتر وایە تا دەتوانن دەست لە خوێندن‌و خوێندنەوە هەڵنەگرن‌و هەوڵی ئەوەبدەن ئەو توانای نووسین‌و نووسینکاری‌یەی هەیانە زیاتر گەشەی پێبدەن بۆ ئەوەی بەهەموو لایەکمان بتوانین خەرمانەی ئەدەبی کوردیمان گەورەترو دەوڵەمەندتر بکەین . بێگومان ئەمەیش ئەرکی هەموو نووسەرو خوێندەوارێکی دلسۆزە ..

● **بۆ خوشکە لەیلا سەعدوون** :

پڕ بەدڵ سوپاست دەکەین بۆ ئەو هەستی هاوکاری کردنەت لەگەڵ گۆڤارەکەماندا ، خۆشحالیشین بەو باسەی کە بە دیاری بۆمانت ناردبوو دەربارەی «ئافرەتە خوێندەوارەکانمان کەی لەبارەی ئافرەتی کوردەوە دەدوێن» بەلام دەڵێین خوشکی ئازیز لەبەر ئەوەی نووسینەکەت زۆر سادەو ساکاربوو بۆیە دووبارە ئێمەیش داوا لەتۆو لە خوشکانی تری وەك تۆ دەکەین کە دەست بدەنە قەلەمەکانیان‌و ئەو کەلەبەرەی کە تۆ سەرنجیان بۆی رادەکیشی بە بەرهەمی بەپێزو بەکەڵك پڕ بکەنەوە بۆ ئەوەی ئافرەتیش لەبواری نووسیندا شان بەشانی براکانی هەنگاو بهاوێژێت ..

● **برای ئازیزمان کاك عبداللە سلیمان محمد امین لە شاری کەرکووکەوە .**

چەند شیعرێکی بۆ ناردووین ، ئێمە لەکاتێکدا سووپاسی ئەم برایەمان دەکەین وا ئەم پارچە هەڵبەستەیشی کە بەناوی «شەهید»ە بلاوی دەکەینەوە هیوادارین لە بلاونەکردنەوەی ئەوانی تریش بمان بەخشێت ..

**«شەهید»**

ئەی ئەوانەی گوڵی سوورتان ،<br>
لەسەر سنگتان ، کردە نیشان<br>
رۆیشتن‌و لە پێناوی ساتێ ژیان<br>
ژیانێکی دوور لە ئازار ..<br>
بۆ گشت هەژار .<br>
ژیانێکی پڕ لە خەندەو سوزو عەشق ،<br>
تاکو بەهار ..<br>
بەهاری گشت هەژاری بێ ،<br>
گوڵی شادی خونچە بکاو<br>
دوور لەژاکین‌و سیس بوون‌و هەڵوەرین بێ ..

● **بۆ کاك عبدالستار عزیز جەباری** ..

زۆر سوپاست دەکەین بەرامبەر بەو بەرهەمەی بۆت ناردووین ، ببورە کە بۆمان نەکرا بلاوی بکەینەوە هیوادارین بەرهەمی ترمان بۆ بنێری ..

● **بۆ خوشکە ئاوات ئەسعەد** ..

شادومانین کە خوشکانمان خەریکە روو لە گۆڤاری کاروان دەکەن‌و نامەی پڕ لە داواکاری‌و پێشنیاری بەجێی بۆ دەکەنە دیاری ، خوشکێ گیان ، وەك چۆن تۆ حەز دەکەی بەوەی بابەت‌و بەرهەمی تەندورستی‌و مندالان بلاوبکەینەوە ئێمەیش هەر هەمان ئارەزوومان هەیەو رێگەیش بۆ هەموو براو خوشکێکی نووسەر کراوەتەوە بۆ ئەوەی لەم جۆرە بەرهەمانەمان بۆ بنێرن‌و ئێمەیش گەر شیاوی بلاوکردنەوە بوو ، بە سووپاسەوە بلاوی دەکەینەوە بۆ ئێوەو خوێندەوارانی «کاروان»ی دەکەینە جوانترین دیاریمان‌و .. هەربژین ..

● **بۆ دۆستی هەمیشە ئازیزمان هۆشمەند رەواندزی**

پڕ بەدڵ سووپاست دەکەین بۆ ئەو نامە پڕ سۆزانەت کە بۆمانی دەنێری ، وا ئەم چەند دێرە شیعرەمان لەو شیعرەت هەلبژارد کە لە ژێر ناوی «خۆشەویستێکی نهێنی» بۆت ناردووین‌و بلاوی دەکەینەوە :

**«خۆشەویستێکی نهێنی»**

جا من چیبکەم رێکەوتێ بوو ،

پەپوولەی عەشقبازی من ..
شەیدای تیشکی چاوە خامۆشەکانت بوو .
کەلێت نزیك دەبوومەوە
بەجارێ دەکەوتمە گومان
لەبری عشیقی پڕ لەسۆز
ساردی بەگوڕ دەبووە میوان
بەلام گیانە ،
خۆشەویستیت
لەنێو دڵدا گرکانە ..

● بۆ کاك ئـازاد ئەحمـەد ـ قوتـابی کۆلیجی ئـاداب ـ زانکۆی سەدحەدین ..

سوپاست دە کەین و بمان بەخشە کە بابەتەکەتمان بـۆ بڵاوناکرێتەوە ..

● برای ئازیزمان کاکە بکر محمد امین ..

زۆر سـوپاست دەکـەین بو ئـەو هـەڵبـەستـەی بـوت ناردووین ، ئێمەیش ئەم چەند دێڕەیمان لێ هەڵبژاردو دەیکەینە دیاری بۆ خوێنەرانی گۆڤارەکەمان :

«بۆ یەکەمجار»

گوڵم پەری ...
تەنها رازم ئەدرکێنم ،
ئەوا بوتی هەڵئەرێژم ..
کە شوێن سرەوتم لێبوتە دۆزەخێك و
جوتە چاوم ، گۆمی خوێنن ، لەبۆ خەون
فرمێسکیشم ، چەشنی تکەی گۆزەی شانی
رێگەی کانی
زەنگوڵ .. زەنگوڵ ، بەسەر رووما
دێتە خوارێ ..

● بۆ ئەو برایانەی ئەم بەرهەمانەیان بۆ ناردووین :

«تێبینی یـەك و دوو بـەنـدی لەشکـری ، لە ئـاسـۆی رەخنەوە ، خەسیی و بیك ، بەیتا کەوا» سووپاستان دەکەین و هیوادارین لەمەودوا بەرهەم و بابەتی چاکترو رێك و پێکترمان بۆ بنێرن ..

● بۆ برایێ هێژا حمید محمود قادر ل زاخۆ :

ئەم گەلەك سووپاسیاتە د کەین بۆ ڤی هۆزانی یاکو تو بۆمە ڤری کری ل بن ناف و نیشانێ «ئەی یارا من» ، بەس لبەر لاوازیا هۆزانێ و گەلەك هۆیێت هونەری ئـەم نەشیـاین ل ڤی پارچێ زیدەتر بەلاف بکەین .. هیڤی دارین نووسین و هۆزانێت چێتر بۆمە ڤرێ کەی و جارەکادی ئەم گەلەك سووپاسیاتـە د کەین .. ئەڤەژی پارچەیەکە ل هۆزانا تە ..

● ئەی یارا من ●

ئەی یارا من
سوزبیت چجار تە نەهێلم
چەند نەخوشی یا ببینم .
سوزبیت ب عەشقا شرینێ ،
ئەوان پەردێت رەش و تاری ..
دناڤ بەرا من و تەدا ،
بدرینم .

● بۆ کاك عبدالواحد قادر ..

سووپاست دەکەین بۆ ئەو بابەتەی بوت ناردووین لەژێر ناونیشانی «چەند یـارییێ فۆلکلۆری لکـوردستانی دا» بـەلام لەبەر ئەوەی نووسینەکە بە شێوەیەکی لاواز پڕ لەکەم و کوری دارێژرابوو ، بۆیە بۆمان نەکرا بلاوی بکەینەوە ، بۆ لەمەودوا چاکتروایە نووسینەکەت نیشانی برایـەکی شارەزای زمـان و نووسین بدەیت .. بە هیوای بەرهەمی داهاتووتین و هەربژیت ..

● بۆ کاك سەرکەوت عەلی عبدالله ..

ئەو بابەتەی بوت ناردووین بەناوی «سـامانی فـۆلکلۆر لەناوچەی هەڵەبجە» خۆزگە تەنیا ئەو ناوچەیەی نەدەگرتەوەو فراوانتر دەبوو و زۆر شوێن و نـاوچەی تـریشی دەگرتـەوە .. تاوەکو بمانتوانیایە بوتی بلاوبکەینەوەو سووپاس ..

● کاك هیوا عبدالقادر سالەیی ..

شیعـرێکی بۆ نـاردووین لەژێر سـەردێری «بـۆ نازانم چاوەکانت چی ئەڵێن» .. وا ئەم کۆپلەیەی لێ بلاودەکەینەوەو سووپاسی کاکە «هیوا»ش دەکەین بۆ ئەو گیانی هاوکاری یەی لەگەل گۆڤارەکەماندا هەیەتی .

«نەشمیلەکەم»

بۆ نازانم چاوەکانت پڕ لەواتای خۆشەویستین ؟
بۆ نازانم چاوەکانت
پڕ لەهەستی پاك و راستین ؟
باوەر بکە شیرینەکەم
ووشەکانیان چاك تێ ئەگەم .

چاك ئەزانم وەك دوو مەلین
ـە قەفەسی جیاجیادا
ـەند کراوین .

● **بۆ كاك صبیح محمد حسن ..**

زۆر سوپاست دەكەین بۆ ئەو دوو بابەتەی بۆمانت ناردووە ، بەلام دەبێ بمان بووری لەوەی كە هەردوو بابەتەكەت سەركەوتوو نەبوون و بۆمان نەكرا بلاویان بكەینەوە ، ئاواتە خوازین بابەتی چاكترمان بۆ بنێری و هەربژی ..

● **بۆ نووسەری بابەتی «سمكۆ خانی شكاك» ..**

ئێمە لەكاتێكدا زۆر سووپاست دەكەین بۆ ئەو بەرهەمەی بۆت ناردو ووین ، لەهەمان كاتدا دەڵێین بمان بەخشە كە بابەتەكە شیاوی ئەوە نەبوو لە گۆڤارەكەماندا چەند لاپەڕەیەكی بۆ تەرخان بكەین و بلاوی بكەینەوە ، بە ئاواتەوەین كە نووسینی داهاتووتان پاكترو بەپێزتر بێت و خوێنەرانیش كەڵكی لێوەربگرن ..

● بۆ ئەو براو خوشكانەی كە نامەیان بۆ ناردووین و لە نامەكانیاندا سلاو پیرۆزبایی خۆیانیان كردوتە دیاری بۆ گۆڤارەكەمان و خوشحالیان نیشان داوە بەرامبەر بەو دەورە گرینگەی كە ئێمرۆ كاروان گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی لەبواری خزمەتكردن و گەشەپێدانی ئەدەب و رۆشنبیریی و كەلەپووری گەلەكەماندا ، هەروەها هەندێ براو خوشكیتر داوای ئەوە دەكەن كە بە ئابونە لە گۆڤارەكەماندا تۆمار بكرێن و ژمارە بەژمارە كاروانیان بە پۆستە بۆ بەرێ بكەین ، یا داوای ژمارەكانی كاروانمان لێدەكەن ، بۆیان بنێرین .. ئێمە پێشەكی پڕ بەدڵ سووپاسی ئەو براو خوشكە ئازیزو خۆشەویستانەمان دەكەین و هیوادارین نموونەیان هەر زۆربن ، بەڵێنیشیان دەدەینێ كە هەمیشە ئاواتمان خزمەتكردن و گەشەپێدانی ئەدەب و رۆشنبیریی كوردی بێت و لەم بوارەشدا كەمتەرخەمی ناكەین ، بەلام بۆ بە ئابونە تۆماركردنی هەندی خوشك و براو ناردنی ژمارە كۆنەكان داوای ئەوەیان لێدەكەین كە لەم ئەركە بمان بەخشن چونكە لەبەر زۆر هۆی حیسابی و هونەری ئەم داواكاریەیان بە ئێمە ئەنجام نادرێ ، هیوادارین لە داهاتوودا ئەم كۆسپەیش تەخت بكەین و ئەم داخوازیەیشتان بهێنینە دی و دووبارە سووپاسی هەموولایەك دەكەین و هیوای سەرفرازیتان بۆ دەخوازین ..

● **بۆ نووسەری بابەتی «شاری كۆیەو ئابووریی جەنگی یەكەی لە مێژووی كوردستاندا»** .

زۆر سووپاست دەكەین ، هیوادارین بابەتی تیرو تەسەلترمان بۆ رەوانە بكەیت ، تاوەكو بتوانین سوودی لێوەربگرین و بلاویشی بكەینەوە .

● لەگەڵ قەلەم : بابەتێكە كاك محمد گردعازەبانی بۆی ناردووین ، زۆر سووپاكی دەكەین و ، ئەم چەند دێرەیمان هەلبژاردو دەیكەینە دیاری بۆ خوێنەرانی گۆڤارەكەمان :

● **لەگەڵ قەلەم** ●

**قەلەم زووكە وەرە دەستم**
**رەوانكە شیعرو هەلبەستم**
**تا بنووسم بۆ گەل و هۆز**
**شیعری پرشنگدارو بەسۆز**
● * ● * ●
**بۆ هەموو كوردێكی دڵسۆز**
**بۆ بەهارو جەژنی نەورۆز**
**بۆ ئەوانەی بۆ گەل مردوون**
**مێژوش لەبیری نەكردوون**

● **هەروەها كاك ابراهیم رەشكۆ سورچی :**
پارچە شیعرێكی بۆ ناروویین لەژێر سەردێری « ئێك هیڤی » ، پڕ بەدڵ سووپاسی دەكەین و وا ئەم كۆپلەیەمان لێی هەلبژاردو بۆی بلاودەكەینەوە :

● **ئێك هیڤی** ●

**بگولێن ئەڤینا دلی**
**بكاروانێ هزرێن شەڤان ...**
**دیمەنەكی ئەز دخینم !!**
**دبن پەردا سپێدا تێتن ... ژیێ سوبا ..**
**بیكا جانێی ئەز دبینم !!**
**هەی تەخمین و رێبازا من ..**
**تە دبینم !**

● بۆ برایان حبیب خدرو ، محمد قادر محمد لە پارێزگای هەولێر : زۆر سووپاستان دەكەین بۆ ئەو هەستی برایەتیی و دڵسۆزیەتان كە لە نامەكانتاندا دەرتان بڕیووە بەرامبەر گۆڤارەكەتان ، گۆڤاری « كاروان » و نووسەرو بەشدارانیی و

